



# چیرۆکی تەوبەکاران



## ١٠٠ چیرۆکی واقیعی

وەرگێڕانی:
حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

# چیرۆکی تەوبەکاران

## «١٠٠» چیرۆکی واقیعی

## بەرگی یەکەم

وەرگێڕانی
حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

چاپی یەکەم
٢٠١٣ز

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: چیرۆکی تەوبەکاران

وەرگێڕان: حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

بابەت: چیرۆك

تایپ: نیگا حسێن

ساڵی چاپ: ٢٠١٣ز

نۆبەتی چاپ: یەکەم

شوێنی چاپ: چوارچرا

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکانی سلێمانی ژمارە( ١٤٣٠ )ی

ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە

# پێشەکی

زۆرن ئەوانەی بەهۆی وتەیەك یان هەڵوێستێك یان رووداوێك یان بیرکردنەوەیەك یان رامانێك یان....یان....رەوتی ژیانیان بە تەواوی دەگۆڕدرێت و لەوپەڕی رەشبینیەوە بۆ ئەمپەڕی گەشبینی و لەوپەڕی سەرگەردانیەوە بۆ ئەمپەڕی بەختەوەری و لەوپەڕی تیاچوونەوە بۆ ئەمپەڕی رزگاربوون و لە ناو زۆنگاوەوە بۆ کەلی ئاسۆ هەنگاو دەنێن..

ئێمەی موسڵمان نابێ بێئومێد بین لە هیچ کەس و نابێ رەشبین بین بە تەواوی بەرامبەر بە هیچ دڵێك، لە هەر کوێیەك و لە هەر جێیەك و لە هەر کات و لە هەر ساتێکدا وتەیەکی خێرت پێ بوو بیکە و شەرم مەکە، ئەم ئاینە ئاینی خێر و سەرفرازی و بەختەوەریە، پاڵەوانانی ئەم چیرۆکانە بە قەناعەتەوە ئەم بەسەرهاتانەیان نوسیوەتەوە تا نەوەکان بە هەموو چین و توێژەکانیانەوە سوودمەند بن لێی و زیاتر پابەند بن بەم ئیسلامەوە، ئەم چیرۆکانە واقیعین و روویانداوە و لێرەو لەوێ نمونەکانیشیان چەند بارە دەبنەوە تەنها کارەکتەرەکان و ناوی کەسەکان جیاوازیان هەیە، گەر بێت و بکۆڵینەوە لە ژیانی هەر یەکێکمان بەدەر نیە لەو ساتە ناسکانە و لەو کاتانەی کە خەریکە بە تەواوی شتەکان وەك خۆیان وێنا دەکەین..منیش لێرەوە دەخوازم خوێنەری بەرێز ئەگەر تۆش بەسەرهاتێکت لایە پێت وایە سوودی بۆ هەموان هەیە تا ببێتە رێنمایی بۆیان، دەتوانیت لە رێگای ئیمێڵ یان فەیسبوکەوە بۆمان بنێریت و ئێمەش بە ئەمانەتەوە بڵاوی بکەینەوە بۆ سوودی هەموان..لەگەڵ هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو لایەك

حسێن مەحمود هەڵەبجەیی
فەیسبوك: husainhalabja
ئیمێڵ: Husain.halabga@googlemail.com

# ١-﴿بیخوێننەوە چونکە کاریگەرە﴾

لە ڕۆژگاری سەردەمی زانکۆدا ئاشنا بووبووم بە لاوێك کە تەمەنی لە من بچوکتر بوو، پەیوەندیمان وورده وورده زیادی کردبوو، تا ئەو ڕادەیەی نەمان دەتوانی زیاتر لە هەفتەیەك دوورکەوینەوە لەیەك، و ئەو پەیوەندیە بۆ خوا نەبوو، بەڵکو بۆ هاوکاریکردن بوو لەسەر تاوان و گوناه، هەرچەندە ئەو تەواو بێ خێریش نەبوو؛ لە قۆناغی سێیەمی زانکۆدا بانگدەری خێر لە دڵمدا بەهێز دەبوو، وەهەندێ لەو هاوڕێیانەی دەهێنامەوە یاد کە خوای گەورە منەتی هیدایەتدانی پێ بەخشیبوون، وورده وورده سەردانیان دەکردم، و لە لایەکی ترەوە، لە ماڵەوەشمان ڕوناکیەکی نوێ هەڵهات، بانگخوازێ سەری هەڵدا، خوشکەکەم ورده ورده ڕێگای پابەندبوونی گرتە بەر، دەستی کرد بە ئامۆژگاریکردنم و هاندانم بۆ ڕێنمایی، بەخوا ئازیزانم بانگکەرەکان بەهێز دەبن و بارودۆخەکەی دەوروبەرم باشتر دەبوو، بەڵام ساتی ڕێنمایی هێشتا نەهاتبوو، ئەوساڵە کەسوکاری خۆمم برد بۆ مەککە لەمانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا، و لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا ژیانێکی نوێم بەسەربرد لەو کاتەدا وازم لە زۆرێك لە گوناهەکان هێنا، دوکەڵم گۆڕی بە سیواك، و گۆرانیشم گۆڕی بە قورئان، پارێزگاری نوێژی تەراویح و شەونوێژ و هاوڕێی باشم دەکرد، ئەمەیە بەختەوەری ڕاستەقینە، کە بە درێژایی ژیانم بەدوایدا دەگەڕێم، ژیانێکی پاك و پاکیزە و ڕوون، ئای کە لەزەتێکی خۆشی هەیە کاتێك کە هەست دەکەیت سەرکەوتوویت بەسەر دەروونی پڕ خراپەکاری خۆتدا و چۆکت بە شەیتان داداوە، و پەروەردگارت لە خۆت ڕازی کردووە.. ئێوە وا گومان دەبەن کە کۆتایی بەسەرهاتەکەیە، نا نەبەخوا هێشتا کاتی ڕێنمایی نەهاتبوو، گەڕامەوە بۆ ﴿ریاض﴾.. وە سووربوون لەسەر ڕۆشتن بەو ڕێگایەدا و من لە مزگەوتی حەرەمی پیرۆز لە خوای گەورە دەپاڕامەوە و داوای دوو شتم لێ دەکرد: یان خوای گەورە دڵی هاوڕێکەم بکاتەوە و لەسەر ئەم ڕێگایە هاوڕێ و هاودەمم بێت، یان جیامان بکاتەوە.. خوای گەورەش وەڵامی دوعاکەی دامەوە، دوای یەك ڕۆژ لە گەیشتنم بە هاوڕێکەم ناکۆکیەك کەوتە نێوانمان و جیابووینەوە، بەڵام –زۆربەداخەوە– بەدیلێکم نەبوو لە هاوڕێ چاك و صاڵحەکان، پێشوازیم لە تاقیکردنەوەکان کرد، دەستم کرد بە سەعیکردن، پارێزگاری نوێژەکانم دەکرد و وازم

له گوناهه گەورەکان هێنابوو، وە مابوومەوە لەسەر گوناهه بچوکەکان، ئەو هاوڕێیەم کە لە ئەمەریکا بوو جارێکی تر بانگی کردمەوە کە لە هاویندا بچم بۆ لای ئەو، و خۆم فێری زمانی ئینگلیزی بکەم لەوێ، چونکە لە زانکۆدا فێربوونی ئەو زمانە سەخت بوو، منیش بەخۆمم ووت: ئەمە فرسەتێکی گونجاوە تاوەکو دووربکەومەوە لەم ژیانە کە تیایدا ئەژیم، پاشان پاش ماوەیەك بگەڕێمەوە.. و ڕێگای ڕاست بگرمە بەر، بەڵام خوای گەورە هەر دەبێ کارەکان بە ویستی ئەو زاتە بێت، لە یەکێ لە ڕۆژەکانی تاقیکردنەوەدا چومە هۆڵی تاقیکردنەوە وە لە گیرفانمدا بیرم چووبوو کە کاغەزێکم پێیە و پەیوەندی بەو وانەی تاقیکردنەوەوە هەیە، دوای سەعاتێك، چاودێرەکە چاوی بڕیە کاغەزەکە، دەستی کرد بە گیرفانمدا، دەری هێنا و پاشان ناوی تۆمار کردم کە قۆپیەیە و غەشم کردووە، پاشان بێبەش بووم لە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانی تر.. کاتێ هەستم بەو زوڵمە کرد لەسەرم، دنیا هەمووی تاریك بوو لەبەرچاوم.. و گومانم پەیداکرد کە ئەوە شەڕ و نەهامەتیە بۆ من، بەڵام خوای گەورە زۆرجار بەخێر دەیگوزەرێنێ.. هەرچەندە بەلای ئێمەوە شەڕو نەهامەتیە، چونکە شەڕ و نەهامەتی تەواو هەرگیز نادرێتە پاڵ خوای گەورە.. بە توڕەیی و خەفەتبارییەوە لە هۆڵی تاقیکردنەوەکان هاتمە دەرەوە.. بە دوای شتێکدا دەگەڕام کە ئەو خەم و خەفەتەم لەسەر سوك بکات و لای بەرێت.. دەستم کرد بە گوێگرتن لە گۆرانی و بینینی فیلم و یاری و جگەرەکێشان، بەڵام هیچ سودێکی نەبوو تەنها خەفەتی بۆ زیاد دەکردم.. ئەو ڕووداوە ڕۆژی شەممە بوو.. وە گەشتەکەی منیش بۆ ئەمەریکا ڕۆژی چوارشەممە بوو، لە ئێوارەی شەممەدا دەروازەی ڕەحمەتی خوا کرایەوە و دابەزی، ساتە وەختی من بوو لەگەڵ پاکێتی و پاکیزە بوون و بەختەوەری و دڵئارامیدا.. و وەڵامی ڕاستەقینە بۆ بانگەوازی خوای گەورە.. کاتێك نانی ئێوارەم دەخوارد لە یەکێ لە چێشتخانەکاندا، بانگخوازی خێر جارێکی تر بانگی کردم، بەڵام لە شەودا بەهێز و بە سووربوون و لێبڕانەوە پێی دەوتم: ئایا دەچیت بۆ وڵاتی بێباوەڕی و لەگەڵ کەسانی خراپدا دادەنیشیت و مادده مەستکەرەکان دەخۆیت، ئەی چی دەکەیت ئەگەر لەو ساتانەدا مەرگ یەخەت بگرێت و هێرشت بۆ بێنێت، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە ڕێگای ڕاست بگریتە بەر؟ لەچێشتخانەکە وەك سەرگەردانێك بەدوای کەس و کاریدا بگەڕێ،

هاتمه دەرەوه، وەك دایكێك بەدوای كۆرپەكەیدا بگەڕێ.. وەك نەخۆشێك بەدوای چارەسەردا بگەڕێت، سواری ئۆتۆمبیلەكەم بووم.. دەستم كرد بە لێخوڕین لەم شەقام بۆ ئەو شەقام، چەكمەجەی ئۆتۆمبێلەكەم كردەوە كاسێتێكی ﴿شێخ محمد المحیسنی﴾م بینی --خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە- ئەو كاسێتەم لە لایەن هاوڕێیەكمەوە پێشكەش كرابوو، گوێم لە قورئان خوێندنەكەی گرت، بە ملكەچیەوە قورئانی دەخوێند و دەگریا، خەڵكانی دەوروبەریشی دەگریان.. نەمتوانی خۆم بگرم لە گریان، بە راستی ئەو ئایەتانە دابەزینە سەر دڵم وەك ئەوەی یەكەمجارمە بیانبیسم.. بە كوڵ دەستم كرد بەگریان، پاشان ئۆتۆمبیلەكەم لە قەراغ ڕێگاكەدا وەستان، پاكەتی جگەرەكەم دەرهێنا و لەگەڵ ئەو شریتانەدا كە گۆرانی و شتی بێ بەهاو ئەرزش بوون.. هەمویانم لەسێدارەدا بەبێ دادگایی كردن... پێداگیریم كرد لەسەر تەوبە كردن و ڕێك ڕاوەستان﴿ئیستیقامەت﴾ لەسەر ئاینی خوای گەورە، كە ببمە بانگخوازێكی خێردار.. دوای ئەوەی كە بانگخوازێك بووم بۆ خراپەكاری و فەساد.. گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، باوكم پێشوازی لێ كردم، لە ڕوخسارمدا هەستی بە گۆڕان و ملكەچی و ڕووناكیی كرد، باوەشی پیادا كردم و لە ئامێزی خۆیی گرتم، منیش لە ئامێزیدا دەستم كرد بە گریان، و داوای لێبوردنم لێ كرد لەو نارەحەتیانەی كە توشی ئەوو دایكم و برا و خوشكەكانم كردوون.. ئەوانیش زۆر دڵخۆش بوون بە تەوبەكردنەكەی من. دوای تەوبە و پەشیمان بوونەوە.. ئاساییە كە شەیتان هەوڵەكانی زیاتر دەكات و سەربازەكان لە جنۆكە و مرۆڤ دەخاتە گەڕ تا پەشیمانم بكەنەوە.. لە پێناو سەرگەردانیم و گەڕانەوەم بۆ قوتابخانەی شەیتان.. بەڵام خوای گەورە و باڵادەست دامەزراوی كردم، منیش بەرەنگاری شەیتان دەبوومەوە لەناخی خۆمدا، شەیتان پێی دەوتم: گەمژە بۆچی ناچیتە دەرەوە لەوێ ئازادی و سەربەستیە و كەس بە كەسەوە نیە... بەڵام من خاڵی گەڕانەوەم لە خۆمدا دانەنابوو.. یەكەمین شوێنێ دوای تەوبە و پەشیمان بوونەوەم كە ڕۆشتم بۆی سەرتاشخانە بوو... لەوێ بەتەواوی سەرم تاشی، تەنانەت هاوڕێی ئازیزیش وەڵامم نەدەدایەوە، دەهات و باسی ژیانی ڕابردووی بۆ دەكردم و هانی دەدام پەشیمان ببمەوە، منیش ئارامم گرت لەسەر ئەو خەم و خەفەتەی كە لەسەرەتادا تووشم بوو بوو، تا خەم و خەفەت نەمان و

دڵئارامی و بەختیاری و دڵنیایی جێگەی گرتەوە، بە راستی ئیمامی﴿إبن قیم﴾- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- ڕاستی فەرمووە: ﴿ بە راستی تووشی ناڕەحەتی دێیت کاتێك واز لەو خوو نەریتانە دێنیت کە ڕاهاتوویت لەسەری، ئەوەی وازی لێ بێنێ بۆ غەیری خوا، بەڵام ئەوەی بە ڕاستگۆیانە و دڵسۆزانە و لە دڵیەوە بۆ خوا وازی لێ بێنێ، ئەوە لە وازهێنانیدا توشی ناڕەحەتی نابێت تەنها لە سەرەتادا نەبێت، تاوەکو تاقی بکرێتەوە ئایا لە وازهێنانەکەیدا ڕاستگۆیە یان درۆزن؟ ئەگەر کەمێك لەسەر ئەو ناڕەحەتیە ئارامی گرت تام و چێژەکەی دەڕوات..﴾.

ئاشنابووم بە کۆمەڵێ لاوی چاك، وورده وورده باوەڕ و دڵنیایم بەخوای گەورە زیادی دەکرد.. خوای گەورە منەتباری کردم بەشتێکی تر، ئەویش هیدایەتدانی هاوڕێ ئازیزەکەم بوو لەسەر دەستی من.. لە کۆتایی وتەکانمدا ئامۆژگاریەکی ڕاستگۆیانە ئاراستەی هەموو گەنج و لاوەکان دەکەم و دەڵێم: ئەی لاوانی ئیسلام بە خوا بەختەوەری نە لە گەشت کردن و نە لە ماددە هۆشبەرەکان و نەلە رابواردندا نابیننەوە، و نایبیننەوە و بۆنی ناکەن تەنها بە پابەند بوون و ئیستیقامەت نەبێ.. بۆ خزمەتی ئاینی خوا.. بۆ فەرماندان بە چاکە و قەدەغەکردنی خراپە.. خۆشەویستانی ئەم ئیسلامە ئایا چیتان پێشکەش بە ئیسلام کردووە؟ کوا شوێنەوارتان؟ ئایا ئەمە پەیامی ئێوەیە؟

لاوانی ئەم سەردەمە بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام

ئێوە گیانی ئەم ئیسلامەن و بە ئێوەوە دەگەشێتەوە

و ئێوە نهێنی بووژانەوە بوون لە کۆندا

و ئێوە بەرەبەیانی گەشاوەی نوێن

لە خوای گەورە دەخوازم ئێوە و ئێمەش دامەزراو بکات...وصلی الله علی نبینا محمد.

## ٢-﴿تەوبەی پزیشکێکی مەسیحی و موسڵمان بوونی لەسەر دەستی بانگخوازێکی موسڵمان﴾

جی میشیل ﴿٣٦ساڵ﴾ بەرپرسی دەزگای بە مەسیحی کردن لە ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە هاتبوو بۆ کارکردن لە صۆماڵ.. لەبەر ئەوەی تیمەکە هاتبوون بۆ کارکردن، بۆیە پێویست بوو ناوی خۆیان بنێت ﴿پرۆژەی نیشتیمانی بۆ بەرەنگار بوونەوەی نەخۆشی کوێریی﴾ میشل لە چالاکەکان بوو بۆ سەرپەرشتیکردنی تیمی پەرستاری، لەبەر ئەوە هەواڵی دانانی بە بەرپرسی تیمەکە موفاجەئە نەبوو بۆی، هاوکات لەگەڵ بەرێوەبردنی پرۆژەکەدا.. تیمەکە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٨ کەوتەڕێ و نەخشەی بە مەسیحی کردنی لە بەردەستدابوو لە ناوچەی ئەفریقیا لە ژێر لافیتەی ﴿بەرەنگار بوونەوەی نەخۆشیەکانی کوێری﴾.. سەرگوزەشتەی میشیل زۆر خۆش و شیرینە، چونکە لە دڵەوە هەڵقوڵاوە..بێگومان قسەی من جیاوازە لەگەڵ قسەی ﴿میشیل﴾ لە ڕووی ڕاستگۆیی و هەستکردنەوە.. بۆیە بەجێتان دێڵم تا خۆی بەسەرهاتەکان بۆ بگێڕێتەوە..

جی میشیل دەڵێ: بەختەوەریم لە صۆماڵ و صۆماڵیەکان گەورە بوو... لەوانەیە بەهۆی باش پێشوازیان بووبێت لێمان.. یان لەوانەیە بەهۆی هەستمانەوە بووبێت بەڕادەی ئەو هەژاریەی کە دووچاری بوو بوون لە کاتێکدا کە شانازیان بە خۆیانەوە دەکرد... یان بەهۆی ڕوخساری باشیانەوە کە لەگەڵ ئەسمەریەکەیاندا دەوتوانی لە هەموو جوڵە یان ئاماژەیەکیان بە ئاسانی تێبگەیت.. شتانێکی زۆر لەپشت دڵخۆش بوونمەوە بوو بە شوێنی پیشەکەم.. وا دیار بوو بە هۆی سەرقاڵیم بە کارمەوە و دڵخۆش بوون و ڕێزم بۆ گەلی صۆماڵی ئەرکی سەرەکی خۆمم لەبیر چووبوو.. کە من و تیمەکە لە پێناویدا هاتبووین.. و بە خێراییەکی سەیر چەندین هاوڕێی موسڵمانم هەبوو هەواڵیان دەپرسیم و هەواڵم دەپرسین.. دەستم کرد بەکاری بەرەنگار بوونەوەی نەخۆشیەکانی کوێریی، سەرپەرشتی چارەسەری دەیان حاڵەتم کرد، و وتەی ستایش و پیاهەڵدان لە هەموو زارەکانەوە دەردەچوون کاتێك بەناو هەر کۆمەڵێکیاندا ڕەت ببومایە یان بە هەر شەقامێکدا بچوومایە.. من لە وشەکانیان تێدەگەشتم هەرچەندە

زمانیان جیاواز بوو له زمانەکەی من.. بەڵام بریتی بوو لە زمانی هەست.. لەو نێوەندەدا و دوای پێنج مانگ لە سەرکەوتنی بێ وێنە لە بەرەنگار بوونەوەی کوێری، بروسکەیەکم بۆ هات لە کۆشکی سەرۆکایەتی ڕێکخراوی ئەڵمانیەوە کە سەرپەرشتی پرۆژەکەی دەکرد لە ئەڵمانیا! بە خۆمم ووت: لەوانەیە مژدەیەکی خۆش بێت و فەرمانیان دابێت بە خێرایی بگەڕێمەوە، یان لەوانەیە دیاری یان مەدالیا پێشکەش بە من و ئەندامانی تیمەکەم بکەن.. نەمدەتوانی ڕاڤەی داواکاریە سەیرەکەیان بکەم.. بە گرنگیەوە ڕۆشتنم بۆ ئینگلتەرە بۆ بەشداری لە خولێکی نوێدا کە یارمەتیم بدات لە سەرخستنی ئەرکەکەمدا، بەڕاستی لە ئەرکەکەمدا بە تەواوی سەرکەوتوو بووم، و کارەکانیش بە شێوەیکی باش بەڕێوە دەچوون، ئیتر ئەبێ چ پێویست بەو خولە بکات لە گەڵ کەسێکی وەکو مندا کە لە هەموو خولەکانی پێشوودا یەکەم بووم؟ نەم دەتوانی ڕاڤەی بکەم، و هەروەها نەمدەتوانی وەڵام بدەمەوە بە زیاتر لە بەڵێ. سەفەرم کرد بۆ ئینگلتەرە، لەوێ مانگێکم بەسەر برد.. گەڕامەوە بۆ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لە کاتێکدا چاوەڕێی فەرمان بووم بگەڕێمەوە بۆ صوّماڵ، دوای هەفتەیەك فەرمانەکە هات: ڕۆشتن بۆ تەنزانیا! جارێکی تر نەمدەتوانی ڕاڤەی ئەوە بکەم بۆچی دەمنێرن بۆ تەنزانیا، لە کاتێکدا لە سۆماڵ سەرکەوتوو بووم.. و لەبەر ئەوەی مشتومڕم لە گەڵیاندا نەکرد سەبارەت بەو هۆکارە، ئەوانیش بە تەواوی دڵنیابوون و بروسکەیەکیان دوای چوار هەفتە بۆ ناردم کە تیایدا داوایان کردبوو بگەڕێمەوە بۆ سۆماڵ.. لە خۆشیاندا دەستم کرد بە گریان! و گەڕامەوە بۆ سۆماڵ.. دوای پێنج مانگ دابڕان لەو ڕوخسارە گەشاوە و دڵە گەرمانە.. بە خێرایی پەیوەندیم بە پرۆژەکەوە کرد.. دەستم بە کارەکەم و سەرپەرشتیکردن کرد، شادیی سۆماڵیەکان بە گەڕانەوەم خەریك بوو نزیك دەبوویەوە لە شادی نەخۆشێك کە بینایی بگەڕێتەوە بۆ چاوەکانی.. ئەمە بوو هەستم پێ دەکرد بە تایبەتی لە ﴿محمد باهور﴾ی هاوڕێم.. ﴿محمد باهور﴾ بانگهێشتی کردم بۆ ماڵی خۆیان.. لەوێ زۆر بە گەرمی لە لایەن خێزانی و دراوسێکانیەوە پێشوازیان لێکردم.. لە کاتی دانیشتنم لەگەڵیاندا سەرسام بووم بە پیاوێك کە زۆر بە باشی بە ئینگلیزی قسەی دەکرد.. منیش دڵخۆش بووم بەوە، و زیاتر دڵخۆش بووم کاتێ کە زانیم باوکی ﴿محمد﴾ە، ئەوەتا فرسەتەکە

یەتەدی و ئەوەش بەشی دووەم و گرنگترین ئەرکی منە لە سۆماڵ یەتەدی! زمان لەمپەرێکی گەورە بوو لە ڕێگای بە مەسیحی کردندا، بەڵام بوونی نمونەی پیاوێکی ئاوا زیاتر یارمەتیم دەدات لە شیکردنەوەی ڕەهەندەکانی بە مەسیحی کردن و بە تایبەتی ئەصرانیەت، و ئەو پیاوەش هەمووان ڕێزی لێ دەگرن تا ئەو ئەندازەیەی نزیك دەبێتەوە لە ترس! دەستم کرد بە کارەکەم لەگەڵ ئەو پیاوەدا کە وام پێشبینی دەکرد کە ببێتە دەروازەیەك بۆ تەبشیر و تەنصیر ﴿واتە بە مەسیحیکردن﴾ لە هەموو ناوچەکەدا.. بە خۆمم ووت، با لەسەرەتادا سەبارەت بە هەموو ئاینەکان بە گشتی قسە بکەم و پاشان باسی ئینجیل و مەسیحی بۆ بکەم، کە دەرکم پێ کرد بوو وە زیاتر لە جارێك ئەوەم بۆ ئاشکرا بوو.. کە هەموو موسڵمانان خۆشیان دەوێ و دانی پیادا دەنێن! نازانم چی ڕوویدا، و چۆن ئەو پیاوە زانی کە باسەکەی من لەگەڵیدا سەبارەت بە ئاینەکانە! پێش ئەوەی دەست بە قسەکانم بکەم.. بینیم ﴿قورئان﴾ێك بە دەستیەوەیەتی و لێی پرسیم: ئایا ئاشنایت بەم کتێبە؟ خەندەیەکم کرد و وەڵامم نەدایەوە لە ترسی وروژاندنی یان زانینی بە ڕۆڵی من! جارێکی تر هەستم کرد کە ئەو پیاوە دەزانێ چی بە مێشکی مندا دێت، فرسەتی پێدام لەو تەنگە تاویە بێمە دەرەوە، ئەو دەستی کرد بە باسکردنی مەسیح و باسکردنی ئینجیل، داوای لەمن کرد کە هەر پرسیارێکم هەیە ئاراستەی بکەم، جا ئایا سەبارەت بە ئینجیل بێت یان قورئان! ووتم: چۆن؟ ووتی: لە قورئاندا هەموو شتێك هەیە! سەردانەکەم کۆتایی هات و گەڕامەوە بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونم، لە کاتێکدا بیرم دەکردەوە کە چۆن زاڵ ببم بەسەر عەقڵ و بیر و هۆشی ئەو پیاوەدا.. ئەگەر سەرکەوتووبم لەوەدا ئەوە بێگومان هەنگاوێکی گەورەم ناوە و دوای ئەوەش بە ئاسانی یەکە بەیەکەیان بانگەشە دەکەم.. گەڕامەوە بۆ سەر هەندێ لە بڵاوکراوە و نامیلکە، گاڵتەم بە خۆم دەهات کەوا هەستم دەکرد دەڵێی قوتابیم و خۆم ئامادە دەکەم بۆ تاقیکردنەوەیەکی مەترسیدار! خۆم دڵنیاکرد و ووتم: بەڕاستی ئەمە ئەرك و کارێکی ئاسانە، من خۆم زیاد لە پێویست گەورەم کردووە، زاڵ بوون بەسەر بیرکردنەوەی پیاوێکی وەکو باوکی محمد کارێکی ئاسانە.. بێگومان ئاسانە و دەرچووم بۆ سەر کارەکەم، کارەکەمم تەواو کرد و دەستم کرد بە گەڕان بەدوای ﴿محمد باهور﴾دا، بەو ئومێدەی بەڵێنی سەردانێکی ترم پێ بدات تا بگەم بەو

پیاوه ﴿كە دەروازەی كارەكەی منە﴾.. بەڵێ لەو دیدارەدا سەرەتای كار دەستی پێكرد: هەر كە دانیشتم، ئەو پیاوە پرسیاری سروشتی پیشەكەی منی كرد، منیش وتم: كاری پزیشكیە! پێی ووتم: بەڕاستی ﴿قورئانی پیرۆز﴾یش بە درێژی باسی كرداری ﴿دروستكردن﴾ و ﴿سەرەتای دروستكردن﴾ی كردووە.. و هەموو ئەو گۆڕانانەی كە ڕوودەدات بەسەر مرۆڤدا! وتم: چۆن؟ وەك ئەوەی ئەو پیاوە چاوەڕوانی ئاماژەی سەوز بكات.. بە زمانێكی ئینگلیزی باش دەستی كرد بە قسەكردن.. ئەوە گرنگ نەبوو، ئەوە گرنگ بوو كە بە هەستێكی توند قسەی دەكرد بۆ هەر وشەیە كە لەزاری دەهاتەدەر... بە ڕاشكاوانە پێتان دەڵێم: بە ڕاستی زۆر سەرسام بووم بە كتێبێك كە تەمەنی زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ بوو كە باسی چۆنیەتی گەشەی كۆرپەلە دەكات لە ڕەحمی دایكیدا! بۆ ساڵانێكی درێژ من خوێندبووم و مەشقێكی سەختم كرد بوو ئینجا قۆناغەكانی گەشەی كۆرپەلەم دەزانی، بەڵام ئەوەی ئەو پیاوە باسیكرد زۆر سەرسامی كردم و لە هەمان كاتیشدا زۆر ئازاری دام!! عادەتەن خۆم هێور كردەوە و ئەو جەنجاڵیەم لەسەر خۆم لابرد تاوەكو بتوانم بخەوم، هەندێ لە كارەكانی خۆمم سپارد بە ئەندامانی تیمەكە.. هەر بیرم دەكردەوە چۆن سەركەوتووبم لە بەشی دووەمی ئەركەكەمدا كە ﴿بەمەسیحی كردن﴾ بوو، وەك چۆن سەركەوتوو بووم لە بەشی یەكەمی كارەكەمدا ﴿بەرەنگار بوونەوەی نەخۆشیەكانی كوێری﴾.. ڕاستە من سۆماڵ و سۆماڵیەكانم خۆش دەوێ، بەڵام كارەكەم و نەصرانیەتیشم خۆش دەوێ، ئیتر بۆچی ڕایان نەكێشم بۆی، سەر لەنوێ ناچار بووم كە داوا لە ﴿محمد باهور﴾ بكەم كە سەردانیان بكەم، بەڵام پێش ئەوەی ئەو داوایەی لێ بكەم، ئەو لە پێشا داوای لە من كرد كە ڕۆژانە سەردانی باوكی بكەم ئەگەر بۆم بڕەخسێت، چونكە پێی خۆشە و زۆر حەز دەكات لە گەڵیدا دانیشم! لەسەرەتادا دڵخۆش بووم، بەڵام بەخۆمم ووت: چۆن دڵخۆش ببم، كە من تا ئێستا نەمتوانیوە كۆنترۆڵی ئەو بكەم.. ئەو هەمیشە دەس پێشخەرە، بۆچی من دەست نەكەم بە هێرش یان شەڕكردن؟ باسی درێژەی سەردانەكانم ناكەم لە سەردانی سێیەم و چوارەم و پێنجەمدا، بە تەواوەتی ئابلۆقە درابووم، دەچووم بۆ لای ئەو پیاوە و خۆم ئامادە دەكرد كە بەرەو ڕووی ببمەوە، بەڵام قسەكانی و ڕاستگۆییەكەی و توانای تەواوی لە ڕاڤەكردن و ڕونكردنەوەیاندا وای

لێدەکردم کە لە بەردەمیدا وەك قوتابیەك وابم کە بۆ یەکەم جار گوێ لە وانەکانی ئاین بگرێت.. نەمدەزانی کە هەر لە یەکەمین سەردانمەوە بۆ ماڵی باوکی ﴿محمد﴾ چاودێری دەکرێم.. چاودێریەکەش دیاربوو زۆر وردەکارانە بوو، تەنانەت گەشتبووە ئەوەی کە ئەندامانی تیمە پزیشکیەکە ڕاشکاوانە پێم بڵێن و داوام لێبکەن کە نەڕۆم بۆ ئەو ماڵە یان پەیوەندیکردن بەو خێزانەوە.. چاودێریەکە کۆتایی پێهات و بڕیار دەرچوو لە ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە کە پێویستە من ئەو سەربازگەیە بەجێ بێڵم! پێش ڕاپەڕاندنی فەرمانەکە بە یەك ڕۆژ، بۆم دەرکەوت کە بڕیارێکی تریش دراوە بە گواستنەوەی ﴿محمد باهور﴾ لە کارەکەی بۆ شوێنێکی تر.. هێزێك نەبوو کە بتوانێ بەرم لێبگرێت کە ﴿محمد باهور﴾م خۆش نەوێت، باوکی و خێزانەکەشیانم خۆش دەویست، هەموو سۆماڵیەکانم خۆش دەویست.. چەند ڕۆژێکی کەم لە (مەقەدیشۆ) مامەوە، سەرۆکی تیمی کاری ئەڵمانی بڕێ پارەی زۆری نارد بۆ هەندێ لە بەرپرسەکانی ئاسایش لە ناوچەکەدا.. ئەوەش بۆ بەرگرتنم لە گەیشتن بەو ناوچەیە.. کاتێ سەرکەوتوو بووم، دوای ئەوەی سەرکەوتوو بووم لە ڕازیکردنی چەند بەرپرسێکی تر کە لێبڕاو و کارامە بوون لە کاردا هەواڵی دڵتەزێنم بیست، کە ﴿محمد﴾ دەستبەسەر کرابوو بەهۆی پەیوەندی بە منەوە! لە پێناو ﴿محمد﴾دا زۆرگریام، و زۆر ئازارم چەشت بەهۆی نەتوانینم تا گەشتەکەم لەگەڵ باوکیدا تەواو بکەم. من دەمەویست بگەم بە کۆتایی. بە مانایەکی دروست بگەم بە سەرەتا، یان کۆتایی ئەو گومانانەی دەهاتنە ناو عەقڵمەوە بەهۆی قسەکانی ئەو پیاوەوە، یان سەرەتایەك بۆ گەشتێکی نوێ.. لەو کاتەدا بروسکەیەکی ترم بۆ هات لە ئەڵمانیاوە کە داوای لێکردم سۆماڵ لەماوەی چەند ڕۆژێکدا بەجێ بهێڵم و بڕۆم بۆ کینیا بۆ بەسەر بردنی ﴿مۆڵەتێکی خۆش﴾!

بیانوم هێنایەوە کە هەندێ لە فایل و دۆسیەکان لە شوێنی سەربازگەکەم بهێنم، هەواڵم بە بەرپرسی ئاسایشدا، هەر کە ڕۆشتم کەوتمە ڕێ بەرەو ماڵی ﴿محمد باهور﴾ لە ماڵیاندا خۆشیەکی ناسروشتیم بینی، تۆ هاتیت لەگەڵ سەر هەڵدانی مانگی خێر و بەرەکەتدا، پرسیاری ئەو مانگەم لێکرد ووتی: ئەوە مانگی ڕەمەزانە! لە گەڵیاندا نانی پارشێوم خوارد، پێش بەرەبەیان هەموو خەڵکی ناوچەکەم بینی بۆ نوێژکردن دەڕۆن،

لەگەڵیاندا یەك ڕۆژی تەواو مامەوە، بۆ ڕێزگرتن لە هەستیان ناچاربووم بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا یەك ڕۆژی تەواو بەڕۆژووبم و خواردن و خواردنەوە نەخۆم! لە ﴿یوروبی﴾ لە فرۆکەخانە کەسێك پێشوازی لێ کردم و پێی وتم کە من لەبری ئوتێل لەماڵێکی گەورەدا دەمێنمەوە، پێشوازی کردن لەوێ گەرم بوو، بەڵام دوای چەند هەفتەیەك هەواڵێکی تریان پێدام کە زۆر ئازاراوی بوو. لە بروسکەکەدا هاتبوو دەیوت: ﴿ناتوانیت جارێکی تر بگەڕێیتەوە بۆ سۆماڵ لە بەر هۆکاری ئاسایش﴾ بۆچی؟ چۆن؟ و لە بەرژەوەندی کێیە ئەم بڕیارە؟ کەسم شك نەدەبرد وەڵامی پرسیارەکانم بداتەوە، کەمێ هێور بوومەوە، کاتێ کە یادی هەڵوێستی ﴿محمد﴾و باوکی و خێزانەکەیم دەکردەوە لەگەڵمدا وە یادی هەموو ڕوخسارە سۆماڵیەکانم دەکردەوە کە پێیان گەشتبووم.. نامەیەکی گەرما و گەرمم لە باوکمەوە بۆ هات داوای لێکردبووم کە بە خێراترین کات بگەڕێمەوە بۆ ئەڵمانیا.. نامەکە وای دەردەخست کە باوکم پێی گەشتووە سەفەری من بۆ سۆماڵ مەترسیدارە! و هەروەها بۆم دەرکەوت سەرۆکایەتی لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ڕاپۆرتی درێژی لە لایە سەبارەت بە من و جموجوڵی تەواوم، منیش بڕیاری خۆمدا! بەراوردی ئەوەم کرد کە ڕوودەدات لە ئەڵمانیا و ئەوەی کە لە سۆماڵ ڕوودەدات، سەبارەت بە خەمخواردنی خەڵکی بۆ من و پرسیارکردنی بەردەوامیان سەبارەت بە من، دەرگام لەسەر خۆم داخست و دەچووم گوێم لەو وانانە دەگرد کە لە باوکی محمدم دەبیست... پەڕەیەکی سپیم هێنا و قەڵەمم ئامادە کرد و ئەم بروسکەیەم نووسی بۆ سەرۆکایەتیەکەم لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا: بە تەواوەتی دڵنیا بن، هەموو شتێك ئاساییە، من دەچمە سەر ئاینی ئیسلام. نامەکەم لە سنوقی پۆستە دانا تا کۆتایی بە گەشتی پڕ دڵە ڕاوکێ و نائارامی بهێنم. کاتێ بەرەو سنوقی پۆستە دەڕۆشتم وام هەست دەکرد یەکەم ڕۆژی زاوایەتی منە.. ڕۆشتم بۆ لای هاوڕێکانم لە ﴿ئیرۆبی﴾ پێم ووتن: بڕیارم داوە بە هەر نرخێ بێ بگەڕێمەوە بۆ سۆماڵ! دەگەڕێمەوە کە تەنانەت با بەو هۆیەشەوە بمکوژن! سروشتی بوو کە شتێ شك نەبەم کە بڕیاری گەڕانەوەمی پێ جێبەجێ بکەم.. هەرچی پێداویستی و پۆشاکەکانم هەیە فرۆشتم، بێجگە لە جلەکانی بەرم، کە لەگەڵ خۆمدا هێنا بووم.. توانیم نرخی بلیت دابین بکەم بەرەو ئیمان! بەڵێ بەرەو ڕێنمایی کەوتومەڕێ و بەرەو

ماڵی باوکی ﴿باهور﴾ هەر کە باوەشی پیادەکردم بە ئەسپایی پێم ووت: ﴿اشهد أن لا إله الله، واشهد أن محمد رسول الله﴾! کاتم نەبوو بۆ خۆشی و شادی، دەستم کرد بە دیراسەو لەبەرکردنی باشی قورئانی پیرۆز و فەرمووده، سۆماڵیەکان زۆر سەرسام بوون بە من، چونکە بەرپرسەکان لە ناوچەکەدا بەشێك بوون لەچنراوی ئەو گەلە.. سەرکەوتووبوون لە دەرککردنی بریاردا کە رێگای دەدا بە جموو جووڵی من و ژیان لەگەڵ سۆماڵیەکان لە هەرکات و هەر شوێنێکدا بێت وەك برایەکی موسڵمان کە ناوە نوێکەی ﴿عبدالجبار﴾ە... تەنها ئێستا بیرم لەو پرۆژەیە کردەوە کە ئێمە هەڵدەستاین بە راپەراندنی سوپاس بۆ خوا پرۆژەکە وەستا بەبێ ئەوەی سەرکەوتوو بێ لە بەشی دووەم یان یەکەمیدا کە تایبەت بوو بە ﴿بە مەسیحی کردن﴾ بەڵام سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا لە بەشی تایبەت بە چارەسەرکردندا.. لەبەر ئەوە موفاجەئە نەبوو بۆ من بە رەزامەندی ﴿عبدالله نصیف﴾ ئەمینداری گشتی رابیتەی جیهانی ئیسلامی لە مەککەی پیرۆز کە بەردەوام بم لەو پرۆژەیەدا لە شێوازێکی نوێدا شێوازی خێر و کارکردنی دڵسۆزانەی تەواو بۆ خوای گەورە، ئەوەتا دەگەرێمەوە!

## ٣- ﴿تەوبەی خێزانێکی تەواو لە خواردنی حەرام﴾

لەسەر دەستی یەکێ لە ئەندامەکانی، خێزانێکی تەواو لە سەر حەرام دەژیان، خواردنی حەرامیان دەخوارد.. بە ویستی خوای گەورە یەکێ لە ئەندامەکانی هیدایەت دەدرێت و دەبێتە هۆی هیدایەتی خێزانەکە بە تەواوی.. خۆی بەسەرهاتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: من لاوێك بووم و ژیانێکی خۆشم لەگەڵ باوکم بەسەردەبرد لە یەکێ لە گەڕەکە ڕاقیەکانی قاهیرەدا.. عارەق بەشێوەیەکی سروشتی لەسەر سفرە دادەنرا، و بە باشی دەمزانی کە داهاتی باوکم هەمووی حەرامە، بە تایبەتی سوو(الربا).. لە پاڵ ماڵەکەماندا مزگەوتێکی گەورە هەبوو مەلایەکی تێدا بوو ناوی ﴿ئیبراهیم﴾ بوو.. ڕۆژێکیان لە بالکۆنی ماڵەوە دانیشتبووم و مەلاکە قسەی دەکرد، سەرسام بووم بە قسەکانی.. لە بالکۆنەکە دابەزیم و ڕۆشتم بۆ مزگەوت تا خۆم بینیەوە داماڵراوم لە هەموو شتێ، بووم بە شتێکی تر، مەلاکە باسی فەرموودەی پێغەمبەری دەکرد ..سەبارەت بە پەیداکردن بە ڕێگەی حەرام... خۆم بینیەوە کە نامەوێ بڕۆمەوە بۆ ماڵ، و نامەوێ هیچ خواردنێکیان بخۆم، دەڕۆشتمە ماڵەوە و دەهاتمە دەرەوە، بە دەست ئەنقەست هیچ شتێکم نەدەخوارد و دوور لە خێزانەکەمان دادەنیشتم، پارچە پەنیرێك و چەند ﴿فەلافل﴾ێکم لە بەردەممدا دانا، خێزانەکەشمان هەرچی حەزت لێبکردایە لەبەردەمیاندا دانرا بوو، دایکم خەریکبوو لە خەفەتا بۆ من دەمرد، دەیەویست لەگەڵیاندا نان بخۆم، بەڵام من ڕازی نەدەبووم و تێمگەیاند ئەو پارەیەی کە باوکم پەیای دەکات حەرامە، ئەوانیش خواردن و خواردنەوەی حەرام دەخۆن.. دایکیشم هاتە پاڵم و دەستیکرد بە نوێژکردن، دوای ئەو خوشکەکەشم هاتە پاڵمانەوە، بەڵام باوکم هەر سوور بوو لەسەر نەیاری و نکوڵیکردن.. منیش بەرێز و ئەدەبەوە مامەڵەم لەگەڵ باوکمدا دەکرد.. شەو هەڵدەستامەوە و گوێم لە گریان و پاڕانەوەی دایکم و خوشکەکەم بوو کە دەپاڕانەوە تاوەکو خوای گەورە هیدایەتی باوکم بدات.. ڕۆژێکیان بەیانی بوو کە هەستامەوە باوکمم بینی هەرچی عارەقی ماڵەوە هەیە لایبردبوون، پاشان بە کوڵ دەگریا، و منی نا بەسنگیەوە و دەیوت: دەبێ واز لەهەموو ئەو شتانە بهێنم کە خوای گەورە تووڕە دەکەن.. کاتێکیش کاتی نوێژ هات دەستی باوکمم گرت و ڕۆشتین بۆ مزگەوت، گوێی لە وتاری مەلاکە گرت، سوپاس بۆخوا ڕزگاری بوو لە ﴿سوو﴾و لە عارەق. سوپاس بۆ خوا ماڵمان پڕبوو لە خواپەرستی..

## ٤- ﴿تەوبەی پیاوێك دوای مردنی خاوەنەكەی بە مادەی هۆشبەر﴾

بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: حەزم لە گۆرانی و بەزم و ڕەزم بوو لار و لەنجەم دەكرد بەملاولادا، بە هەموو دەنگم هاوارم دەكرد كاتێ لەگەڵ پێڕەكەی خۆمدا پێكم بە دوای پێكدا هەڵدەدا.. گوێم لە دەنگی ﴿مایكل جاكسۆن﴾ دەگرت لەو شوێنە ڤایرۆساویە كە پڕبوو لە شەیتانەكان كە پێیان دەوت ﴿دیسكۆ﴾.. ئەمە لە وڵاتێكی عەرەبیدا، ڕامدەكرد بۆی، هەركاتێ هاوڕێیەكم یان دۆستێكم هانی بداmایە... ماڵ و تەندروستی خۆمم بۆ خەرج دەكرد.. دوور دەكەوتمەوە لە منداڵەكانم و كەسوكارم... هەستیشم بە غەم و ماتەمی دەكرد... بەڵام شەیتان كاریگەری گەورەتری هەبوو لەسەر هەستكردنم بە پەشیمانی و ماندوێتی. ئەو حاڵەتە درێژەی كێشا... هەوا و ئارەزووی دەروون زیاتر لەو وڵاتە عەرەبیە پەلی هاویشت، بووم بە عاشقی زیاتر لە پایتەختێكی وڵاتانی ئەوروپی... لەوێ، خراپەكاریم دەبینی بە شێوەیەكی ئاشكرا و ئاسان و ئاسایی.

ڕۆژێك لە ڕۆژانی كۆتایی مانگی شەعبان، هاوڕێیەكم ئاماژەی بۆ كردم كە گەشتێ بكەین بۆ ﴿بانكۆك﴾ و بلیتێكی خۆڕایی بۆ پێشنیار كردم و هەروەها مانەوە بە خۆڕایی، منیش دڵخۆش بووم بەو پێشنیارە. جانتاكانم پێچایەوە و بەرەو (بانكۆك) ڕۆشتین، لەوێ كارانێكی خراپەكاریم ئەنجامدا، كە لە ژیانمدا شتی وام نەكردبوو، لە شەوێكی سووردا من و هاوڕێكەم لە یەكێ لە شوێنە خراپەكاریەكاندا كۆبووینەوە، لەو شەوەدا عەقڵمان لەدەست دابوو، كە هاتینە دەرەوە تەواو مەست بوو بووین، لە ڕێگاماندا بەرەو ئەو ئوتێلەی نیشتەجێ بووین تیایدا، هاوڕێكەم توشی حاڵەتێكی بێئاگایی سەخت بوو.. منیش حاڵەتم ئەوەندە باش نەبوو كە یارمەتی بدەم، بەڵام زاڵ بووم بەسەر خۆمدا و تەكسیەكم وەستاند و بەرەو ئوتێل بردینی.. لە ئوتێلەكەدا... بە پەلە ناردم بەدوای پزیشكدا.. لەوكاتەدا هاوڕێكەم خوێنی هەڵدەهێنایەوە و دوای سێ ڕۆژ لە چارەسەركردنی تایبەت، گەڕاینەوە بۆ لای كەسوكارمان، حاڵەتی تەندروستی هاوڕێكەم خراپتر دەبوو.. دوای ڕۆژێك لە گەڕانەوەمان.. بردیان بۆ

نەخۆشخانە، پێش ئەوەی بگەمە ژوورەکەی ئەو هەستم بە جموجوڵێکی سەیر کرد.. لەو بەشەدا کە هاوڕێکەمی لێبوو، لە بەردەرگاکەدا وەستام.. گوێم لە هاوار و لاواندنەوەوە بوو، هاوڕێکەم وەفاتی کرد دوای خوێنبەربوونێکی سەختی ناوسك، دەستم کرد بە گریان و لە نەخۆشخانە هاتمە دەرەوە و وا بیرم دەکردەوە کە من ئەو کەسە بووم کە ژیانی ئەوم فەوتاند.. و لەچاو تروکانێکا کۆتایی هات.. دەستم کرد بە گریان و دەپاڕامەوە لە خوا کە لێم خۆش ببێت... پێشوازیم لە مانگی ڕەمەزان کرد بە خواپەرستی و ئیعتیکاف ﴿مانەوە لە مزگەوت﴾و شەو هەستان و خوێندنەوەی قورئان، دەرچووم لە ژیانی خراپەکاری و بێ سەروبەری، بۆ ژیانێك تیایدا هەستم دەکرد بە ئاسایش و خۆشی و سەقامگیری کە دووربووم لەوشتانە و هەمیشە سەرقاڵی خراپەکاری بووم هەتا هاوڕێکەم بە بەرچاومەوە گیانی سپارد.. لە خوای گەورە داواکارم کە لێم خۆش ببێت.

# ٥- ﴿تەوبەی مامۆستایەك لەسەر دەستی قوتابیەكی خۆی﴾

گرنگیدان بە حیجاب و پارێزگاری كردنی هەنگاوی یەكەمە لە سەرەڕێی پابەندبوون بە نیسبەت ئافرەتەوە، و مەبەستم لە حیجاب حیجابی خوو پێوە گرتن نیە، كە هەندێ ئافرەت دەیپۆشن و زیاتر سەرنج راكێش دەبن لە بەردەم مرۆڤە گورگەكاندا، بەڵكو مەبەستم حیجابی شەرعیە كە ڕێز و شایان بە ئافرەت دەبەخشێ. وەك خوای گەورە سەبارەت بە ئافرەتانی ئیماندار لە ئایەتی حیجابدا دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلاَ يُؤْذَيْنَ﴾الاحزاب/٥٩..واتە: ﴿ئەمە نزیكترە لەوەوە كە بناسرێن ئافرەتی ڕوو هەڵماڵراونین و خەڵك بزانن كۆمەڵی مسوڵمانانن و ئازار نەدرێن و مرۆڤی بێ شەرم و حەیا ڕێیان پێ نەگرن﴾..

كاتێ خەڵكی ئافرەتێك دەبینن حیجابێكی شەرعی تەواوی لەبەردایە، دەزانن كە لە ئافرەتە پاكیزەكانە ئیتر ناتوانن ئازاری پێ بگەیەنن و هەتكی بكەن.. و وڵاتی ئێمە سوپاس بۆ خوا ئافرەتەكانی ناسراون بە لەبەركردنی حیجابی شەرعی كە بە پلەی یەكەم ڕوخسار دەگرێتەوە، هەرچەندە هەوڵی بەردەوام هەیە لە لایەن هەندێكەوە كە دەیانەوێ وردە وردە ئافرەتان بەرن بەرەو گوێنەدان بە پۆشاكی شەرعی و پاشان بۆ لابردنی تەواوی بالاپۆشی تا كارەكە لە كۆتاییدا بڕوات بەرەو بێ پۆشتەیی و تێكەڵی لە شوێنە گشتیەكاندا و لەسەر كەنارەكانی دەریا و شوێنانی تر، و چۆن ئەوە حاڵی زۆرێك لەو وڵاتانەیە كە ئەو خراپەكارانە تیایدا گەشتون بە مەرامەكانی خۆیان... بەڵام ئەم وڵاتە جیاوازە لە وڵاتانی تر.. ئافرەتانیان-سوپاس بۆ خوا- هۆشیاریەكی تەواویان هەیە سەبارەت بە پلانی دوژمنان.. با پۆشاكی ئاینیش لەبەر بكەن، و خۆیان لە شێوەی ئامۆژگاریكاردا نیشان بدەن.. ئەم چیرۆكەی بۆتان دەگێڕمەوە نمونەیەكی جوانی ئافرەتانە لەم وڵاتە موسڵمانەدا.. خاوەنی چیرۆكەكە دەڵێ: ڕاهاتبووم لە وڵاتەكەمدا بەبێ بالاپۆشی بڕۆمە دەرەوە.. جلی مۆدەو سافیرەیی لەبەر بكەم... و سووربم لەسەر پۆشینی دوا مۆدێلی جل و بەرگەكان... ویستی خوای گەورە وابوو كە بێمە شانشینی سعودی بە مەبەستی گرێبەستی كاركردن لەگەڵ لایەنێك، لە

سەرەتای کارەکەمدا پێویست بوو پابەندبم بە نەریت و خوی ئەو وڵاتەوە.. بۆیە عەباو پەچەکەم پۆشی.. بەو شێوەیە مامەوە هەتا کاتی سەفەرکردنم هات بۆ وڵاتی خۆمان.. لە فڕۆکەخانە عەبا و حیجابەکەم لابرد، لە پڕ چاوم کەوت بە یەکێ لە قوتابیەکانم کە سەفەری دەکرد لەگەڵمدا بۆ وڵاتەکەی من بۆ بەسەر بردنی پشوەکەی.. زۆر دڵخۆش بووم بە بینینی قوتابیەکەم، هەر کە سڵاوی لێکردم بە پەلە پێی ووتم: ﴿ماموٚستاکەم بڕوام نەدەکرد کە تۆ باڵاپۆش نەبیت، بە پێچەوانەی ئەوەبیت کە لە کاتی وانە وتنەوەدا تۆم دەبینی...﴾ لێم پرسی: بۆچی وا دەڵێیت؟... خۆ بەڕاستی من سورم لەسەر ئەنجامدانی ئەرکە ئاینیەکانم وەکو نوێژ و ڕۆژو و نەکردنی هیچ کارێکی خراپ.. ئەویش ووتی: ئەوەی تۆ ئێستە تیایدایت خودی خراپەکاریە.. لەو ساتەدا هەستم بە ئیحراجی کرد لە گەڵ قوتابیەکەمدا کە شانزە ساڵی تێنەپەڕاند بوو.. ئێستا ئەو ئامۆژگاریم دەکات و ئاراستەم دەکات بۆ ڕێگای ڕاست.. لە ڕاستیدا هەستم کرد کە ئائارامم، ئاواتم دەخواست بەهۆی شەرم کردنەوە لەخوای گەورە زەوی قوتی بدامایە... هەر لەو ڕۆژەوە بڕیارمدا حیجاب بپۆشم بۆ ئەنجامدانی فرمانی خوای گەورە و بەگوێکردنی فەرمانەکانی..و بۆ پارێزگاریکردنی ڕێز و حورمەتی خۆم لە چاوی بێگانەکان... خوای گەورە پاداشتی ئەو قوتابیە دڵسۆزە بداتەوە –کە تەمەنی تەنها شانزە بەهار بوو– بە ڕاستی هەڵوێستێکی جوانی نواند.. بە ڕاستی موسڵمان شانازی بە بوونی نموونەی ئەو جۆرە کچە مسوڵمانانەوە دەکات لە کۆمەڵگاکەیدا، لە خوای گەورە داواکارم کە ئافرەتانی موسڵمان و کچەکانیان لە هەموو خراپەیەك بپارێزێ.. بەڕاستی خوای گەورە تواناداره بەسەر ئەوەدا..

## ٦- ﴿تەوبەی کچێك لە حەرەمی زانکۆدا﴾

ئەم کچە تەوبەکارە دەڵێ: چەندە ناخۆشە مرۆڤ لەم ژیانەدا بەبێ ئامانج بژی، و چەند سەختە کاتێ وەکو ئاژەڵ وایە.. هیچ خەمێکی نیە بێجگە لەوەی کە بخوات و بخواتەوە و بخەوێت، بە بێ ئەوەی دەرك بە نهێنی بوونی خۆی بکات لەم ژیانەدا... بەڵێ من پێش ئەوەی خوای گەورە هیدایەتم بدات بەو شێوەیە بووم.. هەر لەسەرەتای ژیانمەوە لە ماڵێکی دینداردا گەورە بووم... و لە ئامێزی باوك و دایکێکی دینداردا... لە نێو خزمانماندا تەنها ئەو دوانە پابەند بوون بە ئاینەوە، هەندێ لە خزمان لۆمەی باوکمیان دەکرد، چونکە گۆڤارە بێکەڵکەکان و ئامێرەکانی ئارەزوو بازی و فەساد لە ماڵەکەیدا نەبوو، بە کەسێکی وشك و ئاڵۆز تەماشایان دەکرد!!! بە پێچەوانەی ئەوەوە، من تەنها بە ویراسەت موسڵمان بووم، بەڵکو ڕقم لە ئاین و پەیڕەوانیشی بوو، ڕقم لە نوێژ بوو، بە درێژایی ڕۆژانی ژیانم لە قۆناغی ناوەندی و ئامادەییدا یەك ڕکات نوێژم بۆ خوا نەکرد، ئەگەر باوکم لێی بپرسیمایە: ئایا نوێژت کرد؟ دەموت: بەڵێ.. درۆ و دووڕوو..بەڕاستی هاوڕێ خراپەکانم ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە خراپ کردن و سەرەڕۆیی مندا، ئەوان هەموو شتێکیان بۆ دابێن دەکردم کە داوام بکردایە لە گۆڤاری بێ ئەرزش و گۆرانی و کاسێتە بێ بەها و ئەرزشەکان بەبێ ئەوەی باوکم بزانێت... سەبارەت بە پۆشاکیش تەنها کورت و تەسکم لەبەر دەکرد... زۆر شلگیر بووم لە بالاپۆشیدا و بێزار بووم لێی، چونکە سەبارەت بە حیکمەتی مەشروعیەتی حیجاب هیچم نەدەزانی... ڕۆژان تێدەپەڕین و منیش هەر بەو شێوازە مابوومەوە هەتا قۆناغی ئامادەیم تەواو کرد... دوای دەرچوونم ناچار بووم گوندەکەمان جێ بێڵم کە نیشتەجێ بوین تیایدا بەرەو شاری ﴿ریاض﴾ بۆ تەواو کردنی خوێندنی زانکۆ.. لەوێش ئاشنا بووم بە هاوڕێیانی تر، ئەوانیش هاندەرم بوون بۆ ئەو گوناه و تاوانانەی کە دەمکردن، بەڵام ئەوان پێیان دەوتم: ﴿بەلانی کەمەوە نوێژ بکە لەگەڵماندا پاشان هەر تاوانێ دەیکەیت بیکە﴾ لەلایەکی تریشەوە هەندێ خوشکی تر هەبوون کە پابەندبوون بە ڕەفتارە ئیسلامیەکانەوە، بەردەوام ئامۆژگاریان دەکردم، ئەوان وازیان لە ئامۆژگاریکردنم نەدەهێنا بەدانایی و ئامۆژگاری جوان.. منیش زیاتر سەرسەخت بووم و دوور دەکەوتمەوە... کاتێ خوای گەورە ڕێنمایی کردم و کۆمەکی

کردم که بگوازمەوە بۆ ژوورێکی تر لە شوێنی نیشتەجێ بوونەکەم، ویستی خوای گەورە وابوو کە هاوڕێکانی ئەمجارەم کۆمەڵێ خوشك بوون کە پابەند بوون بە ئیسلامەوە.. لەسەر ڕەوشت و ئاکاری جوان بوون، و شێوازی جوان لە ئامۆژگاری و بانگەواز، ئامۆژگاریان پێشکەش دەکردم بە ڕێگای سەرنج ڕاکێش، و شێوازی خۆش، بە درێژایی مانەوەم لەگەڵیاندا، گوێم لە ئۆفێك یان قسەیەکی خراپیانەوە نەبوو، بەڵکو دەم بەخەندە بوون بەرامبەرم، و هەرچیم پێویست بوایە لە یارمەتی پێشکەشیان دەکردم، کاتێك بیانبینیمایە گوێ لە گۆرانی و مۆسیقا دەگرم، بێزاریان پێوە دەردەکەوت و پاشان لە ژوورەکە دەچوونە دەرەوە، بە بێ ئەوەی هیچم پێ بڵێن، منیش توشی ئیحراج بوون و شەرم دەبووم لەو کردەوەیەم و ئەگەر بگەڕانایەتەوە لە نوێژکردن لە ﴿نوێژگە﴾کەی شوێنی نیشتەجێ بوونماندا، بەسەریان دەکردمەوە لە ژوورەکەدا و ناخۆشیان دەردەبڕی کە ئامادەی نوێژکردن نەبووم.. منیش لە ناخی خۆمدا هەستم بە شەرم و پەشیمانی دەکرد، خۆ من هەر لە بنچینەدا نوێژ ناکەم چ جای نوێژکردنی بە کۆمەڵ.. ڕۆژێکیان من سەرپەرشتی یەکەکەم دەکرد و دەنگی گۆرانیش بەرز بووبوویەوە، یەکێ لە هاوڕێکانم لە ژوورەکەوە هات و پێی ووتم: ئەوە چیە؟ بۆچی دەنگی کز ناکەیت.. تۆ ئێستا بەرپرسیت و پێویستە ببیت بە پێشەنگ بۆ کەسانی تر.. بە ڕاشکاوانە پێم ووت: من گوێ لە گۆرانی دەگرم و حەزم لێیە.. ئەو خوشکە تەماشایەکی کردم و وتی: خوشکی بەڕێزم، ئەوە هەڵەیە، پێویستە یەکێکیان هەڵبژێری: یان ڕێگای خێر و چاکە و پشتیوانان، یان ڕێگای شەڕ و خراپە و هەواداراني.. ناتوانیت لە یەك کاتدا بە دوو ڕێگادا بڕۆیت.. کاتێ بە ئاگا هاتمەوە لە بێئاگاییکەم، پیاچوونەوەی خۆم کرد.. دەستم کرد بە نمایشی ئەو نمونە زیندووە دڵسۆزانە لە مێشکی خۆمدا.. کاتێ ئیسلام پیادە دەکەیت و هەوڵ دەدەیت بڵاوی بکەیتەوە بە چەندین هۆکار و شێوازی جوان جوان.. بۆیە لە ئەنجامدا گەڕامەوە بۆ لای خوای پەروەردگارم و تەوبەکردنی خۆم ڕاگەیاند.. هاتمەوە هۆش.. ئێستا من – سوپاس بۆ خوا– لە بانگخوازانی ڕێگای خوام.. وانە و موحازەرات پێشکەش دەکەم، و گرنگێتی ڕەفتاری خوشکی بانگخواز لە بەرنگاربوونەوەی خەڵکیدا.. و هەروەها هەموو خوشکانم ئاگادار دەکەمەوە لە هاوڕێی خراپ.. خوای گەورە کۆمەکی هەموان بێت..

## ٧-﴿تەوبەی لاوێکی بینائاگا﴾

س.ع لاوێکی ئەردەنیە، هاتبوو بۆ ئەم وڵاتە بۆ گەڕان بەدوای کاردا، کاری دەست کەوت، بەڵام شتێکی تری دەست کەوت کە بە خەیاڵیدا نەدەهات، ڕێنمایی و هیدایەتی دەست کەوت.. شیرینی ئیمانی بینیەوە.. بەسەرهاتی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: من لاوێکی ئەردەنیم.. ڕۆشتم بۆ سعودیە ﴿شاری تەبوك﴾ بۆ گەڕان بەدوای کاردا.. لەو کاتەدا موسڵمانێکی ڕاستەقینە نەبووم، بەڵکو بە ویراسەت موسڵمان بووم وەك حاڵی زۆری موسڵمانان لەم سەردەمە سەختەدا.. لە سەرەتادا کارم دەکرد لە یەکێ لە چێشتخانەکان پاشان خاوەن چێشتخانەکە داوای لێکردم لە دوکانێکی تر ئیش بکەم کە دوکانی ئەو بوو بۆ فرۆشتنی کاسێتی ڤیدیۆ.. تۆ چوزانی کاسێتی ڤیدیۆ چیە... چی تێدایە لە خراپەکاری و بەرەڵایی.. – یان بە لانی کەمەوە لە زۆربەیاندا – کارم دەکرد لەو دوکانەدا.. لە بەناوبانگترین دوکانەکانی ڤیدیۆ بوو لە شاری ﴿تەبوك﴾.. نزیکەی پێنج ساڵ، لە ساڵی چوارەمدا، و لە شەوێکدا، لاوێکی ڕوخسار گەشە هات بۆلام، کە نیشانەی پابەندبوون لە ڕوخساری دەبینرا و نورانی بوو.. ﴿سەیرە.. ئەم لاوە چی دەوێ﴾ لەدڵی خۆمدا وام ووت.. ئەو لاوە دەستی درێژ کرد.. بە گەرمی تەوقەی لەگەڵدا کردم.. لە گەڵیشیدا خەندەیەکی جوانی ئاراستە کردم... دڵی کەمەند کێش دەکرد و تەنیایی دەڕەوانەوە. و بەربەستە دەروونیەکانی تێك دەشکاند کە زۆرجار دەبنە کۆسپ و ڕێ لە گەیشتنی خێر و چاکە دەگرن بۆ کەسانێ کە زۆر پێویستیان پێیەتی، پاشان ئامۆژگاریەکی کورتی کردم.. و ئاگاداری کردمەوە لە سەرەنجامی ئەو کارە کە دەبێتە هۆی تێکدانی شیرازەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا، و بڵاوبوونەوەی دەروون نزمی بۆ خاوەنەکەی و بۆ بەکارهێنەرانیشی، و بێگومان خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لێم دەپرسێتەوە، دوای ئەوە لە وتەکانی بویەوە.. کاسێتێکی پێشکەش کردم کە وتاری شێخ ﴿تمیم العدناني﴾ بوو سەبارەت بە ﴿کەراماتی موجاهیدەکان﴾.. من بە تەنها نیشتەجێ بووم.. زۆر بێتاقەت بووم لەو تەنیاییەم.. بێزار بوو بووم لە گوێگرتن لە گۆرانی و بینینی فیلمەکان.. فزوڵیەت پاڵی پێوەنام گوێ لەو کاسێتە بگرم کە باسی کەراماتی موجاهیدەکانی دەکرد.. هەر کە لە گوێگرتنی بومەوە، هەستم بە ترس و پەشیمانی

دەكرد، ڕاستێتی خۆم و بێئاگایم لە پەروەردگارم دەرك پێ كرد، و كەمتەرخەمیم بەرامبەر بە دروستكارم، بۆیە دەستم كرد بە گریان، زۆر بەكوڵ گریام، وەك چۆن منداڵێكی بچوك دەگری، بە هۆی سەختی پەشیمانیم.. مامۆستا – كە خۆی یەكێ بوو لەوانەی نەزری خۆیی كرد بوو بۆ جیهاد لەپێناوی خوا – باسی كەراماتی موجاهیدەكان و جوامێری ئەوانی دەكرد، ئەوانەی لەسەر لوتكەی شاخەكان دەوەستان و بەیداخی ﴿لا إله إلا الله﴾ یان بەرز دەكردەوە، خۆیان فرۆشتبوو بە خوای گەورە، گیانی خۆیان خستبووە لەپی دەستیان تا پێشكەشی خوای گەورەی بكەن، منیش بەراوردی ئەوانم كرد لەگەڵ كەسێكدا كە سوكی و فەساد بڵاو دەكاتەوە، و ژیانی هەر وەك ژیانی ئاژەڵان وایە و هیچ خەمێكی نیە بێجگە لە تێركردنی شەهوەتە ئاژەڵیەكەی نەبێت.. لەوەش ناخۆشتر ئەوە بوو كە ماوەی دوانزە ساڵە یەك سوجدەم بۆ خوای گەورە نەبردووە، ژیانم بە بێهودە و فەوتان بەسەر بردووە.. بەڕاستی من ئەو شەوە لەدایك بوومەوە، بووم بە دروست كراوێكی تر كە پەیوەندی بە دروست كراوەكەی پێشوەوە نەبوو، یەكەمین شتێ كە بیرم لێ كردەوە، واز هێنان بوو لەو كارە لەسەر ئەو دوكانە و گەڕان بەدوای ئیشێكی شەریف و پاكدا كە ڕەزامەندی خوای گەورەی تێدا بێت، بەڵام ئایا خۆم ڕزگار بكەم و، واز لە خەڵكی بهێنم لەتەم و مژ و سەرگەردانیدا بن، پێم باش بوو ساڵێكی تریش كار لەو دوكانەدا بكەم، بەڵام وەكو ساڵانی پێشوتر نا، من لەو ساڵەدا ئامۆژگاری هەموو ئەوانەم دەكرد كە دەهاتنە دوكانەكەوە، كە ئەو فیلمانە مەترسیدارن و حوكمی خوای گەورەم لەو بارەیەوە بۆ ڕوون دەكردنەوە، بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە لە گوناهی ڕابردووم خۆش ببێت و تەوبەكەم قبوڵ بكات.. چەند ڕۆژێكمان بەسەر برد و مانگی ڕەمەزان هات.. تۆ نازانی چ مانگێكە؟ مانگی ڕەحمەت و لێخۆش بوونە، ئەو مانگەی هەستم بە شیرینی و ڕۆحانیەتەكەی نەدەكرد تەنها ئەو ساڵە نەبێت كە خوای گەورە هیدایەتی دام.. دەستم كرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، و گوێگرتن لە كاسێتە بەسوودەكان لە وتار و وانە و موحازەرەكان.. شایانی باسە من گوێم لە دوو كاسێت گرت كە هیچ كاسێتێكی تر بە ڕادەی ئەو دوانە كاریگەریان نەبوو لەسەر من، بریتی بوون لە ﴿هەرەس هێنەری لەزەتەكان﴾ و ﴿وەسفی بەهەشت و دۆزەخ﴾ی مامۆستا ﴿المورعي﴾.. سەبارەت بە

کارکردنیش، له تەنیشت دوکانی ڤیدیۆکەدا بوو کە من کارم تێدا دەکرد، تۆمار گەیەکی تێدا بوو بۆ فرۆشتنی کاسێتی ئیسلامی، ئاواتم ئەوە بوو کاربکەم تیایدا، دوای ئەوەی ساڵی پێنجەم تێپەڕی، وازم له دوکانی ڤیدیۆکە هێنا له ترسی خەشم و نەفرەتی خوای گەورە، ماوەی دوو مانگ مامەوە بەبێ کار، هەتا خوای گەورە ئاواتەکەمی هێنایەدی و کارکردنمی ئاسان کرد له تۆمارگە ئیسلامەتیەکەدا.. ئای ئەو دوو کارە چەند جیاواز بوون.. سەبارەت بە خاوەنی دوکانەکە ئامۆژگاریمان کرد و خوای گەورەمان هێنایەوە یادی، سوپاس بۆ خوا ئەویش وەڵامدانەوەی هەبوو، لەبەر خوای گەورە وازی لەو دوکانە هێنا. حەز ئەکەم ئەوە بڵێم من له قۆناغی گواستنەوا بووم لەو پەڕی فەسادەت و خراپەکاریدا بۆ ئەوپەڕی ئیمان، خەوێکم بە پێغەمبەر (د.خ)وە بینی، کە بەڕاستی لەو ماوەیەدا زیاتر باوەڕی پتەوکردم بە خوای گەورە، و هەروەها خەوێکی تریشم بینی کە له خەومدا مامۆستا ﴿عبدالله عزام﴾م بینی کە زۆر کاریگەر بووم بە شەهیدبوونی و بەو هۆیەوە گریام، و هەروەها خەوم بە هەندێ زانا و مامۆستای تریشەوە بینی، هەموویان باوەڕ و دامەزراوی منیان زیاتر دەکرد لەسەر هەق.. له کۆتاییدا، له خوای گەورە داواکارم کە من و ئێوەش دامەزراو بکات لەسەر ئاینەکەی و هەروەها داواکارم کە ئەوەی وتم و باسمکرد ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ هەموو بێئاگایەك، بەختیار ئەو کەسەیە پەند له کەسی ترەوە وەربگرێ.. س.ع. ﴿تەبوك﴾..

# ٨-﴿تەوبەی کۆمەڵێ لاو﴾

دوای خوێندنەوەیان بۆ بەشی یەکەمی ئەم کتێبە، نامەیەکم لە سودانی خۆشەویستەوە پێگەشت، لە لاوێکی سودانی موسڵمانەوە کە خوای گەورە هیدایەتی دابوو دوای خوێندنەوەی بەشی یەکەمی ئەم کتێبە[١]... ئەو لاوە لە نامەکەیدا ئەڵێ:

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان.. ڕێنیشاندەرم بۆ ڕێگای ڕاست، سڵاوێکی ئیسلامی هەمیشە زیندوو بە ئیزنی خوای گەورە بۆ بەڕێزتان.. پێش چەند ساتێك لە خوێندنەوەی کتێبی ﴿گەڕاوەکان بۆلای خوا﴾ بوومەوە.. لەوانەیە سەرسام بیت بەم نامەیەی من.. بەڵام -خوا شایەتە لەسەر ئەم قسانەی من- کە بەو هەوڵ و ماندوبونەت ئیصلاحی منت کرد، ڕەفتاری منت چاککرد، لەبەر ئەوە کەمترین شتێ کە بتوانم گوزارش لە ئاواتەکانی خۆم بکەم، و ڕێز لە کارەکەت بگرم ئەوەیە کە ﴿تۆ ڕێ نیشاندەری من بویت بۆ ڕێگای ڕاست﴾.. دوای ئەم پێشەکیە کە شایەنی نیم، خۆی پێ ناساندم، پاشان دەستی کرد بە باسکردنی بەسەرهاتی خۆی پێش هیدایەت دان و ووتی: من لە کاتەکانی نوێژدا شلگیر بووم، هیچ گرنگیەکم پێ نەدەدا، لەگەڵ باوەڕی تەواو بەوەی کە ئەو کارەی من دەیکەم ڕاست نیە.. بێگومان لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە لێم دەپرسێتەوە، بەڵێ، هەندێ جار نوێژم دەکرد و هەندێ جاریش نەمدەکرد.. دەتوانم ئەوە بڵێم کە بە ڕاستی من لە تاریکستانێکی تەواودا دەژیام، نەمدەزانی دەروازە و ڕێگا و ڕزگار بوون لە کوێوەیە، لەوانەیە هەموو ئەوانە سەرچاوەکەی سستی ڕۆح و لادان بێت لە ڕێی هیدایەت.. و هەروەها زۆربەی کاتەکانم لەگەڵ ئەوانەدا بوو کە سەرگەردان و بێهودانە دەژیان، هیچ خەمێکیان نیە تەنها باسکردنی شەوە سوورەکان و ئاهەنگی دیسکۆ و دڵداری نەبێت. یان ئەم ئێوارەیە لەکوێ بین... و... هتد.. بە کورتی لەگەڵ کەسێ هەڵسوکەوتم نەدەکرد کە پەرە بە دینداریەکەم بدات.. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵ بوونم بە ئاواتە درۆینەکانی دەروونم و تەواوکردنی خوێندن و پلەو پایەیەکی بەرز دوای خوێندن، ئیمانم زیادی دەکرد تەنها بە بیستنی وتار یان ئامۆژگارییەك یان لە کاتی بیستنی

---

[١]- مەبەست لە کتێبی ( التائبون إلى الله)یە، بەرگی یەکەم.

قورئانی پیرۆزدا.. نەك هەر ئەوەندە، بەڵكو فرمێسكیشم دەڕشت بۆی، كاریگەر و ئاوێتە دەبووم ﴿بۆ ساتێك﴾، بەڵام زۆر بە خێرایی ئەو پاڵنەرە ویژدانیە دەمرد، و ئەو كاریگەریانە لەسەرم نەدەما، دەگەڕامەوە بۆ كەمتەرخەمیەكانم سەبارەت بە ئاین و دینداری و نوێژكردن، هەتا كتێبێكم دەست كەوت لە ﴿العائدون إلى الله – گەڕاوەكان بۆلای خوا﴾، باوكم بە دیاری پێشكەشی كردم، خوای گەورە هەزار جار پاداشتی خێری بداتەوە، زۆر بە وردی و تێڕامان خوێندمەوە، ون بوونی خۆمم تیادا بینیەوە.. پەیمانم دا بەخوای گەورە كە ڕێگای ڕاست بگرم، ئەوەش بە هۆی ئەو پەند و وانانەی كە بەڕێزتان كۆتان كردبووەوە بۆ هیدایەت دانی كەسانی وەكو من، كە بەڕاستی ئیمانێكی سادەیان هەیە بە ئیسلام، بە بێ ڕۆچوون و جێبەجێكردنی ئەحكام و شەعائیرەكانی... ئەوەتا من ئەمڕۆ، دوای ئەوەی دەمنالاند بەدەست بۆشایی ڕۆحی و كەمتەرخەمی دینداری، دەگەڕێمەوە بۆ باوەشی ئیسلام و ئیمانی بەهێز بەویستی خوای گەورە

برات: حامد مهدی..

## ٩-﴿لەزانكۆی ﴿أم درمان﴾ی ئەهلی، سودان..﴾

وە هەروەها نامەیەكی ترم پێگەشت هەر لە سودانەوە، كە یەكێ لە گەنجەكان نوسیبووی، تیایدا دەڵێ: هەواڵت پێدەدەم كە من چەندین ساڵە یەكێ بووم لە شوێن كەوتوانی شەیتان، بەڵام خوای گەورە هیدایەتی دام و گەڕاندمیەوە بۆسەر ڕێگای ڕاست، یەكێ لە خێرخوازان ئەم كتێبەی پێشكەش كردم ﴿العائدون إلى الله﴾ تیایدا دەروازەی تەوبەم بینیەوە، لە تاریكاییەكانی سەرپێچی كردن هاتمە دەرەوە بەرە و ڕووناكی خواپەرستی.. لە خراپەكاری بەرە و چاكەكاری.. لە خوای گەورە داواكارم كە ناوت تۆمار بكات لە ڕیزی ڕاستگۆیان و شەهیدان و صاڵحاندا، و لە بەهەشتی نەبڕاوەدا بەیەك بگەین..

برای دڵسۆز: نصرالدین عبدالرحمان

سودان – خەڕتوم..

## ١٠-﴿وه له میسریشهوه ئهم نامهیهم پێگهش﴾

له ﴿احمد عزت﴾ی لاوهوه.. له نامهكهیدا دهڵێ: ﴿من لهبهر ئهوهی بێئاگابووم له خۆم، تا خوای گهوره ڕێنمایی كردم بۆ خوێندنهوهی بهشی یهكهمی كتێبهكهتان ﴿العائدون إلى الله﴾، به هۆیهوه خوای گهوره هیدایهتی دام بۆ ڕێگای ڕاست﴾

له ئهسكهندهریهشهوه ئهم نامهیهم پێگهشت له ﴿احمد محمد﴾ی لاوهوه، له نامهكهیدا دهڵێ: ﴿دوای ئهوهی پهیامهكهتانم خوێندهوه ﴿العائدون إلى الله﴾ وه ڕادهی كاریگهریم پێی، و خوێندنهوهی به ههموو ههست و نهستێكمهوه، كه چیرۆكهكانی له دڵی ئهوانهوه هاتوهتهدهر كه دهیگێڕنهوه، كه ڕاستگۆیانهیه، وای لێكردم كاریگهر ببم پێی، و ماوهیهكی زۆر ههڵوێسته بكهم لهگهڵ خۆمدا تا كاروانم بهرهو لای خوای گهوره نوێ بكهمهوه، وه به ئیزنی خوای گهوره ئیصلاحی خۆم بكهم﴾..

ئهمه چهند نامهیهك بوو كه پێم گهشتبوو، وه ئهگهر خوای گهوره دڵخۆش ببێت به تهوبه و گهڕانهوهی بهندهكهی و بهنده تهوبهكارهكانی خۆش بوێن، ههروهها ئێمهش خۆشمان دهوێن به هۆی خۆشهویستی خوا بۆیان، و زۆر دڵخۆش دهبین به تهوبهكردنیان و دهڵێین ﴿اللهم اجْعَلْنَا مِنَ التَّوابِين، واجْعَلْنا مِنَ الْمُتَطَهِّرِين﴾ واته:﴿پهروهردگارا بمانگێڕه به تهوبهكاران و بمانگێڕه به پاكژان﴾..

# ١١-﴿فریشته ئافرەتێك لەهەتك كردن ڕزگار دەكات﴾

(سبحان الله) چیرۆكەكە ڕاستەقینەیە، بەسەرهاتەكە لەشاری ﴿ریاض﴾ رویداوە، و لەبەر ئەوەی خاوەنی بەسەرهاتەكە، سوێند دەخوات لەسەر ئەوەی كە هەر كەس بیبیسێ بۆ سودوەرگرتن بلاوی بكاتەوە، دەڵێ: من ئافرەتێكی سەرەڕۆ بووم بەیناو بەین قژم بۆیاخ دەكرد بە بۆیەی ڕەنگاو ڕەنگ لەسەر مۆدێل و عاباكەم دەدا بەسەر شانمدا تەنها دەمەویست سەرنجی لاوان ڕابكێشم، بۆ تەفرەدانیان بە بۆنەوە و بە ڕازاوەیی و میكیاجەوە دەڕۆشتم بۆ بازاڕ، شەیتانیش تاوانەكانی بۆ دەڕازاندمەوە بە تاوانی گەورە و بچوكەوە.. لەسەروو هەموو ئەوانەشەوە یەك سوجدەم بۆ خوای گەورە نەدەبرد.. بەڵكو نەمدەزانی نوێژ چۆنە.. سەیر لەوەدا بوو من خۆم پەروەرشیاری نەوەكان و مامۆستایان بووم، و بەچاوی ڕێزەوە تەماشا دەكرام، لە یەكێ لە قوتابخانە دوورەكان لە شاری ﴿ریاض﴾ەوە وانەم دەوتەوە، لە گەڵ نوێژی بەیانی لە ماڵ دەچومە دەرەوە و دوای عەسر دەگەڕامەوە، بەهەرحاڵ ئێمە كۆمەڵێ مامۆستای ئافرەت بووین، من بە تەنها لەناویاندا شووم نەكردبوو،هەیان بوو تازە شوی كردبوو، وە هەیان بوو سكی هەبوو، هەشیان بوو مۆڵەتی دایكایەتی وەرگرتبوو، وە هەروەها من تاكە ئافرەت بووم تیایاندا كە شەرمی نەبێت قسەم لەگەڵ شۆفێرەكەدا دەكرد و سوعبەتم لەگەڵیدا دەكرد وەك ئەوەی یەكێك بێت لە خزمەكانم، ڕۆژگار تێدەپەڕی و منیش هەر لەسەر سەرەڕۆیی و تاریكایی خۆمدا بووم.. بەیانیەكیان، درەنگ خەبەرم بوویەوە، بە خێرایی چوومە دەرەوە و سواری ئۆتۆمبێل بووم، كاتێ لام كردەوە بۆ دوامەوە كەسم نەبینی لەسەر كورسیەكانی دواوە دانیشتبن، لە شۆفێرەكەم پرسی، ئەویش ووتی: فلان نەخۆشە و فلان منداڵی بووە و... و... و منیش لە دڵی خۆمدا ووتم مادام ڕێگاكە درێژە دەخەوم هەتا دەگەینە شوێنی مەبەست، خەوتم و خەبەرم نەبوویەوە مەگەر بە هۆی خوار و خێچی ڕێگاكەوە، بە ترسەوە هەستام، و پەردەكەم لادا، ئەم ڕێگایە كوێیە؟ و ئەوە چی ڕوویداوە؟؟؟؟؟ كاكی سایەق بۆ كوێم ئەبەی!!؟؟ زۆر بە ناشرینانە وتی: ئێستا ئەزانیت، یەكسەر هەستم بە نیازی گڵاوی كرد... بە ترسێكی زۆرەوە پێم ووت: فلان كەس ئەوە لەخوا ناترسیت!!!!!! ئایا دەزانی سزای ئەو كارەی تۆ چیە، قسەی زۆرم كرد هەتا پەشیمانی بكەمەوە لەو كارەی كە دەیەوێ

بیکات، ئەم زانی تازە تیاچووم...... و زەحمەتە ڕزگار بوونم، بە متمانەیەکی شەیتانانەی نەفرەت لێکراوەوە ووتی: ئەی تۆ بۆ لەخوا ناترسیت، بە نازەوە پێدەکەنیت و سوعبەت دەکەیت لەگەڵمدا؟؟ نازانیت کە منت سەرگەردان کردووە و سەرنجی منت ڕاکێشاوە، بە راستی وازت لێ ناهێنم تا ئەوەی دەمەوێ دەبێ بیکەم، گریام... هاوارم کرد؟؟ بەڵام شوێنەکە دوور بوو، کەسی تیا نەبوو بێجگە لە من و ئەو شەیتانە سەرسەختە، شوێنێکی بیابان... ترسناك.. بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە تکام لێ کرد و بە بێزاری و تەسلیم بوونەوە پێم ووت: کەواتە وازم لێ بێنە دوو ڕکات نوێژ بۆ خوای گەورە بکەم، بەڵکو خوای گەورە ڕەحمم پێ بکات!!!!! دوای ئەوەی لێی پاڕامەوە ڕازی بوو، لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیم وەك ئەوەی بەرەو گۆڕەپانی لەسێدارەدان بمبەن.. بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا نوێژم کرد، بە ترسەوە کردم.. لە خوای گەورە پاڕامەوە کە ڕەحمم پێ بکات و لێم خۆش ببێت دەنگی گریانم بێدەنگی ئەوشوێنەی هەژاندبوو، لەو ساتەدا و مردن نزیك دەبێتەوە و منیش نوێژەکەم تەواو دەکەم... بە رای ئێوە چی ڕوویدا؟؟؟؟؟ موفاجەئات ڕوویدا، ئەوە چییە دەیبینم، ئۆتۆمبیلی براکەمم بینی هات!! بەڵێ براکەم بوو، بە مەبەستی ئەو شوێنە هاتبوو!! نەمدەزانی چۆن ئەو شوێنەی دۆزیەوە، بەڵام زۆر دڵخۆش بووم، منیش هەڵدەپەڕیم و بانگم دەکرد، شۆفێرەکەش تووڕە دەبوو لێم، بەڵام گوێم پێ نەدەدا، تەماشام کرد ئەم برایەم کە لە ﴿الشرقیە﴾ نیشتەجێیە لە گەڵ براکەی ترمدا کە لەگەڵ خۆماندا نیشتەجێیە، یەکێکیان دابەزی و کوتەکێکی کێشا بە شۆفێرەکەدا و وتی لەگەڵ ئەحمەد سواری ئۆتۆمبێلەکە ببە، منیش ئەم شۆفێرە ئەبەم و ئەیخەمە ئۆتۆمبێلەکەیەوە لە قەراغ ڕێگاکەدا... منیش لەگەڵ ئەحمەددا سوار بووم، سەرسامی و ئەبڵەقی دای گرتبووم، بە هاوارەوە لێم پرسی: چۆن شوێنی منتان زانی؟ ئەی چۆن تۆ لە ﴿الشرقیە﴾ەوە هاتیت؟ و کەی هاتیت؟ ووتی: لەماڵەوە هەموو شتێ ئەزانیت، (محمد)یش سواربوو لە گەڵماندا و گەڕاینەوە بۆ شاری ﴿ریاض﴾. منیش بڕوام نەدەکرد چی ڕوودەدا، کاتێ گەشتینەوە ماڵەوە، و لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزیم، هەردوو براکەم پێیان ووتم: بڕۆ بۆ لای دایکمان و هەواڵەکەی پێ بدە، ئێمەش پاش کەمێك دەگەڕێینەوە.. بە خێرایی دابەزیم و بە دڵخۆشیەوە بەرەو لای دایکم ڕۆشتم، تا هەواڵی پێ بدەم، ڕۆشتم بۆ لای لە

مەتبەخ و بە گریانەوە باوەشم پیاداکرد و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش بە سەرسامیەوە پێی وتم: بەڵام ئەحمەد بە راستی هەر لە ﴿الشرقیە﴾یە، محمدی براشت هێشتا هەڵنەساوە لەخەو، پۆشتین بۆ ژوورەکەی محمد، بینیمان ڕاستە خەوتووە. وەکو شێت خەبەرم کردەوە و لێم پرسی: چی ڕوویداوە.. سوێندی خوارد بە خوای گەورە کە لە ژوورەکەی نەهاتووەتە دەرەوە و ئاگای لە بەسەرهاتەکە نییە؟! چوم بۆ لای تەلەفۆنەکە و هەڵم گرت ﴿لە کاتێکدا خەریك بوو شێت نەبووم﴾ لە براکەی ترم پرسی ووتی: بەڵام من ئێستا لەسەر کارەکەمم.. دوای ئەوە دەستم کرد بە گریان و زانیم هەموو ئەوانەی کە ڕوویاندا بە راستی دوو فریشتە بوون خوای گەورە ناردوونی تا ڕزگارم بکەن لە دەستی چەپەڵی ئەو تاوانبارە نەگریسە.. منیش سوپاسی خوای گەورەم کرد لەسەر ئەوە، و ئەوە بووە هۆی هیدایەت دانم. کە فەزڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە.

# ١٢-﴿چیرۆكێكی زۆر كاریگەر﴾

ڕووداوەكانی چیرۆكەكەم زۆر ئازاراویە... بە وردی پێش دوو سەعات و نیو ڕویداوە... بەڵگەكەش ئەوەیە ئەو بۆنەی بە مردوەكەوەیە لە میسك ، هێشتا بە لەشم و پۆشاكەكەمەوەیە... داوای لێبوردنتان لێدەكەم... دێڕەكانی تر ئازاراوین..

بەڵام دەخوازم.. كە بەسەرهاتەكە... ببێت بە پەند... چیرۆكەكە ئاڵۆزە و بەسەرهاتەكانی تازەیە... تا ئەو ڕادەیەی هێشتا خۆڵی گۆڕەكە بە پێیەكانمەوە ماوە، و بۆنی مردوو هێشتا بە پۆشاكەكەمەوەیە.. و وێنەكەی لە بەرچاومە.. ئێوەش بڵێن ﴿لا إله إلا الله﴾

سەفەرم كرد بۆ شارەكەی پێغەمبەر (د.خ) دوا بینینم بۆی –ڕەحمەتی خوای لێبێت– پێش دوومانگ بوو وەك خویەكی ئاسایم خوا حافیزیم لێ كرد، خوا حافیزی گەڕانەوە.. دیارە خوا حافیزی گەڕانەوە و خوا حافیزی یەكجاری جیاوازیان هەیە... و بۆ ساتێكیش گومانم نەدەبرد كە ئەم جارە كە خوا حافیزی لێ دەكەم نایبینمەوە لە ژووری مردوو شۆردا نەبێت!! ئەبو ئەحمەد–ڕەحمەتی خوای لێبێت– پیاوێكی خێرخوا بوو بۆ دەوروبەری.. خۆشەویست بوو، هەمیشە دەم بەخەندە و قسە خۆش بوو.. كەمێك بەتەمەن بوو، چل و پێنج ساڵ دەبوو.. بە پێی قسەی هەندێ لە برایان.. خەڵكی میسر بوو... لە سعودیە كاری دەكرد لە یەكێ لە دامەزراوە خەیریەكاندا بە موچەیەكی سادە... خێزاندار بوو.... منداڵە گەورەكەی لە زانكۆ بوو، منداڵی بچوكیشی هەبوو... كوڕ و كچ.. چەندە خۆشمان دەویست! حەزمان لە سوعبەتەكانی بوو.. هەرچەندە كێشەی زۆر بوو، بەڵام وەك كێو وابوو.. كە هاوڕێكانی بەرگەیان نەدەگرت.. حاڵەتی ماددی باش نەبوو، لەگەڵ ئەوانەشدا، یەكێ لە هاوڕێكانی سەركاری.. ویستی ژن بێنێ.. بڕێ پارەی دایە كە كەسی نمونەی ئەو نەیدەتوانی ئەو بڕە پارە ببەخشێ... دواهەمین وتو وێژی نێوان من و ئەو ئەوە بوو كە ڕازی كردم ژن بهێنم.. لە وتوو وێژدا كاریگەر بوو، توڕە نەدەبوو.. قسەكانی پرشنگدار بوون.. پێكەوە یاداشتی خۆشمان هەبوو.. لە ناو پێكەنین فرمێسك بە چاویدا هاتە خوار.... ڕەحمەتی خوای لێبێت لەوانەیە ئێستە كەمێك هەستتان كردبێت؟؟ ﴿ئەبو ئەحمەد﴾ چ مانایە دەبەخشێ؟؟ لەشاری مەدینەوە گەڕامەوە بۆ لای كەسوكارم.. سڵاوم لە هەموو خۆشەویستان كرد لە دامەزراوەی خێرخوازی.. وە ﴿ئەبو ئەحمەد﴾یشم بەسەر

کردەوە، چونکە خۆشم دەویست، ڕەحمەتی خوای لێبێت دەیوت: توخوا برام ئەگەر هاتیت بەخەندە و قسە خۆشەکانت بەسەرمان بکەرەوە..و کەشو هەوای ڕۆرتینیمان کەمێك بگۆڕە!! ئاە.. ڕەحمەتی خوات لێبێت!! ئاە ڕەحمەتی خوات لێبێ... ئەمە قسەی پێش گەڕانەوە بوو.. هەینی پێشوو نامەیەکم پێگەشت.. ئەمە دەقەکەی بوو، وەکو خۆی بۆتان دەگێڕمەوە، لەگەڵمدا بن: براتان ﴿ئەبو ئەحمەد﴾ هاوڕێمان لە دامەزراوەکە داوای سەماحتان لێ دەکات، ئەمڕۆ دوای مەغریب وەفاتی کرد، پاشان کاتی نوێژکردن لەسەری دیاری دەکرێت ﴿إنا لله وإنا إليه راجعون﴾، نێرەر ﴿ئەبو مەعاز﴾ ﴿بەڕێوەبەری ئەو دامەزراوەیەی کە خوالێخۆش بوو کاری تێدا دەکرد﴾.. لەگەڵمدا وێنای بکەن... لە ساتانێکدا تۆ چاوەڕوانی کەسێکیت کە زۆر بە تاسەوەیت بۆ بینینی.. کەچی هەواڵی وەفاتکردنیت بۆ دێ!! ماوەیەکی زۆر مامەوە و بڕوام نەدەکرد... لە سەر سوڕماندا.. نازانم... خەوتم لە نێوان بڕواکردن و بڕوانەکردندا.. ڕۆژی شەممە هات... ڕۆشتم بۆ ئەو دامەزراوەیەی خوا لێخۆشبوو کاری تێدا دەکرد... برایانم لەوێ بینی کە غەم و پەژارەیی باڵی کێشابوو بەسەریاندا... بەبێ مەبەست ڕۆشتم بەلای یەکێ لە نوسینگەکاندا تا نوسینگەی ﴿ئەبو ئەحمەد﴾م بینی کە کەسی تێدا نەبوو! ئەو ڕۆژە نەهاتبوو بۆ دەوام... بەڵێ دەوامی ئەمڕۆی ئەو لای پەروەردگارە... (لا إله إلا الله...) بەڵێ بەخێرایی گەشتینە ئەو شوێنە... بڕوام نەدەکرد کە بەدیدارت دەگەم ئەی ﴿ئەبو ئەحمەد﴾ و لە سەفەرم گەڕاومەتەوە و ئێستاش لە شوێنی مرد و شۆردام!! سەرخۆشیم لە براکانی کرد... پاشان وتم: کوا ئەبو ئەحمەد؟ وتیان: دەرگاکە ڕاکێشە و بڕۆ ژوورەوە!! تەماشای دەرگای شوێنی مردوو شۆردنەکەم کرد... بۆ یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا بڕۆمە ژووری مردوو شۆردنەوە... لەگەڵ بینینی مردوویەك کە لەبەردەممدا دەیانشۆرد، شوێنەکە کەمێك ترسناك بوو..؟؟ مەزنتریش لەو ترسناکیە، غەمناك بوو... لە نێوان سەرسامی و ترسدا ڕۆشتمە ژوورەوە کەسێ کە خوا حافیزی لە ئازیزێکی بکات... پەردەیە لە بەردەممدا بوو لە بنمیچەکەوە بۆ سەر زەوی لە سێ لاوە کە من و مردووەکەی جیادەکردەوە.. ئایەتەکانی قورئانیش کەشە ئیمانیەکەی بەرز دەکردەوە لە وێنای حەقیقەتی مرۆڤ.. و مرۆڤ تەماشای ئەو قۆناغە بکات کە بە دڵنیاییەوە پێی دەگات.. و نێوان ئەو و نێوان ئەم شوێنە تەنها مەسەلەی کاتە و بەم نزیکانەش تەواو دەبێت... لەپشت پەردەکەوە ڕۆشتم... دوو کەسم بینی کە لەسەر ﴿ئەبو ئەحمەد﴾ کۆبونەوە، خستبوویان بەلای

ڕاستدا... ئاویان پیادا دەکرد... ئای ئای ﴿ئەبو ئەحمەد﴾.. خوێنەری ئازیز ئایا دەزانیت کاتێ خۆشەویستێکی خۆت دەبینیت مانای چیە.. کاتێ کە مردووە و لەناو سەلاجەی مردواندا ئەندامەکانی لەشی بەستویەتی.. بینینەکانی وشك بوون... سیمای ڕوخساری... ڕیشی بەهۆی سەهۆڵی ناو سەلاجەکەوە بەرز بووبوویەوە.. ڕوخساری دەم بەخەندە بوو!! چاوەکانی نوقابوون... چەندە حەزم دەکرد کە بیبینم؟ تا خەندەیەکم ئاراستە بکات، خۆزگە تەماشایەك یان وتەیەکی ئاراستە دەکردم.. بەڵام هەی هوو... بیرم لە ئایندەی خۆم دەکردەوە... چۆن ئەم هاوڕێم لەدەستدا... بەڵێ شۆردیان.. لە تەنیشتمەوە ﴿ئەحمەد﴾ی کوڕی کە خوێندکاری زانکۆ بوو، وەستا بوو، تەماشای باوکی دەکرد.. لە نێوان بڕواکردن و بڕوانەکردندا... نەدەگریا... یەك فرمێسك بەچاویدا نەدەهاتە خوار.. ئەزانی بۆچی؟؟ بەهۆی سەختی ئەو کارەساتەوە.. نەیدەزانی چی بکات؟؟ خەڵکی دەبینێ باوکی ئەم دیو دیو دەکەن و دەیشۆن، ئەمیش تەنها تەماشای باوکی دەکات... حاڵەتی زۆر غەمناك و خەفەتبار بوو، بۆیە باوەشم پیادا کرد و سەرەخۆشیم لێکرد.. وتی: خوای گەورە پاداشتت بداتەوە.. گەڕایەوە بۆ بێدەنگیەکەی.. ئاه.. دەنگی قورئان بەرز بوویەوە.. بە دەنگی قورئان خوێن: ﴿المحیسنی﴾بە دەنگێکی خاشیعەوە.. زیاتر کاریگەری دروست دەکرد.. خوای گەورە کۆمەکمان بێت.. بە بەرچاومەوە کفنی هاوڕێ خۆشەویستەکەمیان کرد.. لەگەڵ چەند کەسێکدا هەڵمانگرت.. بەرەو مزگەوت تا دوای نوێژی نیوەڕۆ نوێژی لەسەر بکەین... بەهەرحاڵ.. لە ڕاستیا... هەڵوێستێکی تری کاریگەر ئەوە بوو کە.. دوای ئەوەی نوێژی سوننەتی نیوەڕۆم کرد و نوێژەکەم تەواو کرد... تەماشای لای ڕاستی خۆمم کرد لەو ڕیزەی کە لەپێشمەوە بوو کێم بینی؟ عبدالله... عبدالله کێیە؟؟ ئەوەی کە قوتابی پۆلی چواری سەرەتایی بوو.. وە غەمناکتر لەوە.. کوڕی بچوکی خوا لێخۆش بووبوو... کە باوکی بەردەوام نازی زۆری پێدابوو.. وەك ئەوەی وا گومان بەرێت کە لەخەودایە و خەو دەبینێ.. بە لای ڕاست و چەپدا تەماشای نوێژ کەرانی دەکرد، هەندێ جاریش تەماشای جەنازەکەی باوکی دەکرد... زۆر دڵتەنگی کردم.. خەریك بوو ئەگریام، نوێژمان کرد و لەگەڵ باوکیدا ڕۆیشتین... هەڵمان گرت بەرەو گۆڕستان.. بۆ شەهادەت و ڕاسپاردەی ئەمانەت.. جەنازەکەی زۆر بە خێرایی دەچوو... ئەم ئەزانی بۆچی؟؟ خۆشەویستەکەمان هەڵگرت... کوڕە گەورەکەی نەیدەتوانی هەڵی بگرێت. ئەو خۆی پێویستی بە کەسێك بوو هەڵی بگرێت.. وێنای

بکەن کوڕەکەی-کە خوێندکاری زانکۆ بوو- قسەی نەدەکرد.. تەنها تەماشای جەنازەکەی دەکرد... کوڕە بچوکەکەشی کەس نەبوو نازی پێ بدات.. بە تەنها و تەنها دەگریا... کەس نەبوو لە ئامێزی بگرێت.. وێنای بکەن لەگەڵ خەڵکەکەدا دەڕۆشت دەیەویست جەنازەکەی باوکی هەڵگرێت.. بەڵام بچوك بوو جەنازەکەش قورس و بەرز بوو... دەڕۆشت بەڕێوە و نەیدەزانی چۆن خۆی بگەیەنێتە جەستەی باوکی و خۆی بنوسێنێ پێیەوە.. ئایا لەگەڵمدا هەست بە تاڵی و سەختی دابڕان و بێبەش بوون دەکەن؟؟ هەندێ جار یەکێك پاڵی پێوەدەنا و.. یەکێکی تر لێی توڕە دەبوو.. نەیاندەزانی ئەوە کوڕی خوالێخۆش بووە... وەك سەرگەردان وابوو!! مەوقیفەکە بە شێوازێك بوو گەورەش بەرگەی نەدەگرت چ جای منداڵێکی ئاوا... لا إله إلا الله.. سەرقاڵ بووم بە بینینی ئەو منداڵە و برا گەورەکەی تا گەشتینە گۆڕستان.. جەنازەکەمان دانا و خەڵکەکە چونە ژوورەوە... کوڕەکەش بێدەنگ بوو.. چاوەکانیشی سەرسام بوون لەبەردەم گۆڕەکەدا... برا بچوکەکەشی دەستی براکەی گرت بوو هەر دەگریا:! لا إله إلا الله... ئەسپەردەمان کرد و دوعای خێرمان بۆ کرد.. کوڕەکەی لەناوماندا بەناو خەڵکەکەدا ڕۆشت ئەی ئەزانی چی دەکات ئایا ئەو لەسەر زەویە؟؟ تەماشاکردنەکانی تەماشایەکی کارەسات باربوو.. هەڵسوکەوتی نا سروشتی بوو... لە سەختی دیمەنەکە... منداڵە بچوکەکەشیان وەکو غەریب بەناو خەڵکەکەدا ڕەت بوو... خوا حافیزی لە باوکی کرد.. لە ساتەکانی ڕابردوودا تامی بێ بەش بوونی چەشت کە بەس بوو بۆی... کە لە داهاتوشدا بێ بەشی و سەختی ژیان چاوەڕێی دەکات.. لا إله إلا الله.. بەهەرحاڵ... خوا حافیزی و سەرەخۆشیمان لە هەموان کرد.. گەڕاینەوە بۆ ژیانی خۆمان و خۆشەویستەکەشمان لەژێر خاکدا بەجێ هێشت... خوای گەورە ڕەحمەت پێ بکات ئەی ﴿ئەبو ئەحمد﴾.. وە کاتێکیش من دێمە شوێنی تۆ خوای گەورە ڕەحمم پێ بکات و من و تۆش دامەزراو بکات.. و هەموو ئەوانەش کە ئەم پەیامە دەخوێننەوە لە موسڵمانان.

خوا حافیز ئەبو ئەحمەد..

# ١٢- ﴿(سابیر)ی برام﴾

ئازیزان، ئەمە بەسەرهاتێکە لە واقیعی ژیانی خۆم، نەك لە ئەندێشە و خەیاڵ، چیرۆکی سابیری برام، گەنجێك بوو لەسەرەتای تەمەنیدا، ڕوخسار و بەژن جوان، لە مزگەوتدا ناسیم، دەم بە خەندە بوو، هەرگیز بەبێ خەندە و ڕووگەشیی نەتدەبینی، یەکەم کەس بوو کە دەچووە مزگەوتەوە، و دواهەمین کەسیش دەهاتە دەرەوە، لە هەر جێگایەك بوایە هەوڵی گوێڕایەڵی خوای گەورەی دەدا، عاشقی نوێژی بەیانی و ڕۆژووگرتن بوو.. بەدوای هاودەمێکدا دەگەڕا دامەزراوی بکات لەسەر خواپەرستی.. بە شەرمەوە سوعبەتی لەگەڵدا دەکردین، ڕۆژێکیان بینیم و ووتی: من سبەینێ دوو شەممە ﴿إنشاء الله﴾ بەڕۆژوو دەبم، و ڕۆژی هەینیش دەڕۆم بۆ زیارەتی گۆڕستان.. بەڵێ نوێژی بەیانی لەگەڵماندا کرد، و زیکرەکانی خوێند، بە ڕۆژوو بوو، زۆر دڵخۆش و کامەران بوو، دوای نوێژی عەسر پێی ووتم: دەڕۆم یاری تۆپی پێ دەکەم هەتا بانگی مەغریب.. ڕۆشت بۆ شوێنی یاری کردنەکە، لە کاتی یاریەکەدا سابیر بەسەردا کەوت، ویستمان قسەی لەگەڵدا بکەین، نەمانتوانی، و وەڵامی نەدەدایەوە.. هاوارمان دەکرد و دەمانوت: سابیر.. سابیر.. ئەویش وەڵامی نەدەدایەوە. بە خێرایی بردمان بۆ نەخۆشخانە.. دکتۆر تەماشای کرد و ووتی: دوعای خێری بۆ بکەن... ئاگای لە خۆی نەماوە.. (سبحان الله) ئەوە چی ڕوویداوە.. تەنها توانای دوعاکردنمان هەبوو بۆی، و لەکاتی لەهۆش چونەکەیدا سابیر قورئانی پیرۆزی دەخوێند.. پاشان ڕۆژی هەینی وەفاتی کرد.. ئەو ڕۆژەی کە بەتەمابوو زیارەتی گۆڕستان بکات، بەڵام ئەم جارەیان هەر سەردان نەبوو، بەڵکو بوو بە نیشتەجێیەکی ئەوێ.. ڕۆژی هەینی دامان هێڵایە ناو گۆڕەکەی... پێش ئەوەی چاوەکان بۆی بگرین دڵەکان دەستیان کرد بە گریان بۆی.. گەڕانیەوە بۆ ماڵەکانمان، بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆشتین بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، بەڵام ئەمان بینی لەگەڵ خۆماندا، هەموان لە نوێژەکەدا گریاین بۆی، دوای چەند ڕۆژێك منداڵێك هات بۆ مزگەوت، ئێمەش بانگمان کرد و وتمان: تۆ کێیت؟ ووتی: من برای سابیرم، ئەو ڕۆشت و خوای گەورە جێگاکەی پڕکردەوە.. هەموان دەستمان کرد بە گریان بۆی..یادی خەندە و ئەدەبەکەیمان دەکردەوە لەگەڵماندا، بەخوا ئەمە چیرۆکێکی ڕاستەقینە بوو،لەوانەیە عاقیبەت خێری بێت بۆ سابیری برام..

## ١٤- ﴿نوێژی مەغریبم لەگەڵدا کرد﴾

ڕۆژی چوارشەممە بوو، سەفەرم دەکرد بۆ گوندە بچوکەکەمان لە شوێنی کارکردنمەوە دوور بوو... هەر کە گەشتمە ئەوێ قەرەباڵغیەکی زۆرم بینی، خەڵکی دەهاتن و دەڕۆیشتن.. بۆ ماڵی یەکێ لە دراوسێکانی ناو گوندەکە.. هەر کە گەیشتم هەواڵی وەفاتیم پێ گەیشت.. خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات.. هەستان بە ڕێ و ڕەسمی تەعزیە... نوێژی جومعە هات، وتار خوێن وتانێکی پێشکەش کرد کە فرمێسکی دەباراند لەچاوانی خواپەرستان سەبارەت بە حەقیقەتی دنیا و بێ کەڵکیەکەی و سەبارەت بەو شتانەی فەرامۆشمان دەکەن لەیادی خوای گەورە..پاشان وتی: برا بەڕێزەکان، ئەم برایە شەوی سێشەممە وەفاتی کرد، و یەکێ بوو لە نوێژ کەرانی ئەم مزگەوتە، کە شایەتی دەدەین لە لای خوا یەکێ بوو لە پارێزەرانی نوێژی جەماعەت و ئەوانەی کە زوو ئامادە دەبوون بۆ نوێژ.. و پیاو چاك بوو ﴿خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات﴾ ئەو برایەتان ﴿فلانی کوڕی فلان﴾ کوڕەکانی داوایان لە من کردووە، کە بە ئێوەی ڕابگەیەنم کێ قەرزی بەلایەوەیەتی یان شتێك لەکار و باری دنیا، ئەوە ئەوان ئامادەن کە بیدەنەوە، ئەو کەسە تەنها ئەوەی لەسەرە بڕوات و پێیان بڵێ.. گریان و لالانەوە بەرز بوویەوە... گریانەکە زیادی کرد کاتێك ئیمام دەستی کرد بە خوێندنی ئایەتی ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ(١٥٣)﴾البقرة.. واتە:﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پشت ببەستن بە ئارام گرتن و بە نوێژ، بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ ئارامگراندایە﴾. نوێژ تەواو بوو... بەڵام دەروونەکان وازیان لە خۆشەویستی دنیا و درێژی ئومێد نەدەهێنا، شەوی هەینی جانتاکەم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ شوێنی کارەکەم.. نوێژی مەغریبم لە مزگەوتی گەڕەکەکەماندا کرد.. یەکێ لە ئەندامانی مزگەوتەکەش نوێژی کرد لەگەڵمان، نوێژی دەکرد پشتی دەلکاند بە دیواری مزگەوتەوە، نوێژی سوننەتی کرد و چاویلکەکەی لەسەر چاوی دانا و قورئانێکی هەڵگرت و دەستی کرد بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.. خەڵکێکی زۆر شایەتی ئەوەیان بۆ دەدا.. یەکێ بوو لەوانەی کە هەمیشە دەم بەخەندە و قسە خۆش بوو، وە یەکێ بوو لەوانەی کە زۆرترین خزمەتی مزگەوتی دەکرد و موتابەعەی کار و باری مزگەوتی دەکرد.. دوای مەغریبی جومعە ڕۆشتین بۆ لای بەقاڵی تەنیشت

مزگەوتەکە، هەندێ کەلوپەلم لە بەقاڵەکە کڕی، ئەویشم بینی موحاسەبەی دوکاندارەکەی دەکرد لەسەر قەرزێك کە دوکاندارەکە قەرزی بەلای ئەمەوە بوو.. پاشان پارەکەی پێدا و ڕۆیشت.. بەڵام کارەسات لەوەدا بوو نازیزانم کە ئەو پیاوەی کە من و ئەو پێکەوە نوێژی مەغریبمان کرد، من هەر ئەو شەوە نوێژم لەسەر کرد لە گەڵ خەڵکی مزگەوتەکەدا، خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات و بە بەهەشتی بەرین شادی بکات.

## ١٥- ﴿ئەسانسێر﴾

ئەمە بەسەرهاتی لاوێکە، کە لەخێزانێکی دەوڵەمەندا گەورە بووە.. هیچ داوایەکی ڕەت نەدەکرایەوە.. هونەری باشی هەبوو لەسەرپێچی کردنی خوای گەورە بەبێ ترس.. دڵخۆش بوو بە کردەوەکانی، لەناو هاوڕێکانیدا شانازی پێوە دەکرد.. شەوی وەك ڕۆژ وابوو، ڕۆژیشی وەك شەو.. لە دنیادا هیچی نەدەزانی تەنها ئەو کردەوانە نەبێت کە پەروەردگاری توڕەدەکات.. لە تەنیشتیشیانەوە لاوێك نیشتەجێ بوو کە هیچی نەدەزانی بێجگە لە خواپەرستی و قورئان خوێندن و بانگەوازی خەڵکی بۆ ڕێگای ڕاست.. لاوە خواناسەکە ئاشنابوو بە لاوە سەرپێچیکارەکە، لە دڵی خۆیدا ووتی: بۆچی من نەبمە هۆکار بۆ هیدایەتدانی؟.. لاوە سەرپێیکارەکەش لەدڵی خۆیدا دەیوت: بۆچی من بانگی نەکەم بۆسەر ئەم ڕەفتارەی خۆم؟ دوو هاوڕێکە خواپەرستەکەیان بەردەوام باسی خواپەرستی بۆ ئەو دەکرد و ئەوی تریشیان هەر باسی نوێترین فیلمی بۆ ئەم دەکرد.. ڕۆژێکیان ئەم دوو هاوڕێیە بڕیاریاندا سەیران و گەشتێك بکەن.. چاوەڕوانی ئەسانسێریان دەکرد.. بەڵام دواکەوت لە دابەزین... گەنجە خواناسەکە ڕۆشت تەماشا بکات و دەرگاکەی کردەوە تا تەماشا بکات... لە پڕ ئەسانسێرەکە دابەزیە سەر ملی.. دەم و دەست کوڕەکە وەفاتی کرد... لاوە سەرپێچی کارەکەش بەخێرایی ڕایکرد تەماشادەکات هاوڕێکەی ملی شکاوە، لە ئامێزی خۆی گرت و وەك چۆن باوك یان دایك بۆ کوڕیان دەگرین، ئاوا دەگریا.. براگیان، خۆشەویستم وەڵام بەرەوە... گەڕایەوە بۆماڵەوە و پیشەی تەنها گریان بوو.. بۆیە لەخۆشی و ڕابواردنەوە گۆڕا بۆ ماتەمینی، لە شانۆ و فیلمەوە بۆ مزگەوت.. لە گۆرانیەوە بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆز.. بڕیاریدا ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ئەمساڵ بڕوات بۆ عەمرە.. هەندێ هاوڕێی خۆیشی برد لەسەر خەرجی تایبەتی خۆی.. لەوێ لە کەعبەی پیرۆز بە دەنگی بەرز دەگریا... دەیەوت: من چی بڵێم بە پەروەردگارم؟ کاتێ لە بەردەمیدا وەستاوم چی بکەم؟ بە کوڵ دەگریا... وەك کەسێك لەو ڕۆژەدا منداڵێکی لەدەست دابێت.. هاوڕێکانی دەڵێن: ڕۆژێکیان بە شاری مەککەدا دەسوڕاینەوە، قسەی خۆش و سوعبەتمان دەکرد.. ئەویش چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون، تەنها زیکر و دوعای دەکرد و چاوەکانیشی پڕ لە فرمێسك بوون.. هەر دەیوت: هاوڕێکەم

خوای گەورە ڕەحمەت پێ بکات، خوای گەورە ڕەحمەت پێ بکات.. من چیم بکردایە ئەگەر ئەو ڕۆژە من بومایە لەجیاتی تۆ؟ لە خوای گەورە داواکارم منیش بە دیدارت شاد بکات، بەخوا من موشتاقی تۆم و بیرت دەکەم.. لێمان پرسی: ئەو کەسە کێیە؟ وتی: ئەوکەسەیە کە ڕێگای ڕاستی نیشاندام.. لەپڕ بەردێك لە بینایەکی بەرزەوە بەربوویەوە و دای بەسەری هاوڕێکەماندا و کەوت بەزەویدا... بە خەندەوە دەیوت: لەبیرتان نەچێ دوعای خێرم بۆ بکەن وەك چۆن من دوعام بۆ هاوڕێکەم دەکرد.. وەفاتیکرد.

## ١٦- ﴿ئەمڕۆ دواهەمین ڕۆژی ژیانی منە﴾

﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ(١٠٤)﴾ آل عمران.. واتە:﴿ با بەردەوام لە نێو ئێوەدا کۆمەڵێ هەبن ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بکەن‌و ئامۆژگاری خەڵك بکەن‌و ڕێی ڕاستیان پیشان بدەن، ئەم جۆرە کەسانەن لەهەموو کەس چاکترو سەرکەوتوو ترن(١٠٤)﴾.

﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾آل عمران/١١٠.. واتە:﴿ ئێوە ئەی ئوممەتی موحەممەد! چاکترینی ئەو ئوممەتانەن کە بۆ خەڵك دەرکەوتوون‌و کراونەتە ئوممەتی پێغەمبەران، چونکە ئێوە ئوممەتێکن ئەمر ئەکەن بە چاکەو نەهی ئەکەن لە خراپەو شارەزایی خەڵك ئەکەن‌و بەڕاستی ئیمانیان بە خودا هەیە، ئەگەر کیتابییەکان بە ڕاستی ئیمانیان بهێنایە چاکتر ئەبوو بۆیان، بەڵام بەشی زۆریان لەڕێگای دین لایانداوەو کافرن(١١٠)﴾.

پێغەمبەر ﴿د.خ﴾ دەفەرموێ:﴿قوام الشَّرِيعَةِ الأَمْرُ بِالْمَعْروفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنكَرِ وَإِقَامَةَ الْحُدُودِ﴾ واتە:﴿قەوامەی شەریعەت لە فەرماندان بەچاکە و قەدەغەکردنی خراپە و جێبەجێکردنی سنوری خودادایە﴾. ئەمە فێربووم لە فەرمان بەچاکە و قەدەغەکردنی خراپە.. بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان پێشبینی ئەوەم نەکردووە هەرگیز کە بۆ ئەم ڕستەیە چیرۆکێك هەبێت وەك ئەمەی من.. بە تایبەتی ئەوەی کە من هەمیشە لێی دەترسام کاتێ کە ئافرەتێ دەبینم کە تاوانێ دەکات و نزیك ببمەوە لێی و باسی ئەوەی بۆ بکەم.. بۆ هیچ نا تەنها لەبەر ئەوەی ئیحراجم بکات و بڵێت ﴿وازبێنە.. ئەمە چ پەیوەندیەکی بە تۆوە هەیە﴾ یان ﴿کێ ڕێگای پێداویت لە شتێکدا خۆت هەڵقورتێنیت پەیوەندی بە تۆوە نیە﴾ و لەوجۆرە وتانە کە وات لێدەکات هەست بە ئیحراجی بکەین.. من هەمیشە لە نێوان دوو ململانێدا بووم، بیکەم یان نەیکەم... لە نێوان بێدەنگبوون یان قسەکردن.. هەتا ڕۆشتم بە ئەزمونێکدا کە دوای ئەوە خۆم کۆکردەوە کە لەگەڵ شەیتاندا بجەنگێم و حەزەکانی پەروەردگارم ڕاپەڕێنم.. لەگەڵ ئەو غەمبارییەی کە باڵی کێشاوە بەسەر ئەو ئەزموون و تاقیکردنەوەدا لەدەرەوە... بەڵام لەناخدا زۆر دڵخۆش کەربوو... لەو ساتەوە توانام بۆ پەیدابوو بۆ فەرماندان بەچاکە و قەدەغەکردنی خراپە.. هەرچەندە قسانێکیشم دەبیست کە بریندارکەرو

ئیحراجکەر بوون لە دنیادا و ئازاریان دەدام، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا چەندین پلە بەرزی دەکاتەوە... ئەمە چیرۆکی کچێکە باش نەمدەناسی، تەنها دوای وەفات کردنی نەبێت.. خوای گەورە ڕەحمەت پێ بکات ﴿هودا﴾خان.. خوای گەورە شادت بکات بە بەهەشتی بەرینی خۆی.. براکەم پێی وتم کچێك پەیوەندی پێوە کردم و ناوی خۆی و ژمارەی مۆبایلەکەی و نامەیەکی داناوە و دەڵێ: ﴿داواکارم پەیوەندی بکەن، زۆر گرنگە﴾.. کاتێ تەماشای ژمارە و ناوەکەم کرد.. سەرسام بووم، چونکە من کەسم نەدەناسی بەو ناوەوە... تەماشای سەعاتەکەمم کرد، بینیم کات درەنگە بۆ پەیوەندی کردن پێیەوە، بۆیە بڕیارمدا سبەینێ پەیوەندی پێوە بکەم.. من بەم شێوە قسەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد، لەو کاتەدا دایکم بانگی کردم، کاتێك چووم بۆلای، ئاماژەی بۆ تەلەفۆنەکە کرد کە پەیوەندیم لەگەڵە.. کاتێ قسەی کرد، ئەو ئافرەتە بوو کە پێشتر پەیوەندی کردبوو.. دوای ئەوەی داوای لێبوردنی کرد لە پەیوەندی کردنی بە منەوە لەم کاتە درەنگەدا، بە بیانوی ئەوەی کارەکە زۆر گرنگە و زیاد لەڕادەی خۆی دواخراوە.. لێی پرسیم ئایا سبەینێ کاتم هەیە تا سەردانم بکات.. منیش ڕازی بووم و وادەی سەردانەکەمان دیاری کرد.. کاتێ تەلەفۆنەکەم داخست زۆر سەرسام بووم بەو کارە، و هەروەها دەشترسام.. دەنگی زۆر خەفەتبار دیاربوو.. لەوانەیە کارێکی گەورە ڕوویدابێت.. لە سەعاتی دیاریکراودا هات.. دوای ئەوەی دانیشتین.. ئاشنای کردم بە ناوی خۆی ﴿حەنان﴾.. کچێك بوو چەند ساڵێ لەمن گەورەتر بوو.. چاوانی داچۆڕا بوون.. جلەکانی ڕەش بوون.. دەنگی خەفەتبار و پچڕپچڕ بوو.. زۆر ماندووبوو... چاوەڕوانیم کرد قسەم بۆ بکات، بەڵام بەنارەحەت قسەی دەکرد... نازانم بۆچی... ئایا خەفەتبارە یان لە شوێنەکە دەترسێ... یان بۆچی... نازانم.. لەبەرئەوە من دەست پێشخەریم کرد کە ئەو کێیە... و ئەو کارە گرنگە چییە کە ناتوانێ دوای بخات..؟؟ دوای چەند ساتێك بێدەنگی.. چاوانی بەرز کردەوە بۆ چاوانم و تەماشام کرد فرمێسك دێتە خوار بەچاوانیدا... دەستی برد بۆ جانتاکەی تا نامەیەك دەربهێنێ... تەماشایەکی نامەکەم کرد و پاشان وەرم گرت.. و گرتم بەدەستمەوە.. بەڵام من هەر لە گێژاوی سەرسامیدا مەلەم دەکرد.. لێم پرسی: ئەمە چیە؟؟ وەڵامی دامەوە: ئەمە نامەیەکە لە ﴿هودا﴾ی خوشکمەوە.. بە سەرسامییەوە ووتم: هودای

خوشکت..!! بەڵام من کەس ناناسم بەو ناوەوە... ئەی بۆ خۆی لەگەڵ تۆدا نەهات لە جیاتی نوسینی نامە..؟؟ بە کوڵێ فرمێسکەوە وەڵامی دامەوە کە دوای هەوڵێکی زۆر لەمنەوە هێمنم کردەوە... بێدەنگ بووم تا بواری بۆ بڕەخسێنم بیر و هۆشی کۆبکاتەوە و دەست بکات بە قسەکردن.. چەند خولەکێك بەڵام بەنیسبەت منەوە چەند سەعاتێك بوو... وتی: هودای خوشکم ماوەی شەش مانگە توشی ڕووداوی ئۆتۆمبێل بووبوو.. توشی شکان و برینداری زۆر بووبوو لەجەستەیدا.. دوای مانەوەی بۆ ماوەی مانگێك و چەند ڕۆژێ لە نەخۆشخانە، توشی خوێن بەربونێکی سەخت بوو کە بووە هۆی وەفات کردنی.. پێش مردنی داوای کرد لە من کە ئەم نامەیەت پێ بگەیەنم کە لە نەخۆشخانە نوسیبوی.. داوای لێبوردن دەکەم کە دوام خست.... بەڵام بەهۆی سەختی کارەساتەکە و بەهۆی لەدەست دانی ئەو تاکە خوشکە بچوکەم.. وای لەمن کرد بۆ ماوەیەك لە جێگادا بکەوم.. تا ئێستاش تەندروستیم باش نەبووە.. یەکەمین شتێ کە بیکەم پەیوەندیکردن بوو بە تۆوە تا ئەم نامەیەت پێ بگەیەنم.. نکوڵی ناکەم لەوەی کە سەرسام بووم بە نهێنی گرنگیدانی ﴿هودا﴾ی خوشکم کە لە جێگادا بوو بەو نامەیە و بە گرنگێتی گەیشتنی بە تۆ...!! لەو کاتەدا لێم پرسی: ئازیزم ﴿هودا﴾ کێیە؟ و نهێنی سوربوونت بە گەیشتنی ئەو نامەیە چیە؟؟ لە وەڵامدا وتی: ئەو ئافرەتە رزگاری کردم لە ئاگر، پێم ووت: چۆن تێناگەم؟؟ بەڵام وەڵامم دەست نەکەوت.. زۆر بە زەحمەت قسەی دەکرد... بەڵام چاوەکانی چاوەڕوانی ئەوەیان لەمن دەکرد کە پەیمانی پێ بدەم کە ئەو نامەیە بگەیەنم بە تۆ... منیش پێم ووت: دڵنیابە ئەو کارە دەکەم... کە تۆشم لەگەڵدا دەبیت تا پێکەوە بیگەیەنین. خەندەیەکم بۆ کرد و چاوەکانم دەگریان و تا خوای گەورە ئاواتی کۆتایم بەدی بهێنێ، خوشکە بچوکەکەم چاك بکاتەوە... بەڵام ئیرادە و توانای خوا لەسەروو هەموو شتێکەوەیە.. کۆچی کرد و بەتەنها بەجێی هێشتم.. کارەسات بوو.. وای لە فرمێسکەکانم کرد کە بیانبەستێ.. شڵەژام، نەمئەزانی چی پێ بڵێم.. و چی بکەم... هەر کاتێ دەمەویست نزیك بمەوە لە نهێنی ئەو کچە وام دەبینی زیاتر بابەتەکە ئاڵۆز و غەریب دەبێت... تەماشایەکی خۆی و پاشان نامەکەم کرد.. یادەوەریەکانم بردمیان تا بمگەیەنن بەساڵی ١٩٩٩ ز.. لە گەشتێکدا بووم لە وەرزی بەهاردا لەگەڵ

خیزانەکەماندا بەرەو کەناری دەریا... لەوێ ئاشنا بووم بەسێ کچ کە ئەوانیش لە شالیاتە(شوێنی حەوانەوە)کانی بەرامبەرمان نیشتەجێ بوون.. بەڵام من زۆر دانەدەنیشتم لەگەڵیاندا بەهۆی سەرقاڵیمەوە بە یارمەتیدانی دایکمەوە... ئەو لە قۆناغی پاك بوونەوەدا بوو دوای ئەو نەشتەرگەریەی -سوپاس بۆ خوا- بە سەرکەوتووی بۆی ئەنجام درا... و لەبەرئەوەی من تاکە کچی ئەو بووم ناڕەحەت بوو کە بۆ ماوەیەکی درێژ بەجێی بهێڵم.. من هەمیشە هاودەمی ئەو بووم... بەجێم نەدەهێشت مەگەر تەنها کاتی نوێژ بهاتایە و مۆڵەتم لێ وەردەگرت و دەڕۆشتم بۆ مزگەوت... تا نوێژ بکەم... دوای ئەوە دەگەڕامەوە بۆماڵەوە.. بە درێژایی گەشتەکە شتێك سەرنجی ڕاکێشا بووم، کە دڵی گوشیبووم.. تێبینی ئەوەم کردبوو کاتێك کە کاتی نوێژ بهاتایە کۆمەڵێك کچ لە نێویشیاندا ئەو ئافرەتانەی کە ئاشنا بووبووم پێیان، هیچیان نەدەهاتن بۆ ئەنجامدانی نوێژ... لەگەڵ ئەوەدا ئەو مزگەوتە لەهەمان ئەو گەڕەکەماندا بوو کە نیشتەجێ بوین تیایدا... بەڵکو لەهەموو جارێکا لە مزگەوت دەهاتمە دەرەوە بە تایبەتی لە نوێژی عیشا دەمبینی دانیشتبوون لە نزیك ئەو کەنار دەریایەی کە زۆر نزیك بوو لە مزگەوتەکەوە.. و لەهەموو جارێکا هەرکاتێ دەمەویست ئامۆژگاریان بکەم، نەمدەزانی چۆن دەست پێ بکەم.. و من دەمزانی کە من لەسەر هەقم و پێویستە لەسەرم وەك موسڵمانێك کە فەرمان بە چاکە بکەم و ڕێگری لە خراپە بکەم.. واز هێنانیش لە نوێژ کارێکی خراپە و پێویستە ڕێگری لێ بکەین.. بەڵام نەمدەزانی بۆچی جورئەت ناکەم.. لەوانەیە بەهۆی تەمەن بچوکیمەوە بێت.. چونکە دەمبینین هەموویان لە من گەورەترن بە سێساڵ و بەرە و ژوورتر... هەستمکرد کە ئامۆژگاری لە کچێکەوە وەرناگرن کە لەوان بچوکتر بێت.. یان دەترسام بە قسەکانیان ئیحراجم بکەن... کە نابێ من خۆم لەکارێ وەربدەم کە پەیوەندی بەمنەوە نیە... یان... یان بەهانەی بێ سەروبەر کە شەیتان دەیخستە مێشکمەوە تا لە عەزیمەتم کەم بکاتەوە لە ڕێنمایی کردنیان... تا ئەو کاتە هات کە جارێکیان لە نوێژی عیشا بوومەوە دەهاتمە دەرەوە.. دواهەمین ڕۆژمان بوو لەوێ.. دانیشتم لە گەڵیاندا.. من تەنها سیانیانم دەناسی، بەڵام ئەوانی تر ئاشنابووم بەناویان لەکاتی دانیشتنم لەوێ.. ﴿هودا﴾ش یەکێ بوو لەوانەی کە تەنها ئاشنا بووم بە ناوەکەی، بەبێ ئەوەی

بزانم كێیە، هەریەكەیان باسی ڕووداوێكی خۆیی دەكرد كە پێكەنیناوی یان ئیحراجكەر بووبێت.. تا سەرەی من هات كە قسەبكەم.. پێویست بوو لەسەرم یەكێكیان هەڵبژێرم یان چیرۆكێكی جوان كە بیگێڕمەوە یان هەڵوێستێكی پێكەنیناوی.... لێرەدا دڵنیابووم كە كاتی ئەوە هاتووە شتێك بكەم.. بەڵام چۆن... تا بیركردنەوەم ڕێنمایی كردم بۆ ئەمە... لە بەردەمیاندا وەستام... وتم: چیرۆكێ یان سەرگوزەشتەیەكم پێ نیە كە بۆتانی بگێڕمەوە، بەڵام حەزدەكەم پێكەوە یاریەك ئەنجام بدەین.. و پرسیارێك كە من لێتانی دەكەم بە مەرجێ زۆر بەڕاشكاوانە وەڵامم بدەنەوە.. پێتان چۆنە؟؟ بینیم زۆر بە حەماسەتەوە ڕازی بوون.. یاریەكەمان دەست پێ كرد بە یەكەمین پرسیار كە بریتی بوو لە: چی بكەم ئەگەر بە من وترا كە ئەمڕۆ دواهەمین ڕۆژە لە ژیانتدا؟؟ چی دەكەیت؟؟ وەڵامی كچەكان جیاواز بوو.. بەڵام هەمویان سووربوون لەسەر شتێكی هاوبەش ئەویش ئەنجامدانی نوێژ بوو... منیش گەشبین بووم پێیان... دوای ئەوە پرسیاری دووەمم لێ كردن: كێ لە ئێوە دەزانێ چەنێك دەژی؟؟ هەموان بە بێدەنگی و سەرسامی وەڵامیان دامەوە... منیش پێم ووتن... كەس لە ئێمە نازانێ كەی دەمرێت... لەوانەیە ئێستا، لەوانەیە سبەینێ، و لەوانەیە مانگی داهاتوو یان ساڵی داهاتوو.. بەڵام ئەو شتەی كە هەمووومان كۆكین لەسەری ئەوەیە كە ڕۆژێك دێت كە بمرین، بەڵام كەی؟ خوای گەورە دەزانێ.. چوومە سەر پرسیاری سێیەم: بە باوەڕی تۆ كامیان خۆشترە دنیا یان بەهەشت؟؟ هەموان بەیەك دەنگ وتیان: بێگومان بەهەشت... ڕۆشتمە سەر پرسیاری چوارەم: بەهەشت بۆ موسڵمانانە و دۆزەخیش بۆ بێباوەڕان.. بەڵام كۆمەڵێ لە موسڵمانانیش دەچنە دۆزەخەوە، بۆچی؟؟ وەڵامیان نەیامەوە.. زانیم كە وەڵام نەدانەوەیان.. بە هۆی شەرمكردنیانە لە وەڵامەكە... چونكە لەم پرسیارەوە مەبەستی منیان بۆ دەركەوت.. پرسیاری كۆتاییم لێ كردن: ئەگەر بە ڕاستی ئەمڕۆ دواهەمین ڕۆژی ژیانی تۆ بێت...؟؟ تۆ بەرە و كوێ دەچیت بەهەشت یان دۆزەخ؟؟؟ ئەمجارەشیان، بەشی ئەوان هەر بێدەنگیی بوو.. هەستم كرد كە ئامادەم كردون تا باسەكەمیان بۆ بكەم.. و هەروەها تاوەكو دەروازەیەك بكەمەوە كە هەموو ئەو شتانە بڵێم كە حەزدەكەم پێیان ڕابگەیەنم... ... قسەكانم تەواو كرد... من داواتان لێ ناكەم وەڵامی پرسیاری كۆتایی

بدەنەوە.. چونکە هیچ یەکێ لە ئێمە نازانێ سەرەنجامی ژیانی چۆن دەبێت.. من بۆ خۆم سوپاس بۆ خوا هەر پێنج نوێژەکە لەگەڵ سونەتەکاندا ئەنجام دەدەم، چاکە و بەخشش ئەنجام دەدەم و ئەگەر توانیم عەمرەش دەکەم... و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش دەگرم.. چەندین ڕۆژی تریش بەڕۆژوو دەبم بۆ خواپەرستی.. قورئانیش دەخوێنمەوە... بالاّ پۆشیشم... بەلاّم لە ڕۆژی قیامەت دەترسم.. ئەزانن بۆچی؟ چونکە تا ئێستا کارێکم ئەنجام نەداوە بەهەشتی بۆ مسۆگەر کردبم.. بەلاّم تەماحم بە ڕەحمەت و بەزەیی خوا زۆرە..... بەلاّم ئێوە!! چۆن بەرەو ڕووی خوا دەبنەوە.. گوێتان لە بانگەوەیە بانگتان دەکا بۆ نوێژ، دەتانبینم وەلاّمی نادەنەوە... چۆن بەرەو ڕووی خوادەبنەوە.. خوای گەورە فەرمانی بالاّپۆشی پێداون.. کەچی سەرپێچی دەکەن... چۆن بەرەو ڕوی خوا دەبنەوەو بەرهەمیشتان لە چاکە خەریکە دەبێتە هیچ بەرامبەر بە خراپەکاریەکانتان؟!!

تۆش سەری ئیسلامت نەوی کردووە بە فارامۆشکردنی نوێژەکانت... ئیتر چۆن جەستە بەبێ سەر دەژی...؟؟ ئەی تۆ و تۆ و تۆ دەزانن.. کاتێك سەرت دادەنێی لەسەر پشتی بۆ ئەوەی بخەویت، لەوانەیە ئەوە دواهەمین شەوی ژیانت بێت.. و ئیتر هەڵنەسیتەوە کاتێك نەبێت دوو فریشتە بە راسەرتەوەن، لەسەر گەورە و بچوکی کردەوەکانت لێت دەپرسنەوە... کاتێ پرسیاری نوێژەکانت لێ دەکەن... بەچی پۆزش دێنیتەوە؟؟ بۆ بالاّپۆشیەکەت، بەهانەی چیان بۆ دێنیتەوە...؟؟ و گۆڕەکەت لەوکاتەدا چۆن دەبێ، ئایا باخچەیەکە لەباخچەکانی بەهەشت، یان دەرگای دۆزەخ بە ڕوتدا دەکرێتەوە و گۆڕەکەت لەسەر تەسك دەکاتەوە.. و هاوڕێکەت مارێکی گەورە دەبێت.. خۆی بادەدا بە دەوری جەستەی باریکتدا و دەتکوژێ و تۆش گوێت لە شکان و وردبوونی ئێسکەکانتەوە دەبێ.. دەڵێیت من بچوکم و گەنجم... چونکە مردن کوێرە و ئەوکەسە نابینێ کە دەیبات... منداڵ و گەنج و پیر بە لای ئەوەوە یەکسانن.. بێگومان بینیوتە یان بیستوتە کە کەسێك مردبێت منداڵ یان لاو بوبێت... باشە ئەو لاوە ئەگەر پێش مردنی بە هەفتەیەك لێیان بپرسیایە کەی دەمریت؟ ئایا دەیزانی کە تەنها حەوت ڕۆژ ژیانی ماوە... و هەر خوای گەورە دەزانێ ئێمە چەند ڕۆژمان لەم ژیانەدا ماوە لەوانەیە بە پەنجەی دەست بژمێردرێت... خوشکانم کاتێ من تەماشای ئێوە دەکەم وادەزانم تەماشای کۆمەڵێ گوڵی جوان دەکەم بەلاّم ڕەنگیان تەڵخ بوون، چونکە تەپوتۆزی پیسی دنیا نیشتووە بەسەریانەوە.. دەی ئەو تەپوتۆزە لەخۆت

بکـەرەوە..و بـالآت بپۆشـە.. و وا لـەو گوڵانـە بکـە تەماشـا نـەکرێت مەگـەر لەلایـەن کەسێکەوە ئەو مافەی پێدرابێت.. داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر لە قسەکانمدا شتێکی نابـەجێم وتبـێ... بـەلآم بـەهۆی حەزکردنمـەوە کـە ئێـوەش لـە بەهەشـتی فیردەوسـدا لەگەڵمـدابن ئەگـەر خـوای گـەورە بیکـات بـە نـسیبم... و بـەهۆی ترسـی زۆرم بۆتـان لـە ئاگرێك کـە جەسـتە دەسـوتێنێ و ئێسکەکان دەتوێنێتـەوە.. تۆ بەرگـەی ئاگری دنکـە شـقارتەیەك ئاگریـت کـە بـەر پەنجەیـەکت بکـەوێ... ئـەی دەبـێ حاڵـت چـۆن بێـت لـە ئاگرێك بە زیندوێتی هەڵت لوشـێ و هـەرگیزیش لەناو ئەو ئاگرەدا نـەمریت... بەخوا من زۆر گەشبین بووم پێتان کە بینیم یەکەم شتێ بیرتان لێ کردەوە کە ئەنجامـەی بدەن نوێـژبوو.. بـەهۆی ئیمـان و بـاوەڕی ناختانـەوە کـە حـەق و واجبـە... بـەلآم کـەی بڕیـار دەدەیـت بەهەسـتان بـەو هەقـە... ئایا کـاتی تـەواوت هەیـە؟؟ ئایـا نـابینی کـات ئێـستا تێدەپەڕێ و تۆش چاوەڕوانیت کە لەزەت لـە دنیایـەکی ڕوکـەش و دوروژینـە ببینیـت... و دەسـبەرداری بەهەشـتێکی پـڕ لـە نـازو نیعمـەت ببیـت... شـەیتان چـۆن بیـەوێ دەتبات.. دەڵێی بەدیلی گرتویت و چاوەکانت بوون بە بەندەی ئـەو و ئارەزوەکانـت.. لە کاتێکدا ئیسلام تۆی ئازاد کردووە و پلەو پایەی بەرز کردویتەوە... بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَـاةَ وَيُطِيعُـونَ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ أُولَئِـكَ سَـيَرْحَمُهُمُ اللَّـهُ إِنَّ اللَّـهَ عَزِيـزٌ حَكِـيمٌ(٧١)﴾التوبـة.. واتـە:﴿ خـاوەن ئیمانـەکان ژن و پیاویـان هەنـدێکیان دۆسـتی هەندێکیانن، یەکتریان خۆش ئەوێ ، ئەمر ئەکەن بە چاکەو نـەهی ئەکەن لە خراپەو نوێـژ ئەکـەن و زەکـات ئـەدەن و بـە گـوێی فـەرمانی خـوداو پێغەمبـەری خـوداﷺ ئەکـەن ، ئەمانـە خـودای گـەورە ڕەحمیـان پـێ ئـەکات ، خـوا غاڵبـە بەسـەر کـاری خۆیـداو کارەکـانی پـڕ حیکمەتن(٧١)﴾

خوشکانی بەڕێزم ئەم ئایەتە فەرمانی پێدام کە من ئێستا بێم بۆلاتان، و هەموو ئەم شتانەتان پێ بڵێم.. و لەبەر ئەوەی باوەڕدار و موسڵمانم، هەق و واجبە لەسەرم کە فەرمان بەچاکە بکەم و ڕێگری لەخراپە بکەم، تەنانەت با گوێشم لێ نەگرن.. ئەوەی حاڵی خۆی باش بکات ئەوە براوەیە و ئەوەشی وا نەکات ئەوە زیانمەندە لەدنیا و قیامەتدا... بەو بێدەنگیەیان بەجێم هێشتن و بیریان دەکردەوە.. گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.. تا جانتاکانم کۆبکەمەوە... بەیانی زوو لە مەوقیفەکەدا بینیمن... سلآومان لەیەك کردو ژمارەی تەلەفۆنمان دا بەیەکتری..و خواحافیزیمان لەیەکتری کرد... و من

ئومێدم هەبوو کە خوای گەورە ئایندەیان باش بکات... حەنان تەماشای دەکردم و منیش نهێنی ئەوەم بۆ باسکرد هەتا کۆتایی.... ڕوخساری فرمێسك دای گرتبوو... دەیوت: هودا لەو کاتەوە بەتەواوی گۆڕا.. پارێزگاری پێنج نوێژەکەی دەکرد... و گرنگی بە ڕۆژووی ڕەمەزان دەدا.. و وازی لە ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێکانی هێنا... بەڵکو کاتێ شەشی ئامادەیی تەواوکرد، حەزی خۆیی گۆڕی لە ڕۆشتن بۆ کۆلێژی بازرگانی بەرەو کۆلێژی شەریعەت. تا بەشێوەیەکی دروست فێری ئەرکانەکانی ئاینی ئیسلام ببێت.. خوشکی خۆم ئێمە کە لەدایك بووین کەس نەبوو ڕێنماییمان بکات بۆ ڕێگای ڕاست... باوکم گرنگی دەدا بە بازرگانی و ماڵ و سامانەکەی، دایکیشم ئاهەنگەکانی و ئەندامێتیەکەی لە کۆمەڵەکەدا گرنگتر بوو بەلایەوە... برا گەورەکەشم سەفەری کرد تا لە ئەمەریکا بژی.. کەس نەمابویەوە بێجگە لە من و خوشکی بچوکم (هودا) خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات... دەستی کرد بە گێڕانەوە... منیش هەستم دەکرد دڵم خەریکە پارچە پارچە دەبێت.. بەڵکو هەوڵم دەدا کە ڕێ لە فرمێسکی چاوم بگرم نەکەوێتە خوار... بەڵام هەر ناچاربوو ئیعلانی غەمی خۆی بکات بۆ حاڵی موسڵمانانی ئەمڕۆمان لە تیاچوون.. ئەبێ چەند خێزان بەو شێوەیە بژین.. و چەند کوڕ و کچی لاو تیاچوون بە هۆی شوێنکەوتنی شەیتانەوە.. هۆکارەکەش دایك و باوکە کە بەهای منداڵەکانیان نازانن.. ڕادەکەن بەدوای خۆشیەکانی دونیا... لە دوای خۆیان گەنجینەیە جێ دێڵن کە بەهاکەی مەزەندە ناکرێت!! حەنان جێی هێشتم و چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك.. نازانم بۆچی... ئایا فرمێسکی خەفەتە بۆ وەفات و ماڵئاوایی خوشکەکەی؟؟ یان فرمێسکی شادیە بە هۆی عاقیبەت خێریی خوشکەکەی؟ یان بۆ حاڵی خۆی!! پێش ئەوەی بڕوات داوام لێکرد کە پەیوەندیم پێوە بکات تا دڵنیابم لێی، ئەویش بەڵێنی پێ دام.. دوای ڕۆشتنی نامەکەم کردەوە و هەستم دەکرد کە دەستەکانم دەلەرزن.. نازانم بۆچی.. بەڵام هەستم بە ڕاچەنینێکی گەورە کرد، و لێدانی دڵم خەریك بوو گوێی کەڕ دەکردم... حەزم دەکرد نامەکەتان بە تەواوی بۆ بنوسمەوە، بەڵام بمبوورن کە ناتوانم، چونکە شتانێکی تایبەتمەندی تێدابوو.. بەڵام هەندێ بڕگەی هەڵدەبژێرم.. کە وەسفی ئەو کچە موسڵمانەتان بۆ دەکات.

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴿من لە زۆنگاوی دنیادا دەژیام.. کەس نەبوو

ڕێنمایم بکات بۆ سەر ڕێگەی ڕاست.. چیم بویستایە و لە هەرکاتێکدا بوایە دەمکرد.. کارەکەش هەڵە بوایە هەر دەمکرد... ئامانجم ئەوەبوو بەختەوەر بیم... با بەختەوەریەکی ڕوکەشیش بێت... بەڵام شایەتی دەدەم بۆت لە خەویشمدا دڵخۆش نەبووم... لە ترسێکی تۆقێنەردا بووم نازانم سەرچاوەکەی لەکوێوە بوو، هەستکردن بە تیاچوون... بەڵکو ئەو حاڵەتەی منی تێدایە لە خودی خۆیدا تیاچوونە... دڵم هەمیشە گوشراو بوو... بەختەوەریم تێکەڵ بە تاڵیی بووبوو، نازانم سەرچاوەکەی لە کوێوە بوو... دایکم و باوکیشم... لە ئاستی ئەو ئەمانەتەدا نەبوون کە خوای گەورە پێی بەخشی بوون... ئەوانیش بەشدار بوون لە تیاچوونی من و خوشکەکانی تریشم.. بۆچی؟؟؟ لە پێناوی ماڵ و سامانێکدا کە ئێستە من خاوەنی نیم.. من ئێستا هیچم نیە بێجگە لە ڕووبەری مەترێك بە دوومەتر.. هیچم پێ نیە بێجگە لە کردەوەکانم، سەبارەت بە ماڵ و سامان و پلە و پایەی ئەوان و هەیبەتیان ئێستا هیچ سودێکی نیە بۆ من.. و من ئێستا لە بەردەستی دوو فریشتەدام کە لێم دەپرسنەوە... و کاتێکیش سبەینێ ئەوان یەن بۆ ئێرە هیچ سودێکیان بۆ من نیە... و ڕزگارم ناکەن لە سزای خوایی...!! بەڵام دوای ئەو ڕۆژە و ئەو یاریە بڕیارمدا کە ئەو کچە بکوژم کە لەناخمدایە... تا کچێکی تر لەدایك ببێت.. کچێك ڕێگای ڕاستی دۆزیبێتەوە.. لەگەڵ سەختی ئەو ڕێگایە و، بەڵام هەست بە ڕۆزیی خەوێکی ئارام..و دڵێکی دڵنیا..و هەستێکی گەورە بە ئەمان دەکەم.. بە بەختەوەریەکی بێ کۆتایی... بە دوعای ڕۆژانە کە خوای گەورە ئیصلاح و هیدایەتی دایك و باوکم بدات لەو تاریکاییەی کە تیایدا دەژین...»

ئەمە بەشێك بوو لە نامەکەی (هودا).. خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات و بە بەهەشتی فیردەوس شادی بکات.. ئەم نامەیە پێش چاوانم دڵمی هێنایە گریان و تەنها ئەوەندەم لە تواناداا بوو کە یەك وشە بڵێم..

الحمد لله كثيرا.. الحمد لله كثيرا.. الحمد لله كثيرا..

سوپاسی زۆر بۆ پەروەردگار.. سوپاسی زۆر بۆ پەروەردگار.. سوپاسی زۆر بۆ پەروەردگار.

# ١٧- ﴿سوژدەیەك لەژێر ئاودا﴾

من گەنجێك بووم وا گومانم دەبرد ژیان بریتیە لە ماڵ و سامانێکی زۆر... ڤێللا و ئۆتۆمبیل و شتانی تر.. ئەوەتا ئێستا بەسەرهاتی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە بەڵکو بێناگایەك خەبەر بکاتەوە پێش ئەوەی کارلەکار بترازێ.. ڕۆژی هەینی بوو... وەك پیشەیەکی هەمیشەیی سەرقاڵی یاری بووم لەگەڵ هاوڕێکانمدا لە کەنار دەریا... بەڵام ئەو هاوڕێیانە کێ بوون.. کۆمەڵێ دڵی بێ ئاگا بوون.. دڵانێك ئەوەندە تاریکیان تێدا بوو ڕوناکی خۆریان دەکوژاندەوە.. گوێم لە بانگەوە دەبوو بانگی دەکرد... (حَيَ عَلَى الصَّلاةِ.. حَيَ عَلَى الفَلاحِ) سوێند بەخوای مەزن دەخۆم، بەدرێژایی ژیانم گوێم لە بانگەوە دەبوو.. بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان تێنەدەگەشتم لەمانای ووشەی ﴿الفلاح﴾.. ﴿واتە ڕزگار بوون﴾.. بەڵام بە زمانێك دەوترا لێی تێنەدەگەشتم.. هەرچەندە من عەرەبم و زمانیشم عەرەبیە.. بەڵام بێ ئاگاییە... ئێمە لەکاتی بانگداندا کەلوپەلی چونە ناو ئاو و بۆری هەوامان ئامادە دەکرد... بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ گەشتێکی جوان لەژێر ئاودا.. و منیش لە عەقڵمدا بەرنامەی هەموو ڕۆژەکەم ڕێکدەخست کە هیچ ساتێکی نەبوو پەنا بەخوا سەرپێچیکردنی خوای تێدا نەبێت.. ئێستا ئێمە لەژێر ئاوداین.. پاکو بێگەردی بۆ بەدیهێنەر کەچی دروستکردووە... هەموو شتێ ئارام و هێمن بوو... دەستم کرد بە گەشتە جوانەکەم.. بەڵام.. ئەوە ڕوویدا کە پێشبینیم نەدەکرد.. کاتێ پارچە لاستیکەکەم دڕاند و نەمویست ئاو بڕواتە دەممەوە و تاوەکو لە بۆریەکەوە هەوام بۆ بێت... لە کاتی ڕۆشتنی هەوا بۆسیەکانم دڕا... لە پڕ دڵۆپە ئاوە سوێرەکە بۆری هەناسەی گرتم... خەریك بوو دەمردم، سیەکانم خەریکبوو یەکالا دەبوونەوە و پێویستیان بە هەوا بوو... ئەو هەوایەی کە بەدرێژایی ژیانم هەڵمدەمژی و دەمدایەوە بەبێ ئەوەی هەست بکەم کە یەکێکە لە جوانترینی ڕۆزیەکانی خوای گەورە لەسەر من ... هەستم بە مەترسی ڕووداوەکە کرد.. هەر پەلەقاژەم دەکرد.. شریتی ژیانم بە بەردەم چاومدا ڕەت بوو... لەگەڵ یەکەمین هەناسە هەڵمژیندا... بۆم دەرکەوت کە چەندە مرۆڤ لاوازە.. تەنانەت من دەستەوسانم لە بەردەم بەرەو ڕوو بوونەوەی چەند دڵۆپە ئاوێکی سوێر.. خوای گەورە زاڵی کرد بە سەرمدا تا نیشانم بدات کە هەر خۆی بە تواناو دەسەڵاتدارە... و هیچ پەنایەك نیە بێجگە پەنابردن بۆ لای ئەو.. و هەوڵم

نەدەدا خۆم دەربێنم لە ئاوەکە، چونکە لە قولاییەکی زۆردا بووم.. لە گەڵ دووەم هەناسە هەڵمژیندا... بیرم لە نوێژی هەینی کردەوە کە فەوتاندم... بیرم لە ﴿حی علی الفلاح﴾ کردەوە.. سەرسام مەبن ئەگەر پێتان بڵێم من تەنها لەو ساتەدا تێگەشتم لە مانای ﴿الفلاح﴾.. بەڵام بەداخەوە زۆر درەنگ... چەندە پەشیمان بووم لەسەر ساتانێك کە بەسەرم بردبێت لە سەرپێچی خوادا.. لە گەڵ هەناسە هەڵمژینی سێیەمدا... دایکم هاتەوە یاد... و ئەو خەفەتەی دڵی شەق پێ بردبووم، و وێنایم دەکرد کە دەگری بۆ مردنی کوڕە خۆشەویست و تاقانەکەی.. و ماڵی ئەو دوای من چۆن دەبێ... لە گەڵ هەناسە هەڵمژینی چوارەمدا... بیرم لە گوناهەکانم دەکردەوە کە چەندە زۆرن... بیرم لە خۆبەزلزانیم و مەغرووریەتی خۆم دەکردەوە... بیرم لە ڕزگارکردن دەکردەوە لە دواهەمین چرکەی ژیانمدا... پێشتر بیستبووم کە هەر کەسێ دواهەمین وتەی ﴿لا إله إلا الله.. محمد رسول الله﴾ بێت دەڕواتە بەهەشتەوە.. دەستم کرد بە وتنی شایەتومان.. هەر کە وتم: اشهد.. اشهد.. دڵم دەستی کرد بە هاوارکردن... خوایە بمگەڕێننەوە.. خوایە بمگەڕێننەوە... ساتێك... خولەکێك.. چرکەیەك.. بەڵام هەیهو... خەریکبوو هەستکردنم لەدەست دەدا بە هەموو شتێك.. تاریکیەکی سەیر دایگرتم... هۆشم لەدەستداو دەمزانی عاقیبەتم چۆنە... –پەنا بەخوا– پەشیمانی بۆ عاقیبەتێکی لەو جۆرە... تا ئێرە بەسەرهاتەکە زۆر غەمناك دیارە... بەڵام ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە هەموو شتێکی گرتۆتەوە {وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ}الأعراف/١٥٦.. لەپڕ جارێکی تر هەوا ڕۆشتەوە ناو سنگم...و تاریکاییەکە لاچوو... چاوانم کردەوە و ڕاهێنەری مەشقەکەم بینی کە بۆری هەواکەی نابوو بە دەممەوە... دەیویست بمبوژێنێتەوە لەکاتێکدا هێشتا لەژێر دەریاکەداین... خەندەیەکم بینی بە ڕوخساریەوە.. لەوەوە تێگەیشتم کە حاڵی من باشە.. دڵ و زمانم و هەموو خانەیەکی جەستەم کەوتنەوە کار.. پێشی هەموویان گیانم... (أشهد ان لا إله إلا الله و اشهد ان محمداً رسول الله... الحمد لله.. الحمد لله..الحمد لله..) لەپڕ دڵم دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ ناخی خۆمدا: خوای گەورە ڕەحمی پێ کردیت بەهۆی دوعای دایکتەوە بۆ تۆ.. دەی تۆش پەند وەربگرە.. برایان و خوشکانم کاتێ لە ئاوەکە هاتمە دەرەوە.. کەسێکی تر بووم.. بێگومان مەبەستی من لە کەسێکی تر

ئەوەیە تەماشاکردنم بۆ ژیان بە شێوەیەکی تر بوو... ئەوەتا من سوپاس بۆ خوا لاوێکم ئەوەی کە ئاواتە خوازم لە خوای تاك و تەنها ئەوەیە کە ژیانم کۆتایی پێ بێنێت بە ﴿اشهد أن لا إله إلا الله و أن محمد رسول الله﴾ لە کاتی غەرغەرەی مردندا کە بە باشی لێی تێگەشتووم.. لاوێك دەیەوێ لەوانە بێت کە قورئانی پیرۆز باسی کردوون لە کتێبە پیرۆزەکەیدا.. خوای گەورە لە سورەتی مەریەمدا دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ شَيْئًا(٦٠)جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدَ الرَّحْمَانُ عِبَادَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّهُ كَانَ وَعْدُهُ مَأْتِيًّا(٦١)﴾مريم... واتە:﴿ مەگەر کەسێ بگەڕێتەوە لای خواو ئیمان بهێنێ و کردەوەی باش بکا، ئەوانە ئەڕۆنە بەهەشت و کەم و زۆر ناهەقییان لەگەڵ ناکرێ (٦٠) ئەو بەهەشتە (جنات العدن)ە، کە خودای میهرەبان وەعدەی پێ داوە بەبەندەکانیخۆی لەکاتێکدا کە هێشتا دیار نەبووەو بەرچاو نەبووە،وەعدەی خوا بەڕاستی دێتە دی (٦١)﴾ شایانی باسە دوای ئەو ڕووداوە بە ماوەیەك بە تەنها گەڕامەوە بۆ هەمان شوێن لە ژێر دەریادا و سوجدەم برد بۆ خوای گەورە سوجدەی سوپاس و ملکەچی و وەلا و منەت لە خواوە... لە شوێنێکدا گومان نابەم دڵم لەیادی بکات کە سوجدەی بردووە بۆ خوای گەورە... بەڵکو ئەو شوێنە لە ڕۆژی قیامەتدا شایەتیم لەسەر بدات و خوای گەورەش بە هۆی سوجدە بردنمەوە لەژێر دەریادا ڕەحمم پێ بکات و بمخاتە بەهەشتەکەیەوە.. خوایەگیان دوعامان قبوڵ بکەیت... خوایەگیان من و ئێوەش جێگیر بکات لەسەر ڕێگای ڕاست...و من و ئێوە کۆبکاتەوە لە بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەت.

ئامین....ئامین....

## ١٨- ﴿نوێژ بکە پێش ئەوەی نوێژت لەسەر بکەن﴾

من وازم لە نوێژکردن هێنابوو... هەموان ئامۆژگاریان دەکردم... باوکم.. برا و خوشکەکانم... گوێم بە کەس نەدەدا... ڕۆژێکیان مۆبایلەکەم زەنگی لێدا، مەلایەکی بەڕێز بوو دەگریا و دەیوت: ئەحمد؟ بەڵێ! خوای گەورە جەزاتان بداتەوە بە هۆی وەفاتی خالیدەوە، لە ناو جێگاکەیدا بە مردوویی بینیمان... هاوارم کرد: خالید؟! دوێنێ لەگەڵمدا بوو... گریا و ووتی: لە مزگەوتی گەورە نوێژی لەسەر دەکەین.. مۆبایلەکەم داخست... گریام.. خالید! چۆن مرد لەکاتێکدا ئەو گەنج بوو... هەستم کرد کە مردن گاڵتە دەکات بە پرسیارەکەم... بە گریانەوە چوومە مزگەوتەکە... بۆ یەکەمین جار نوێژم لەسەر مردوو کرد.. گەڕام بەدوای ﴿خالید﴾دا، بینیم پێچراوە لە کفنەوە .. لە پێشی ڕیزەکانەوە، نەدەجوڵایەوە.. بە هۆی ئەو دیمەنەوە هاوارم کرد... خەڵکەکە لایان کردەوە.. ڕوخسارم بە دەستەکانم داپۆشی و سەرم نزم کردەوە... هەوڵم دەدا وشك ببم... باوکم ڕایکێشام بۆ تەنیشت خۆی... بە چپە چرپاندی بە گوێمدا: ﴿ نوێژ بکە پێش ئەوەی نوێژت لەسەر بکەن!!﴾ وەك ئەوەی فیشەکێکی تەقاندبێ نەك وتەیەك... وردە وردە سەرم بەرز کردەوە... تەماشای خالیدم دەکرد... ئەگەر لەو مەرگە ڕاپەڕێ.. ئەبێ ئاواتە خوازی چی بێ؟! جگەرە..؟ هاوڕێ؟ سەفەر؟ گۆرانی!! خۆمم خستە جێگای ئەو... بیرم کردەوە ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ(٤٢)﴾القلم.. واتە:﴿ لەڕۆژێکدا کەداوێنی لێ ئەکرێ بەلادا، و بانگ ئەکرێن بۆ سوجدە بردن و ناتوانن ببەن!!﴾.

ڕۆشتین بەرەو گۆڕستان.. دامان هێڵایە ناو گۆڕەکە.. بیرم دەکردەوە ئەگەر پرسیاری کردەوەکانی لێ بکرێت؟ چی دەڵێ: بیست گۆرانی! شەست فیلم! هەزار جگەرە! زۆر گریام... نوێژی نیە شەفاعەتی بۆ بکات.. کردەوەیە نیە سوودی پێ بگەیەنێ.. نەمدەتوانی بجوڵێمەوە.. باوکم زۆر چاوەڕوانی کردم.. خالیدم لە گۆڕەکەیدا جێهێشت و دەستم کرد بە ڕۆشتن و ئەویش گوێی لە تەقەی نەعلەکانمەوە بوو..

## ١٩- ﴿چیرۆکێکی کاریگەر.... بیخوێننەوە﴾

وا گومانی دەبرد کە بەختەوەری لەوەدایە دوای کچان بکەوێت..و هەر ڕۆژەی نێچیرێکی هەبێت.. سەفەر بکات بۆ دەرەوەی وڵات.. فەرمانبەر نەبوو.. دزی دەکرد و سولفەی دەکرد و خەرجی دەکرد بۆ هەوا و ئارەزواتی خۆی.. منیش وەکو ئەو وابووم، بەڵام -خوا شایەتە- بە ڕادەی ئەو خراپەکار نەبووم... ڕۆژێکیان تەلەفۆنی بۆ کردم و داوای لێکردم بیگەیەنمە فڕۆکەخانە... سواری ئۆتۆمبێلەکەم بوو، زۆر دڵی خۆش بوو هەر تەماشای پاسپۆرتەکەی دەکرد.. سەرسام بووم لە پۆشاکەکەی و بڕینی قژی.. لێم پرسی: بۆ کوێ..؟ ووتی: بۆ.... ووتم: (اعوذبالله)!! ئەگەر تاقی بکەیتەوە ئارام ناگریت... وتم: بە تەنها سەفەر دەکەیت! وتی: بەڵێ، بۆ ئەوەی چیم دەوێ بیکەم... وتم: ئەی خەرجی؟ وتی: دەبرم کردووە... بیدەنگ بووین.. لە تەسجیلەکەدا کاسێتێکی تێدا بوو سەبارەت بە ﴿تەوبەکردن﴾ خستمە سەر... هاواری لێکردم کە بیکوژێنمەوە.. وتم: ﴿سوعبەت کردنمان﴾ تەواو.. با گوێ بگرین.. پاشان سەفەر بکەو چیت دەوێ بیکە.. بێدەنگ بوو... مامۆستاکە باسی تەوبەکردن و بەسەرهاتی تەوبەکارانی دەکرد.. هاوڕێکەم هێور بوویەوە و دەستی کرد بە وتنی: (استغفر الله).. پاشان ئامۆژگاریەکە زیادی کرد.. هاوڕێکەم دەستی کرد بە گریان و بلیتی فڕۆکەکەی دڕاند و وتی: بمگەڕێنەوە بۆماڵەوە... بە کاریگەریەکی زۆرەوە گەیشتینەوە ماڵیان.. دابەزی و وتی: خواحافیز.. لە کاتێکدا پێشتر دەیوت (بااااي)... پاشان سەفەری کرد بۆ مەکەو دوای ئەوە گەڕایەوە و بوو بەکەسێك لە چاکەکاران و نەمدەبینی یان لە نوێژ یان زیکرکردندا نەبوایە... هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم بە تەوبەکردن و ئیستیقامەت.. براکەی لەشارێکی تر نەخۆش کەوت و ئەمیش سەفەری کرد بۆلای. دوای چەند ڕۆژێ موفاجەئات ڕوویدا... براکەی پەیوەندی پێوەکردم و ووتی: خوای گەورە جەزاتان بداتەوە سەبارەت بە فلان... دوێنێ نوێژی مەغریبی کرد و پاشان شانی دادا لە سەر ئۆتۆمبێلەکەی و زیکری خوای گەورەی دەکرد.. کاتێ هاتین بۆ نوێژی عیشا بینیمان وەفاتی کردووە.

## ٢٠- ﴿وشەیەك بووە هۆی موسڵمان بوونی ٤ پزیشکی ئافرەت﴾

د.عبدالله وتی: بانگکرام بۆ کۆنگرەیەکی پزیشکی لە ئەمەریکا.. هات بە خەیاڵمدا کە بە پۆشاکە سادەکانم ئامادەبم، کە گەشتمە ئەوێ.. چوومە هۆڵەکەوە، پزیشکێکی عەرەبم بینی لە تەنیشتیەوە دانیشت... وتی: ئەم جلانە بگۆڕە ﴿لەبەردەم بیانیەکاندا توشی شکستمان مەکە﴾.. منیش بێدەنگ بووم.. کۆنگرەکە دەستی پێکرد.. دوو سەعات تێپەڕی.. کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات.. مۆڵەتم وەرگرت و هەستامەوە و نوێژم کرد.. دیمەنم جێگای سەرنج دان بوو..پاشان کاتی نوێژی عەسر هات.. هەستامەوە نوێژ بکەم.. کەسێکی ترم بینی لە تەنیشتمەوە نوێژدەکات و دەگری.. کاتێ لێبوومەوە لە نوێژەکە.. بینیم هاوڕێکەمە کە ڕەخنەی لە پۆشاکەکەم گرت.. فرمێسکەکانی سڕی و وتی: ماوەی چل ساڵە ئەمە یەکەمین نوێژە بیکەم!! سەرسام بووم! وتی: ماوەی چل ساڵە هاتووم بۆ ئەمەریکا و ڕەگەزنامەی ئەمەریکیم هەڵگرتووە، بەڵام یەك سوجدەم بۆ خوای گەورە نەبردووە.. کاتێ تۆم بینی نوێژی نیوەڕۆت کرد.. ئەو ئیسلامەم بیرکەوتەوە کە لەیادم کردبوو.. بە خۆمم ووت: ئەگەر ئەو لاوە ئەم جارە هەستێتەوە نوێژ بکات، دەبێ منیش نوێژ بکەم لەگەڵی.. خوای گەورە پاداشتت بداتەوە.. سێ ڕۆژ تێپەڕی... کۆنگرەکەش تێزی پزیشکەکانی پێشکەش دەکرد، ئاواتەخواز بووم یەکێکیان پرسیاری ئیسلامم لێ بکەن، بەڵام سەرقاڵ بوون... لە ئاهەنگی کۆتاییدا لێیان پرسیم بۆچی پۆشاکی پزیشکانت لەبەر نەکردووە؟ سوپاسی گرنگی پێدانیانم کرد و ووتم: ئەمە پۆشاکی ئێمەیە و خۆ ئێستا لە نەخۆشخانەدا نین، پاشان ویستم فرسەتەکە بقۆزمەوە بۆ بانگەوازکردنیان.. بەڕێوەبەرەکەش ئاماژەی کرد کە کاتەکەم تەواو بووە، منیش هات بە خەیاڵمدا کە نیشانەیەکی پرسیار دابنێم و دانیشم.. وتم: کۆنگرەیەك ملیۆنەهای تێ دەچێت بۆ توێژینەوە سەبارەت بە ناو لەشی مرۆڤ ئەی باشە ئەم لەشە لە بنچینەدا بۆچی دروست کراوە!!؟ پاشان خەندەیەکم کرد و دانیشتم.. بەڕێوەبەریش هەستی بە سەرسامی ئامادەبوان کرد و ئاماژەی بۆ کردم کە بەردەوام بم لەسەر قسەکانم.. منیش قسەمکرد سەبارەت بە ڕاستەقینەیی ژیان و ئامانج لە دروست بوون و کۆتایی دنیا.. کاتێ قسەکانم تەواو بوون.. چوار پزیشکی ئافرەت هەستانەوە و موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند.. سوپاس بۆ خوای گەورە.

## ٢١- ﴿نه خۆڕازاندنەوە و نەبۆن،و تەنها کارکردن لەگەڵ ئافرەتان﴾

پێی وتم: سەفەرم کرد بۆ ئەوێ بۆ چارەسەر.. ﴿سارە﴾ پەرستاری تاقیگەبوو لە نەخۆشخانەکە... هەموان دەیانناسی و ڕازانەوەکەیان دەبینی و بۆنی عەترەکەیان دەکرد... بینیمی منیش فایلەکەم هەڵگرت و خەندەیەکم کرد... سەرم داخست، وتی: چۆنی فلان، چیتە؟ بێدەنگ بوو... شیکردنەوەکە تەواو، بەداخەوە ڕۆشتە دەرەوە بە ڕازاوەیی و جورئەتەوە.. هەستم کرد کە ئەوە هەنگاوێکە لە هەنگاوەکانی شەیتان.. شەیتان پێی وتم: ژمارەی مۆبایلەکەتی بەرێ و ئەگەر پەیوەندی پێوەکردیت ئامۆژگاری بکە!! ئای ئیبلیسی نەفرەتی چەندە بیرۆکەکانت ڕازاوەن! چەند خولەکێ ئامۆژگاری بکەم و پاشان لەگەڵیدا بڕۆمە زیندانی شەیتانەوە... بڕیارمدا کتێبێکی کاریگەری بەدیاری پێ بدەم.. لە سەرەتاکەیدا نوسیم: خوشکی خۆم!! پێغەمبەر (د.خ) ئاگادارمان دەکاتەوە لە ئافرەتانی سافیرەی بێ پۆشتە کە ناچنە بەهەشتەوە و بۆنیشی ناکەن... ئەو ئافرەتانەی پۆشاکی سەرنج ڕاکێش دەپۆشن و ئەو ئافرەتەی بۆنی لەخۆی داوە و نمایشی بۆنەکەی دەکات.. ئایا حەزدەکەیت بەهەشتت لەدەست بچێ بەهۆی ڕازاندنەوەیەکەوە کە غەیری تۆ لەزەتی لێ دەبینێ؟! مەسەلەکە مەترسیدارە و بەو ئاسانیە تێ ناپەڕێ... ڕۆشتم بۆ نەخۆشخانە... چووم بۆ تاقیگە، نەمبینی.. چەند ساتێکی نەخایاند هات و ووتی: چۆنیت.. ووتم: سوپاس بۆ خوا.. فەرموو.. کتێبەکەم پێدا.. سەری جوڵانەوە و سوپاسی کردم و منیش مۆڵەتم خواست و ڕۆشتم.. گوێم لەچەند کەسێکەوە بوو کە منیان بینی دەیان ووت: خوای گەورە پاداشتت بداتەوە... پاشان هاتمەوە بۆ تەواوکردنی پشکنینەکان، ڕاکشام لەسەر ڕایەخی تاقیگەکە و پەرستارێ هات بۆلام! سەرسام بووم، کوا سارە!! لە پاڵیشماندا پەردەیە هەبوو جیای دەکردینەوە لە بەشی ئافرەتان.. هەر کە ناوی خۆمم ووت، گوێم لێبوو لەپشت پەردەکەوە وتی: خوای گەورە پاداشتت بداتەوە.. پاشان ڕەت بوو بە لاماندا.. حیجابێکی پۆشیبوو، کە زینەتی داپۆشیبوو، نە خۆدەرخستن و لەنجەولار و نە بۆنی عەتر... تەنها لەگەڵ ئافەرتاندا کاری دەکرد..

# ٢٢- ﴿موسڵمان بونی بەڕێوەبەری كۆمپانیایەكی گەورەی ئەمەریكی﴾

یەكێ لەبرا پاكستانیەكان –ناوی...... بوو– لە كۆلێژی ڕاگەیاندن و بانگەواز، لە گەشتێكی بانگخوازیدا لە تەنیشت بەڕێوەبەری كۆمپانیایەكی گەورەی ئەمەریكیدا دانیشتبوو، لە میانی گەشتەكەدا بەڕێوەبەرەكە داوای پێكێك عارەقی كرد... ئەمیش داوای پەرداخێ ماستاوی كرد، و بەشێوەیەكی جوان تەماشای پیاوەكەی كرد و پێی ووت: بۆچی لێم ناپرسیت من بۆ داوای ماستاوم كرد؟ بەڕێوەبەرەكە وای زانی سوعبەت چیە و وتی: بۆچی ماستاوت داواكرد؟ وتی: چونكە من موسڵمانم.. هەردوكیان بێدەنگ بوون.. براكە دوای كەمێك وتی: بۆچی دەربارەی ئیسلام پرسیارم لێ ناكەیت؟ پیاوەكە جارێكی تر پێكەنی و دەربارەی ئیسلام پرسیاری لێ كرد؟ ئەویش باسی ئیسلامی بۆ كرد هەتا خەریك بوو فڕۆكەكە دەنیشتەوە.. پیاوەكەش كارتێكی دەرهێنا و ناونیشانی خۆیی بە تەواوەتی پێدا و بانگی كرد بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ بۆ ڕۆژی داهاتوو.. تا قسەكانی بۆ تەواو بكات لەگەڵ خێزانەكەی،ئەو بەڕێزە لەگەڵ برایەكی تردا ڕۆشت و ڕۆژێكی تەواو لەگەڵیاندا دانیشتن، ئەوان پرسیاریان دەكرد و ئەمیش وەڵامی دەدایەوە.. هەتا پیاوەكە لە كۆتاییدا ووتی: بەخوا خوای گەورە لێتان دەپرسێتەوە بۆچی بێدەنگن و ئەمەش ئاینەكەتانە؟ بۆچی بەبیری ئەم خەڵكەی ناهێننەوە؟ بەخوا هەست دەكەم نێوان من و ئیسلام تاڵە مویەكیش نیە.

## ٢٣-﴿هیدایەتی باوكێك بەهۆی كوڕە بچوكەكەیەوە﴾

لاوێكی بچوك لە تەمەندا، خوای گەورە هیدایەتی دابوو، ماڵەكەیان پڕ بوو لە تاوان و سەرپێچی.. باوكی قیبلەی نەدەزانی.. ویستی بانگی بكات بۆلای خوا، باوكیشی وەڵامی نەدەدایەوە... بۆیە ڕۆشت بۆلای ئیمامی مزگەوت و گریا لەلایدا و ووتی: بەڕاستی باوكم سەرپێچی خوا دەكات و ئاگای لەنوێژكردن نیە... منیش هەوڵمداوە بانگی بكەم بۆ هیدایەت و ئەویش وەڵامی نەداومەتەوە، ئەی چی بكەم؟ مەلاكەش وتی: كاتێ دەگەیتە سێیەكی كۆتایی شەو دەستنوێژ بگرە بۆ نوێژ و پاشان دوو ڕكات نوێژ بكە.. پاشان داوا لەخوای گەورە بكە و بپاڕێرەوە كە هیدایەتی باوكت بدات.. كوڕە گەنجەكەش هەموو شەوێ هەڵدەستا بەوكارە.. شەوێكیان كوڕەكە هەستا تاوەكو شەونوێژ بكات.. باوكەش دوای بەسەربردنی كاتێكی زۆر لە گوناه و تاوان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و كەس ئاگای لێی نەبوو.. هاتە ماڵەوە لە كاتێكدا هەموان خەوتبوون.. گوێی لەدەنگی گریانەوە بوو لە یەكێ لە ژوورەكانەوە.. نزیك بوویەوە و تەماشای كرد.. دەبینێ كوڕە بچوكەكەیەتی دەگری.. نزیك بوویەوە لێی تا گوێی لێ بگرێ، گوێی لە كوڕەكەیەوە بوو كە دەستەكانی بەرز كردۆتەوە و دەپاڕێتەوە: خوایەگیان ڕێنمایی باوكم بكەیت.. خوایەگیان سینەی فراوان بكەیت بۆ ئیسلام، خوایەگیان دڵی باوكم بكەیتەوە بۆ ڕێنمونی.. باوكەش بە بیستنی ئەو وشانە داچڵەكی و تەزوو بەلەشیدا هات و لە ژوورەكە هاتە دەرەوە و خۆی شۆرد، پاشان گەڕایەوە و كوڕەكەش هەر دوعای دەكرد.. ئەمیش بە تەنیشت كوڕەكەیەوە نوێژی دابەست و كوڕەكەش هەر دەپاڕایەوە: خوایەگیان هیدایەتی باوكم بدەیت.. باوكەش دەیوت ئامین.. خوایەگیان دڵی باوكم بكەیتەوە بۆ هیدایەت دان.. باوكەش دەیوت: ئامین.. كوڕو باوك دەستیان كرد بە گریان.. كاتێ نوێژەكە تەواو بوو كوڕەكە لایكردەوە تەماشای كرد باوكیەتی دەگری، باوەشیان كرد بەیەكدا و تا بەرەبەیان دەگریان... بەڵێ ئەوە سەرەتای هیدایەتی باوكی بوو...

## ٢٤- ﴿تەوبەی سەرخۆشێك... چیرۆكێكی كاریگەر﴾

پیاوێك دەناسم، لەگەڵیدا بووم.. لە تەمەنی حەفتاساڵیدا بووم.. بەسەرهاتی خۆیی بۆ باسكردم لە مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) و بەڕۆژوو بوو، موعتاد بوو بە خواردنەوەی ئارەقەوە- پەنا بەخوا- هەر لە تەمەنی پانزە ساڵیەوە هەتا گەشتبوویە تەمەنی چل ساڵی...... ڕۆژێكیان چووە لای پزیشك، بۆی دەركەوتبوو كە عارەق هەناسەی لێ بڕیوە، پەنا بەخوا پزیشك پێی ووت: ئەی فلان هیچ دەرمانێك نیە كە چارەسەری تۆ بكات.. پزیشكەكە بە دەستەوسانی و سەرسامی وەستابوو... بە زمانی حاڵی خۆی وتی: كاتێ پزیشكەكە وای پێ وتم وام دەزانی لەخەو هەڵدەستم، پێم ووت: ئایا چارەسەرت لەلا نیە؟ وتی: هیچ چارەسەرێكم لانیە.. منیش وتم: بەڵكو چارەسەر و دەرمانیش هەیە.. هەر ئەوكاتە هاتمە خوار و بڕیارمدا تەوبە بكەم و بەڵێ تەوبەم كرد و نوێژم كرد لە مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ)، ڕۆشتم بۆماڵەوە و ئیحرامی تەوبەكردنم بەست بۆلای خوا.. پاشان ڕۆشتم بۆ مەككە بە كاروانێكی سێ ڕۆژە گەشتمە مەككە لە تاریكایی شەودا پێش پارشێو.. كاتێ لە عەمرەكردن بوومەوە، هاتم و پەنام برد بۆ خوای گەورە و گریام و پاڕامەوە و وتم: خوایەگیان یان شیفام بۆ بنێرە یان گیانم بكێشە بە تەوبەوە... وتی: لە ناخمدا هەستم بە شتێك كرد كە قسەم لەگەڵدا دەكات كە ئاوی زەمزەم بخۆمەوە... منیش ڕۆشتم بۆ لای ئاوی زەمزەمەكە و سەتڵێكم لێ هەڵگرت – لەو ڕۆژگارەدا ئاوی زەمزەم بە سەتڵ بوو- بەهۆی برسێتیەوە هەمویم خواردەوە، كاتێ ئاوەكەم خواردەوە، پێچ بە سكمدا دەهات، هەستم بە ڕشانەوە كرد و ڕامكرد، لەبەردەم دەرگای ئیبراهیم هەرچی لە سكمدا بوو فڕێمدا، پارچە خوێنێكی ڕەشی تێدا بوو، كاتێ فڕێمدا هەستم بە حەوانەوەیەكی مەزن كرد، وتی: هەستم بە مەزنی خوای گەورە كرد، و دڵنیابووم لەوەی هەر كەسێ پەنا بگرێت بە خوا بێ هیوا و ئومێد نابێت.. و ئەوەندە خێر و چاكە لەلایەن خواوە هەیە كە بە خەیاڵی هیچ كەسدا نایەت.. جارێكی تر گەڕامەوە و بە دڵنیاییەكی مەزن و باوەڕێكی زۆرەوە گریام و لەخوای گەورە پاڕامەوە: ﴿خوایەگیان یان شیفام بۆ دەنێریت یان دەممرێنیت لەسەر ئەم تەوبەیە﴾. ووتی: دەرونم جارێكی تر پێی وتم كە ئاوی زەمزەم بخۆمەوە، منیش جارێكی تر خواردمەوە، وەكو جاری پێشوم لێهاتەوە، ڕامكرد هەتا گەشتمە

بەر دەرگا، ڕشامەوە، بەڵام وەکو جاری یەکەم ناڕەحەت نەبووم، جاری سێیەم بە باوەڕ و دڵنیاییەکی زیاترەوە گەڕامەوە و دوعام کرد و پاڕامەوە، هەستم کرد کە دەمەوێ ئاوی زەمزەم بخۆمەوە، منیش ڕۆشتم و دابەزیم و ئاوی زەمزەمم خواردەوە.. سکم کەوتە جوڵە، ئاوێکی سپی هاتە دەرەوە وەك ئەوەی لاشەمی شۆردبێ... ووتی: هەستم بە حەوانەوەیەکی سەیرکرد، کە پێشتر هەستم پێنەکردبوو، پاشان گەڕامەوە و لەخوا پاڕامەوە.. خوای گەورە سەکینەت و ئارامی بۆ ناردم و خەوتم، بە بانگی بەیانی خەبەرم بوویەوە... وتم: بەخوا تا سێ ڕۆژ ئێرە بەجێ ناهێڵم.. هەر دەگریام و داوای لێبوردن و عافیەتم دەکرد و ئاوی زەمزەمم دەخواردەوە.. وتی: پاشان گەڕامەوە بۆ شاری مەدینە.. کاتێ تەواو چاك بوومەوە چووم بۆلای پزیشکەکەم کە چارەسەری بۆ دەکردم... تەماشای ڕوخساری کردم، کاتێ پشکنینی بۆ کردم دەستی دەلەرزی و بڕوای نەدەکرد، پاشان وتی: ئەی عبدالله، بەڕاستی خوای گەورە شتێکی پێ بەخشیویت کە لە عورفی پزیشکاندا ئەستەمە و مومکین نیە.. پاشان ئەو پیاوە بۆ ماوەی سی ساڵی تر ژیا.. دەیوت: ئێستە کە ئەمڕۆ من قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم بەڕۆژووم و عاقیبەت خێری لەخوای گەورە دەخوازم.. بە عاقیبەت خێری وەفاتی کرد..

## ٢٥- ﴿ڕۆژانێك ژیانمی گۆڕی﴾

خاوەنی چیرۆکەکە ئافرەتێکە و دەڵێ: پێش ئەوەی بەسەرهاتی خۆم باس بکەم بۆتان، بەڵام دەمەویست بە هەموو ئەو مرۆڤانە بڵێم کە دەیخوێننەوە، بۆ نزیکی مرۆڤ لە پەروەردگاریەوە پێوەرێك هەیە بۆ گەرمی، ئەندازەی نزیکی و دووری لە پەروەردگاریەوە دەزانێ، چیرۆکەکەشم دەست پێ دەکات کاتێ کە منداڵ بووم، باوکم دایدەنام تا گوێم لە سورەتە کورتەکانەوە بێت بە دەنگی مامۆستا (عبدالباسط عبدالصمد ) –رەحمەتی خوای لێ بێ– من کاتێ گوێم لە دەنگیەوە دەبوو دەگریام، نازانم بۆچی، تەنانەت بە هۆی ئەو دەنگەوە سورەتە کورتەکانم لەبەرکردبوو، کاتێ قورئانیشم دەخوێندەوە، بەهەمان شێواز دەمخوێندەوە.. بەو شێوەیە ڕۆژگارم تێپەڕاند هەتا تەمەنم گەشتە نزیکەی چواردە ساڵ.. تا ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە کە ویستی خوای گەورە وابوو ئەوەم بێتەوە یاد کە ئەم گەردوونە پەروەردگارێکی هەیە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، توانای هەیە مرۆڤەکان بژێنێت و بیانمرێنێ.. من لە پۆلی سێی ناوەندی بووم، لە گەڵ سەرەتای ساڵی خوێندن، هەواڵی وەفاتی برا گەورەکەمان پێگەشت، چونکە من و باوکم و دایکم لە شارێکی تر بووین.. ئەو هەواڵە بۆ من وەکو گەردەلول وابوو، بەڵام زۆر نەگریام، دڵم بە تەواوی ڕەق بووبوو، لەو ساتەدا گوێم لەقورئان نەدەگرت و نوێژم نەدەکرد، و زۆر دووربووم لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی.. کاتێ گەڕاینەوە بۆ خاکی نیشتیمانی خۆمان، براکەم کۆچی کرد بوو بۆ ئەو دنیا، ئەوە یەکەمین ڕۆژم بوو کە دابەزیمە میسر و حیجابم پۆشی بوو، من کاتێ دەگەشتمە میسر یەکەمین شتێ کە لامدەبرد حیجابەکەم بوو.. ڕۆشتین بۆ گۆڕستان بۆ سەدانی، تەنها لەوێ دەستم کرد بە گریان و هەموو شتێکم یاد کردەوە، لەو کاتەدا بۆم دەرکەوت کە ئاییندە و سەرەنجامی هەمومان هەر مردنە، ئەو کاتە بیرم کردەوە چی بکەم ئەگەر من لە جێگای ئەوبم، چی بکەم ئەگەر بەسەر پردی ﴿سراط﴾دا بپەڕمەوە، ئەو ڕۆژە و بۆ یەکەم جار مانای ﴿سراط﴾ تێگەشتم.. هەر ئەو ڕۆژە بڕیارمدا حیجاب بپۆشم و پابەندبم پێیەوە.. ئەوەی کە هانیدام بۆ ئەوە و دامەزراوی کردم لەسەری براکەم بوو.. سوپاس بۆ خوا پابەند بووم بە ئاکاری ئیسلامیەوە... ... دوای چونم بۆ کۆلێژ ئاشنا بووم بە کۆمەڵێ هاوڕێی دڵسۆز کە لە

**تیاچونەوە بردمیان بەرەو دیاریکردنی ئامانج، لەگەڵیاندا فێری مانای خۆشەویستی بۆ خوا و مانای دڵسۆزی لە کاردا و مانای گریان لە ترسی خوای گەورە بووم.. ئەوەی کە دامەزراوی کردم لەسەر ئەوە براکەم بوو، منیش ئاواتەخوازم کە بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە ڕێنمایی کردم بۆ ڕێگای ڕاست بەو شێوەیەش خوای گەورە ڕێنمایی هەموان بکات، پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە دابێت کە پەشیمانی سودی نابێت.**

## ٢٦- ﴿عبدالحليم حافظ: ئەی (سەعید) بەخوا من ئاسودە نیم﴾

لە شاری عەمانی پایتەختی ئەردەن بە دیداری گەیشتم، هەر کە گوێبیستی وتەکانی بووم، کاریگەر بووم بە قسەکانی بەهۆی ڕەوان بێژییەوە، وتاری بۆ نوێژکەران دەدا دوای نوێژ، زمانی زۆر شیرین بوو، هەر کە گوێم لە وتارەکەیەوە بوو بریارمدا کە دانیشم تا سڵاو لەو بانگخوازە بکەم.. چاوەڕوانیم کرد، زۆری نەخایاند، پاشان بینیم ڕوخسارە گەشاوەکەی کە نوری ئیمان و ڕێنمایی لێ دەدرەوشایەوە، سڵاوی لێ کردم، پاشان لە تەنیشتم دانیشت، دەیزانی کە من خەڵکی ئەردەن نیم... بە ئەدەبەوە قسەی کرد لەگەڵمدا و لێی پرسیم لە چ وڵاتێکەوە هاتوویت؟ منیش پێم ووت: لە سعودیەوە، چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك، پاشان ووتی: تۆ لەو دورگەیەوە هاتویت کە خوای گەورە نوری ئیسلامی تیا گەشاندەوە لەسەر دەستی پێغەمبەری مرۆڤایەتی، پاشان پرسیاری لێ کردم: ناوت چییە؟ منیش پێم ووت.. ئەویش وتی من ناوم ﴿سەعید﴾ە، و پێی وتم لە وڵاتی مەغریبی عەرەبییەوە هاتووە، هاتووە بۆ ئەردەن بە مەبەستی بانگەواز بۆ لای خوا، بۆچی لە وڵاتی خۆت لە نێو کەس و کاری خۆتدا سەرقاڵی کاری بانگەواز کردن نەبویت؟ وتی: برای بەڕێزم، من لەو کەسانە بووم کە گۆرانی بێژ بووم، و نزیك بووم لە کۆشکی پاشایەتیەوە.. لە وڵاتی خۆمان برایەکی باوکیم هەبوو، بانگخواز بوو، زۆر هەوڵیدا لەگەڵمدا، بەڵام بێ سوود بوو، لە خەویشدا هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستی خۆمم بینی کە مردن ئێمەی جیاکردەوە، ئەویش ﴿عبدالحليم حافظ﴾ بوو، لە ناو گۆڕدا بوو، پێی ووتم: ئەی ﴿سەعید﴾ بەخوا من ئاسودە نیم، منیش لە خەوەکەم هەستام بە ترس و تۆقینەوە، بەڵام بە خۆمم ووت: هیچ نیە خەیاڵات و زیندەخەوە، بەڵام هەمان خەوم لە شەوی دووەم و سێیەمدا بینیەوە، بۆم دەرکەوت کە ئەوە ئاگادارکردنەوەیە لە لایەن خوای مەزنەوە، بۆیە بە خۆمدا هاتمەوە دوای ئەوەی بۆم دەرکەوت کە من لەسەر ڕێگایەکم، جیاوازە لە ڕێگای خوای گەورە، بۆیە پەیمانمدا بەخۆم کە دەنگم بگەیەنم بە پێی توانام، بۆ ئەوانەی کە بە گۆرانی گوێیان لە دەنگمەوە دەبوو.. ئەوەتا من ئێستا بەو وڵاتانەدا دەگەڕێم کە بۆ گۆرانی وتن دەگەڕام پێیاندا، بەڵکو خوای گەورە ڕەحمم پێ بکات.. پاشان دەستی کرد بە گریان، منیش لەگەڵیدا گریانم، خۆشەویستانم، تەماشای چیرۆکی ئەم بانگخوازە بکەن چۆنە.. ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ

اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ} ﴿الزمر : ٥٣﴾. واته: { تۆ، ئەی موحەممەد! بڵێ بەو بەندانەم کە زیادەڕۆییان کردووە لەسەر نەفسی خۆیان لە گوناهـ کردن و بێ فەرمانیی خوادا: نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، خوا لە هەموو گوناهێ خۆش ئەبێ بۆ هەرکەسێ کە باوەڕی هەبێ کە خوا گوناهـ بەخش و میهرەبانە }.

## ٢٧- ﴿دۆزەخ ٣٠٠ کم﴾

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکاتی خواتان لێبێت، قەدەری خوا وابوو دوێنێ لە یەکێ لە مزگەوتەکاندا نوێژی عیشا بکەم.. دوای نوێژەکە یەکێ لە مامۆستاکان هەستا کە مردوو شۆر بوو.. ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕاینەوە.. ئەو کەسە بۆی گێڕابوویەوە کە ڕووداوەکەی بەسەر هاتبوو.. وتبووی: سوێند بەو خوایەی کە پەرستراو نیە بێجگە لەو، لە شاری ﴿ریاض﴾ دەرچووم، و بەخەیاڵمدا نەهاتووە یەك پەرستش بۆ خوای گەورە ئەنجام بدەم.. ووتی: ئێمە کۆمەڵێك گەنج بووین.. لە شاری ﴿ریاض﴾ ەوە بەرەو شاری ﴿الدمام﴾ دەڕۆشتین.. ڕەت بووین بە لای تابلۆیەکی سەر شەقامەکەدا، هاوڕێکانم خوێندیانەوە: ﴿دەمام: ٣٠٠ کم﴾ منیش پێم ووتن نوسراوە ﴿دۆزەخ: ٣٠٠کم﴾.. ئەوانیش پێدەکەنین پێم و کردبوویان بە نوکتە بەسەرمەوە.. کات تێپەڕی و هەر پێدەکەنین.. منیش سەرسام بووم کە چۆن وا نوسرابوو.. هاوڕێکانم وتیان ئەوە تابلۆی دووەمە.. خەریکە نزیك دەبینەوە ﴿دەمام ١٥٠کم﴾ وتم ﴿دۆزەخ ١٥٠ کم﴾ پێکەنین و وتیان تۆ شێتی.. وتم: سوێند بەو خوایەی پەرستراو نیە بێجگە لەو من وای دەبینم کە نوسراوە ﴿دۆزەخ ١٥٠ کم﴾ وەك جاری یەکەم هەر پێدەکەنین.. وتیان خەریکە بێزارمان دەکەیت.. منیش بێدەنگ بووم.. و زۆر بێتاقەت بووم.. و هەر بیرم دەکردەوە.. لە گەڵ پێکەنیندا نزیك بووینەوە لە تابلۆیەکی تر ووتیان ﴿دەمام ١٠٠کم﴾ منیش وتم بەخوای گەورە من ئەیبینم نوسراوە ﴿دۆزەخ ١٠٠ کم﴾.. وتیان: واز لەو وڕێنەیە بێنە، هەر لە سەرەتای سەفەرەکەوە ئێمەت بێتاقەت کرد.. ووتم دامبەزێنن با من بگەڕێمەوە بۆ ﴿ریاض﴾ وتیان: تۆ شێتیت..

– دامبەزێنن، من دەگەڕێمەوە.. بەخوا من ئەم ڕێگایە لەگەڵ ئێوەدا تەواو ناکەم..

ئەوانیش دایان بەزاندم.. چوومە سەر سایدی ئەو بەر.. دانیشتم و ئامارژەم دەکرد بەڵکو کەسێك بوەستێ بۆم.. کات درێژەی کێشا و کەس نەوەستا، پاش ماوەیەك نەبێت شۆفێری ترێلەیەك وەستا، منیش سواربووم لەگەڵیدا.. شۆفێرەکە زۆر دڵتەنگ و بێدەنگ بوو.. هیچ قسەی نەدەکرد.. پێم ووت: برای بەڕێزم ئەوە چیتە..با قسەیەك بکەین.. خۆ دەمەقاڵێت نەبووە.. ووتی: نەبەخوا بەڵکو پێشی کەمێك ڕەت بووم بەلای

ڕووداوێکی هاتووچۆدا.. بەخوا لەژیانمدا لەوە خراپترم نەبینیوە.. ووتم: خێزان بوون یان لاوبوون... ووتی: نەخێر لاو بوون.. ئۆتۆمبێلەکەیان... ﴿هەمان وەسفی ئەو ئۆتۆمبێلەی کرد کە بە هاوڕێکانم بوو﴾ منیش تۆقیم.. ووتم: توخوا بەڕاستە.. بۆم دەرکەوت کە خوای گەورە گیانی هاوڕێکانمی کێشاوە دوای ئەوەی لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیم و ئەوانیش کەوتبوونە ڕێ.. ووتی: سوپاسی خوام کرد کە لە نێویاندا ڕزگاری کردم.. ئیتر نازانم ئایندەیان دۆزەخە.. وەك چۆن من تابلۆکانم دەخوێندەوە.. من ئاواتی ئەوە ناخوازم، بەڵام هاوڕێی من بوون و دەزانن گوناهی سەرپێچیەکانیان چۆن بوو.. پەروەردگارا سوپاس بۆ تۆ.. سوێن بەو خوایەی کە پەرستراو نیە بێجگە لەو، کاتێ لە شاری (ریاض) دەرچووم بەخەیاڵمدا نەدەهات چاکەیەك بکەم.. مامۆستاکە ووتی: ئێستا ئەو پیاو چاکێکە و چاکەکارە دوای ئەوەی بەو ڕووداوە هاوڕێکانی لەدەستدا.. پاش ئەوە تەوبەی کرد.. برای بەڕێزم دەڵێم: ئایا بوەستێ هەتا چوار یان پێنج لە هاوڕێیانت بەرەو دۆزەخ بڕۆن هەتا تۆ پەند وەربگریت.. چوزانیت.. لەوانەیە بەهۆی مردنی هاوڕێکانیشتەوە تەوبە نەکەیت.. یان لەوانەیە هاوڕێکانت بەهۆی مردنی تۆوە لەسەر سەرپێچی و خراپەکاری تەوبە بکەن.. سوێند بەو خوایەی کە پەرستراو نیە بێجگە لەو، دوێنێ ئەم بەسەرهاتەم بیست.. کە مامۆستا/سلیمان الشهري ﴿مردوشۆر﴾ گێڕایەوە... خوایەگیان مەمانکە بە پەند بۆ خەڵکی، وامان لێبکە پەند لە ڕووداوی خەڵك وەربگرین.. کە لە دەوروبەرمان ڕوودەدات.. پەروەردگارا... ئامین...

## ٢٨- ﴿چیرۆكی فاتمه لەگەڵ دایكی﴾

فاتمه دانیشتبوو، كاتێك دایكی پێشوازی له دراوسێكەیان كرد كه هاتبوو بۆ سەردانی ئەمان.. دایكی خەریكبوو دڵی دەتەقی، كاتێ كچەی خۆیی بینی له شوێنی خۆی ناجوڵێ و هەڵناسێ لەگەڵیدا بۆ پێشوازی له دراوسێ چاكەكەیان، هەرچەندە دراوسێكەیان دەستی درێژكردبوو بۆ فاتمه بۆ تەوقەكردن.. بەڵام فاتمه گوێی نەدایه و دەستی درێژ نەكرد بۆی.. وازی لێهێنا بۆ ماوەیەك.. دەستی درێژ كردبوو لەبەردەم سەرسام بوونی دایكی كچەكەدا كه هەر ئەوەندەی لەتوانادابوو هاوری كرد: هەسته و پێشوازی له خاتو﴿.......﴾ بكه.. فاتمەش به تەماشایەكی گوێ پێنەدان وەڵامی دایەوە، بەبێ ئەوەی له شوێنی خۆی بجوڵێ.. وەك ئەوەی گوێی له وتەكانی دایكی نەبووبێت.. دراوسێكەشیان هەستی به ئیحراجیەكی زۆر كرد بەرامبەر بەو ڕەفتارەی فاتمه، هەستی كرد ڕاستەوخۆ سوكایەتی كردنه پێی... و ئیهانەكردنیەتی.. دەستی درێژی خۆیی كێشایەوە و ڕووی وەرچەرخاند و ویستی بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆیان و ووتی: وابزانم من له كاتێكی نەگونجاودا سەردانم كردن! لەو كاتەدا فاتمه له شوێنی خۆی ڕاپەڕی، و دەستی دراوسێكەی خۆیانی گرت و سەری ماچكرد و دەیوت: لێم ببورەو بمبەخشه خاتوو﴿......﴾ بەخوا من نەمدەویست سوكایەتی بەتۆ بكەم... دەستی بەڕێز و خۆشەویستیەوە گرت و داوای لێكرد كه دانیشێ و ووتی: ئایا دەزانی خاتوو ﴿......﴾ من چەندە تۆم خۆشدەوێت و ڕێزت لێ دەگرم؟! فاتمه سەركەوت له دڵ هێنانەوەی دراوسێكەیان و ئاشتكردنەوە، كه ئەو تێنەدەگەیشت لەو هەڵوێستەی.. بەڵام دایكی خۆی گرتبوو لەبەردەم میوانەكەدا توڕە نەبوو له كچەكەی.. دراوسێكەیان هەستاو خواحافیزی كرد.. فاتمەش یەكسەر هەستایەوە و دەستی درێژ كرد بۆی.. به دەستەكەی تریشی دەستی ڕاستی دراوسێكەی گرت... تا نەیەڵێ دەستی بۆ درێژ بكات و ووتی: پێویسته دەستم ئاوا بوەستێنم بەبێ ئەوەی تۆ دەستت درێژ بكەیت هەتا دەرك بكەم به ناشرینی هەڵوێستی خۆم بەرامبەر به تۆ.. بەڵام دراوسێكەیان فاتمەی له ئامێز گرت و سەری ماچكرد و ووتی: كچی خۆم قەیناكا... تۆ سوێندت خوارد كه مەبەستت ئازاردان نەبوو.. هەر كه دراوسێكەیان ڕۆشت.. دایكی به توڕەبوونێكی شاراوەوە ووتی: چی وای لێكردیت ئەو هەڵوێسته

بنوێنیت؟ وتی: بەخوا دەزانم دایکە گیان من بووم بەهۆی ئیحراجکردنی تۆ، لێم ببورە.. دایکیشی وتی: دەستی بۆ درێژ کردیت و تۆش لەشوێنی خۆت هەڵنەسایت و دەستت درێژنەکرد تا تەوقەی لەگەڵدا بکەیت؟! فاتمە وتی: دایەگیان تۆش هەروا دەکەیت! دایکی هاواری کرد: فاتمە من وادەکەم؟! وتی: بەڵێ بە شەو و بە ڕۆژ وادەکەیت.. دایکیشی بە توندی وەڵامی دایەوە: من بەشەو و بەڕۆژ چی دەکەم؟ فاتمە وتی: ئەو دەست بۆ تۆ درێژ دەکات و تۆ دەست بۆ ئەو درێژ ناکەیت! دایکی بە توڕەبوونەوە هاواری کرد: ئەو کەسە کێیە کە دەستی بۆ من درێژ ئەکات و من دەست درێژ ناکەم بۆ ئەو؟! فاتمە وتی: دایەگیان، خوای گەورە!!.. خوای گەورە دەستی درێژ ئەکات بە ڕۆژدا تا تەوبە بکەیت.. و بەشەویشدا دەستی درێژدەکات تا تەوبەبکەیت..و تۆش تەوبە ناکەیت..و دەستت درێژناکەیت بۆی، پەیمانی تەوبەکردن نادەیت... دایکی بێدەنگ بوو، قسەی کچەکەی سەرسامی کرد، فاتمە درێژەی دا بە قسەکانی: ئایا دڵتەنگ نەبوویت دایەگیان کاتێك دەستم درێژ نەکرد بۆ تەوقەکردن لەگەڵ دراوسێکەمان، دەترسایت وێنەی جوانی من لەبەرچاوی ئەودا لەکەدار ببێت.. دایەگیان من هەموو ڕۆژێ دڵم تەنگ دەبێت کاتێك دەتبینم دەستی تەوبەکرن درێژناکەیت بۆ خوای گەورە کە ئەو زاتە دەستی بە شەو و بە ڕۆژ درێژ دەکات.. پێغەمبەر (د.خ) لە فەرموودەی صەحیحدا دەفەرموێ: (( إنَّ الله تَعَالَى يَبْسُطُ يَدَهُ بالليلِ لِيَتُوبَ مُسيءُ النَّهَارِ ، ويَبْسُطُ يَدَهُ بالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسيءُ اللَّيلِ ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِها )) رواه مسلم.. واتە: ﴿بە ڕاستی خوای گەورە بەشەودا دەستی دەکاتەوە تا تاوانباری ڕۆژ تەوبە بکات، و دەستی بە ڕۆژدا دەکاتەوە تا تاوانباری شەو تەوبە بکات.. هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت(واتە تا ڕۆژی قیامەت)﴾.

دایەگیان ئایا بینیت.. پەروەردگارمان دەستی دەکاتەوە لە هەموو ڕۆژێکدا دووجار.. تۆش دەستت لە ئاستی ئەودا دادەخەیت.. و تەوبە ناکەیت لە ئاستی ئەودا.. چاوانی دایکی پڕبوو لە فرمێسك.. فاتمە بەردەوام بوو لە سەر قسەکانی و زیاتر قسەی بۆ دەهات: دایەگیان من لە ئایندەی تۆ دەترسم کە نوێژ ناکەیت، لە کاتێکدا یەکەمین شتێ کە لە قیامەتدا لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت نوێژکردنە.. و دڵتەنگ دەبم کاتێك کە دەتبینم لەماڵ دەچیتە دەرەوە و بەبێ ئەوەی حیجاب بپۆشیت کە خوای گەورە

فەرمانی پێداویت.. ئایا ئیحراج نەبوویت بە هۆی هەڵسوکەوتی منەوە بەرامبەر دراوسێکەمان.. دایەگیان من لەبەردەم هاوڕێکانمدا ئیحراج دەبم کاتێ پرسیاری سافیرەیی تۆم لێدەکەن، و خۆڕازاندنەوەت.. لە کاتێکدا من بالاپۆشم! فرمێسکی پەشیمانی بەردەوام بە ڕوومەتی دایکیدا دەهاتە خوارەوە، کچەکەش بەشداری کرد و فرمێسك تك تك لە چاوانی دەتکا.. پاشان هەستایەوە بۆ لای دایکی و بە توندی و بە سۆزەوە لەئامێزی گرت.. و ئەویش هەر دەیوت ﴿تەوبەم کرد و گەڕامەوە بۆلات پەروەردگارم.. تەوبەم کرد و گەڕامەوە بۆلات پەروەردگارم﴾ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللَّهُ﴾آل عمران/١٣٥.. وتە: ﴿کێ لە گوناهەکان خۆش دەبێت بێجگە لە خوا﴾.خوا دەتبینێ کاتێ تۆ ئەو وتانە دەڵێیتەوە و ئەوە دەبینێت کە ئێستە دێت بە خەیاڵتدا و چاوەڕوانی تەوبەی تۆیە.. تۆش بە تەوبەکردن نەبێت خۆت نیشانی پەروەردگاری خۆشەویستت مەدە.

## ٢٩- ﴿وێنای بکەن.. مەلایەك لە مەلها؟﴾

شێخ ﴿عَلي طَنْطَاوي﴾ ڕەحمەتی خوای لێ بێت وتی: لە گەڕەکەکەماندا مزگەوتێکی بچووك هەبوو مەلایەکی بە تەمەن ئیمامەتی تێدا دەکرد، ڕۆژێکیان مەلاکە لای کردەوە بە لای نوێژکەراندا، و ووتی پێیان: ئەوە بۆچی زۆربەی خەڵکی بە تایبەتی گەنجەکان نزیك نابنەوە لە مزگەوت و ڕێگای مزگەوت نازانن؟ نوێژکەرانیش ووتیان: ئەوانە لە مەلها و شوێنی سەماکردندان.. مەلاکە ووتی: مەلها و شوێنی سەماکردن چیە؟ یەکێ لە نوێژکەران ووتی: شوێنی سەماکردن هۆڵێکی گەورەیە و تەختەیەکی بەرزی تێدایە و ئافرەتانی نیمچە ڕووت سەما دەکەن و خەڵکیش بە چواردەوریەوە دانیشتون و تەماشای دەکەن.. مەلاکە ووتی: ئایا ئەوانەی تەماشایان دەکەن لە موسڵمانەکانن؟ ووتیان: بەڵێ. ووتی: (لاحول ولا قوە إلا بالله).. پێویستە ئامۆژگاری خەڵکی بکەین، ووتیان: مامۆستا ئایا لە سەماخانەدا ئامۆژگاری خەڵکی دەکەیت؟ ووتی: بەڵێ، وەرن لەگەڵم بۆ ئەو مەلهایانە، ئەوانیش هەوڵیاندا پەشیمانی بکەنەوە، و پێیان ووت: ئەوێ خەڵکانێکی خراپی تێدایە و گاڵتەت پێدەکەن و ئازارت دەیەن... ئەویش ووتی: ئایا ئێمە خێردارترین لە پێغەمبەر (د.خ).. مامۆستا دەستی یەکێ لە نوێژکەرانی گرت و کەوتە ڕێ.. کاتێ گەشتنە ئەو شوێنە، خاوەنی مەلهاکە لێی پرسین: چیتان دەوێ؟ مەلاکەش ووتی: دەمانەوێ ئامۆژگاری ئەوانە بکەین کە لە مەلهاکەدان.. خاوەنی مەلهاکە سەرسام بوو هەر تەماشای دەکردن و نەیهێشت بچنە ژوورەوە.. ئەمانیش هەر هەوڵیان دەدا بچنە ژوورەوە تا ناچار بوون بڕێ پارەیان دایە کە دەیکردە داهاتی ڕۆژێکی.. خاوەن مەلهاکەش ڕازی بوو، داوای لێکردن سبەینێش لەهەمان کاتدا بێنەوە! لاوەکە ووتی: سبەینێش من هەر لێرەم... یەکێ لە ئافرەتەکان دەستی کرد بە سەماکردن، و کاتێ تەواو بوو. پەردە دادرایەوە... پاشان پەردەکە لادرا، مامۆستایەکی خواناس دەرکەوت کە لەسەر کورسی دانیشتبوو.. بە ﴿بسم الله﴾ و ﴿الحمد لله﴾ و ﴿ستایش لەسەر پێغەمبەر (د.خ)﴾ دەستی پێکرد، پاشان دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵکەکە، کە هەموویان سەرسام بووبوون.. وایان گومان دەبرد ئەوەی کە دەیبینن شتێکی پێکەنیناویە.... کاتێ بۆیان دەرکەوت لە بەردەم مەلایەکدا دانیشتوون و ئەویش ئامۆژگاریان دەکات.. دەستیان کرد بە گاڵتە پێکردنی و

بەپێکەنین و گاڵتەوە دەنگیان بەرز دەکردەوە.. ئەویش گوێی پێ نەدەدان.. بەردەوام بوو لەسەر ئامۆژگاریەکانی هەتا یەکێ لە ئامادەبوان هەستا و خەڵکەکەی بێدەنگ کرد و داوای لێکردن گوێ بگرن و بزانن مامۆستا چی دەوێت و نیازی چیە.. بۆیە بێدەنگی و هێمنی باڵی کێشا بە سەر سەراپا هۆڵەکەدا.. تا وامان لێهات تەنها دەنگی مامۆستامان دەبیست.. وتانێکی پێشکەش کرد، کە پێشتر نەمانبیستبوو،، چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی بۆ خوێندینەوە، لەگەڵ چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) بەسەرهاتی تەوبەکردنی هەندێ لە پیاوچاکان.. لە وتەکانیدا ووتی: ﴿ئەی خەڵکینە ئێوە زۆر ژیاون و تاوانی زۆریشتان کردووە، ئایا لەزەتی ئەو تاوانانە بۆ کوێ چوو؟ لەزەتەکەی ڕۆشت و نامە ڕەشەکان مانەوە.. لە ڕۆژی دواییدا لێتان دەپرسنەوە سەبارەت بەو گوناه و تاوانانە.. ڕۆژێك دادێ هەموو شتێ بەهیلاکا دەچێت بێجگە لە خوای باڵادەست.. ئەی خەڵکینە ئایا تەماشای کردەوەکانی خۆتان کردووە و ئایا بەرەوکوێ دەتانبات؟ ئێوە لە دنیادا بەرگەی ئاگر ناگرن، کە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، دەی پێش ئەوەی کات بەسەر بچێت بگەڕێنەوە و تەوبەبکەن.. هەموو خەڵکەکە دەستیان کرد بەگریان.. مەلاکەش لە مەلهاکە هاتە دەرەوە و هەموو خەڵکەکەش بە دوایەوەبوون.. تەوبەکردنی ئەوان و هەروەها تەوبەکردنی منیش لەسەر دەستی ئەو مەلایە بوو، تەنانەت خاوەنی مەلهاکەش، تەوبەی کرد و پەشیمان بوو لەو کردەوانەی.

## ٣٠- ﴿تەوبەی هونەرمەندیٚ ناوی (زادان) بوو﴾

ئیسلام هات تا دەروونەکان پەروەردە بکات و بەهرەکانی ناخی مرۆڤ گەشە پێبدات.. ئەوانەی کە ڕەزامەندی خوای گەورەی تێدایە.. موسڵمانانی پێشین بەو شێوەیە بوون، کاتێ مرۆڤێکیان ببینیایە بەهرەی خۆیی بەکار بهێنایە بۆ شتێك کە تووڕە بوونی خوای تێدا بوایە، ئەوان دەهاتن و ئامۆژگاریان دەکرد بە باشترین شێوە{ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ} ﴿النحل : ١٢٥﴾واتە: { ئەی پێغەمبەر! ئەی ئیماندار! هەر بەڕێرانەو نەرم و قسەی خۆش و حیکمەت وئامۆژگاری شیرین و جوان خەڵك بۆ ڕێگای پەروەردگارت بانگ بکە، وبەچاکتر و باشترین شێوە قسەو گوفتوگۆیان لەگەڵ بکە، بەڕاستی پەروەردگاریشت باشتر بەحاڵی ئەوە دەزانێت کە لەڕێی ئەو لایداوە ، وزاناتریشە بە حاڵی ئە و کەسانە ڕێنوێنن و لەسەر ڕێی ڕاستن}..

دەگێڕنەوە لە عەبداللە ی کوڕی مەسعودەوە (د.خ) ڕۆژێکیان ڕەت دەبێ بە شوێنێکدا لە دەوروبەری شاری کوفە کۆمەڵێ خراپەکار دەبینێ خەریکی عارەق خواردنەوەن، گۆرانیبێژێکیشیان تێدایە ناوی ﴿زادان﴾ە، ئاوازی دەچڕی و گۆرانی دەوت، دەنگێکی خۆشی هەبوو، کاتێ عەبداللەی کوڕی مەسعود گوێی لێی دەبوو، ووتی: ئای ئەو دەنگە چەند خۆشە، ئەگەر بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بوایە...پاشان ڕۆشت.. ﴿زادان﴾یش گوێی لێیەوە بوو، ووتی: ئەوە کێ بوو؟ ووتیان: عبداللەی کوڕی مەسعود هاوەڵی پێغەمبەری خوا (د.خ)، ووتی: چی ووت؟ ووتیان: ئەو ووتی ﴿ئەو دەنگە چەند خۆشە، ئەگەر بۆ خوێندنی قورئان بوایە﴾ بۆیە هەیبەت و ترس ڕۆشتە دڵیەوە و عودەکەی دا بەزەویدا و شکاندی، پاشان ڕۆشت هەتا دۆزیەوە، دەسرەکەی خستە ملی خۆیەوە، لەسەر دەستی عبداللە گریا، عبداللەش باوەشی پیادا کرد و هەردوکیان دەستیان کرد بە گریان. پاشان عبداللە ووتی: چۆن کەسێکم خۆشناوێت کە ئیتر خوای گەورە خۆشی دەوێت... تەوبەی کرد لە گوناهەکانی.. لە گەڵ عبداللە بوو هەتا فێری قورئان بوو، وە پشکی قورئان و زانستی بەرکەوت..

## ٣١- ﴿تیاچوون﴾

خۆر هەڵهات لەو ڕۆژە جوانەدا کە جریوەی چۆلەکە جوانەکان ڕازاندبوویەوە لەگەڵ بەختەوەری مرۆڤەکان، ئەوانەی دەچوونە دەروە بۆ سەر کارەکانیان و قوتابخانەکانیان هیچ شتێ جوانی و پاکی ئەو کەش و هەوایەی تێك نەدەدا تەنها ئەو ماڵە نەبێت کە لە دەرەوە جوان دیار بوو، بەڵام خێزانەکەی بە پێچەوانەی دیمەنی ماڵەکەوە بوون کە لە دەرەوە جوان بوو، ئەو خێزانە پێکهاتبوون لە باوك و دایك و ئەو کچە بچوکەی کە دوانزە ساڵی تێنەپەڕاندبوو، کە چاوەڕوان بوو باوك و دایکی دەستیان بەتاڵ ببێت لە ئاژاوەی ڕۆژانەیان کە ڕاهاتبوون لەسەری.. دیاربوو ئەو ڕۆژە ئاژاوەکەیان گەشتبوویە قایمایی.. کە هاتوو هاوار بەرز دەبوویەوە.. کە ﴿ئەحمەد﴾ی ناچارکردبوو بەخەستی بگری و باوك و دایکیشی بێئاگابوون لە گریانی کوڕەکەیان.. هاوارەکەش هەر زیاتی دەکرد.. دیاربوو هەر لە کاتی پەیوەندی کردنیانەوە هەندێ ناکۆکیان هەبوو، بەدرێژی ئەو ماوەیە بەردەوام بوون لەسەری، بە ئەستەم ڕۆژێ تێدەپەڕی ئەگەر ئەمان ناکۆکیان نەبوایە، لەبەر ئەوە عبدالله تەڵاقی خوارد.. دیاربوو کارەکە ئاساییە، هیچ شتێ ڕووی نەدا، دایکە کەلوپەلی خۆیی پێچایەوە و لەگەڵ منداڵەکەیدا ماڵی بەجێهێشت کە منداڵەکەی چاوەڕوان بوو بڕوات بۆ قوتابخانە، کەچی لەگەڵ خۆیدا بردی بۆماڵی باپیری... بارودۆخەکە درێژەی نەکێشا، باوکی ﴿ئەحمەد﴾ ژنێکی تری هێنا، وەك ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بووبێت ڕزگاری ببێت لە ژنی پێشووی.. و هەروەها حاڵی دایکی ﴿ئەحمەد﴾یش هەروا بوو.. هەر کە ﴿عیددە﴾کەی تەواوبوو شوی کرد بە خزمێکی خۆیان... ئەو منداڵە بەستەزمانەش کەوتە گێژاوێکی قوڵەوە.. ماندوێتی و ناڕەحەتی دەستی پێکرد.. ڕۆژێك لای باوکی بوو، لە لایەن باوەژنەکەیەوە لێی دەدرا تا ناچاری کرد کە لەوێ نەمێنێتەوە ڕۆژێکیش لە ماڵی دایکی بوو مێردی دایکی ئازاری ئەداو کەڵبەی لێ تیژ دەکرد.. ئەمیش لە زەلیلی و سوکایەتی پێکردندا دەژیا.. جارێکیش لای باپیرە چاکەکەی بوو کە تەمەنی زۆری نەخایاند و وەفاتی کرد.. ناچار دەچوو بۆ لای مامی، لەوێش هەر لێدانی دەخوارد.. بەردەوام لێدان و قسە پێوتن وەك ئاژەڵێك کە هیچ نرخێکی نەبێت.. ناچار ڕایکرد لە خێزانەکەیان، بەڵکو کەسێ ببینێتەوە گرنگی پێ بدات و کەسێ ببینێتەوە ئەو چاودێریەی بکات کە لەدەستی دابوو.. وە ئەو سۆزەی باوك و دایکی بێبەشیان کردبوو لێی.. کەوتە سەر شەقامەکان و برسێتی زۆری بۆ هێنابوو کە خەریك بوو هەناسەی پێ

دەبڕی.. دنیا تاریك بووبوو لەبەرچاوی.. ئەو سەرگەردانیە ناچاری کرد پەنابەرێتە بەر کاری حەرام لەرێگای دزی کردنەوە و فڕاندنی کیفە و جانتا، زۆری نەخایاند چالاکیەکەی زیادی کرد و دوای ئەوەی پەیوەندی کرد بە کۆمەڵێ عەصابەی تایبەتمەند لەدزی و ڕاووڕووتدا.. بەو شێوەیە هەتا ڕاهات و پسپۆڕبوو لە کارەکەیدا و ناوبانگی دەرکرد لە کاروچالاکیدا تا بوو بە یەکێکی ناودار لە ناو عەصابەکەدا بوو بە پلاندانەر و ڕێکخەر، لەکاتێکدا شانزە ساڵی تەمەنی تێنەپەڕاند بوو. شەرمی لە کارەکەی خۆی نەدەکرد، چونکە کەسی شك نەدەبرد ئامۆژگاری و ڕێنمایی بکات نە باوك و نە دایك نە مامە نە خزمێك، تەنها باپیری رزگارکەری بوو، ئەویش وەفاتی کرد.. ناوبانگی لە نێو عەصابەکاندا زیادی کرد هەتا ناوی بڵاوبوویەوە... بەڵکو گەشتە سنورێ هەندێ لە عەصابەکان دایانە پاڵ ئەم.. ئاشکرایە کە تاوانبار هەرچەندە جەربەزە بێت هەر دەبێ ڕۆژێك دەزگیر بکرێت.. بۆیە ئەمیش لە کاتی ئەنجامدانی دزیی لە یەکێ لە بانقەکاندا دەستگیر دەکرێ.. لە بنکەی پۆلیس ئەفسەرەکە توشی سەرسوڕمان دەبێ، بڕوا ناکات کە ئەم کوڕە حەقدە ساڵانە تاوانباری بەناوبانگ بێت کە هەموان دەیناسن چەندە زیرەك و بلیمەتە، وایان دەزانی تەمەنی ٤٠ یان ٣٠ ساڵە، تەنانەت شانزە ساڵیشی پڕ نەکردبوویەوە... بەرامبەر بەو کارەی کە کردبووی لە لایەن دادگای شەرعیەوە حوکمی ﴿قازی﴾ بۆ دەرچوو ئەویش بە بڕینەوەی دەستی.. بۆ بەجێهێنانی ئایەتی ﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا﴾المائدە/٣٨... واتە: ﴿دز (چ نێر بێت یان مێ) دەستیان ببڕنەوە بەهۆی دزیکردنەکەیانەوە﴾.. بۆیە دەستی ڕاستی لەبەردەم خەڵکیدا بڕایەوە.. و ماوەیەکیش زیندانی کرا، کە لەو ماوەیەدا مەلایەکی بە تەمەن سەردانی دەکرد کە نور و خواپەرستی لە ڕوخساریدا دیار بوو.. احمد هەستی بە حەوانەوەیەکی زۆر دەکرد بەو مامۆستا بەڕێزە، هەر کە ماوەی بەندیەکەی تەواوبوو لەگەڵ ئەو مامۆستا بەڕێزەدا ڕۆشت بۆ ماڵیان، چونکە ئەو بەتنها دەژیا، ژنی نەهێنابوو وە منداڵیشی نەخستبوویەوە، ئەحمەد لە خۆشی و دڵ ئارامیدا دەژیا، ئەحمەد توانی بگەڕێتەوە سەر خوێندنەکەی و تەواوی بکات بە چالاکی و بە سەرکەوتوویی.. و ناڕەحەتیەکانی ڕابردووی تێپەڕاند، بە سەرکەوتوویی ئامادەیی تەواو کرد و سوربوو لەسەر ئەوەی بڕواتە زانکۆی ئیمام ﴿محمد بن سعود﴾ی ئیسلامی، حەزی کرد بڕواتە کۆلێژی شەریعە لەوێش بڕوانامەی زانستی بە سەرکەوتوویی بەدەست هێنا.. لە ئەنجامدا ڕۆشتە

پەیمانگای باڵا بۆ دادوەری ﴿المعهد العالي للقضاء﴾ دووساڵی خایاند و پاشان ئەحمەد بوو بە ﴿قازی﴾.. هەر کە ئەو پۆستەی وەرگرت توشی نارەحەتیەکی سەخت بوو، ئەویش وەفاتکردنی مامۆستا بەڕێزەکە بوو، کە بەلای ئەمەوە باوکو پەروەرشیار و ڕزگارکەری بوو... لەو ماوەیەدا ئەحمەد وای هەست دەکرد کە باوك و دایکی لەدەستداوە.. چونکە ئەو پیاوە بەڕێزە بۆ ئەم باوك و دایك بوو... ڕەحمەتی خوای لێبێت... و دوای ئەوەی سەروەت و سامانی خەمڵێنرا، دەرکەوت کە ئەم پیاوە بەڕێزە خزمی نیە، و وەسێتی کردووە کە هەرچی سەروەت و سامانی هەیە بدرێت بە ئەحمەد کە لە وەسیەتەکەیدا ڕوونی کردبوویەوە کە کوڕیەتی.. ئەحمەد زۆر گریا، ئەو پیاوە چاکەی زۆربوو بەسەر ئەحمەدەوە و بەسەر ژیانیەوە تەنانەت لە مردنەکەشیدا.. دوای ئەوە ئەحمەد وازی لە مومارەسەکردنی کارەکەی هێنا، حەزی کرد خوێندنی باڵا تەواو بکات.. بۆیە ماستەری خوێند و تەواوی کرد و پاشان نامەی دکتۆرای ئامادەکرد و پلەی ﴿نایاب﴾ی بەدەست هێنا.. ئەحمەد لە بەناوبانگترین تاوانباران لە وڵاتەکەیدا بوو بە بەناوبانگترین بانگخواز لە وڵاتەکەی. ئەو ئەفسەرەی کە دەستگیری کردبوو لەکاتی تاوانەکەیدا سەردانی کرد و گوزارشی لە ئاسودەیی خۆی دەکرد بە هۆی ئەو گۆڕانە ڕیشەییەی کەبەسەریدا هاتووە... ئەحمەد لەو کاتەدا لە بەرنامەیەکی ئاینی لە تەلەفزیۆندا دەرکەوت، دایك و باوکی هەر لە یەکەمین ساتەوە ناسیانەوە.. کاتێ ئەحمەد دەستی کرد بە باسکردنی بەسەرهاتی خۆی لەو بەرنامەیەدا لەو کاتەوەی منداڵ بوو هەتا ئێستا.. دایك و باوکی زۆر گریان و دەرکیان بەو هەڵە گەورەیە کرد کە تێی کەوتبوون.. چونکە تەنها بیریان لە خۆیان دەکردەوە و ئەو منداڵە بەستەزمانەیان لەیادکردبوو، ئەگەر کۆمەك و هاوکاری ئەو پیاوە بەڕێزە نەبوایە لە حاڵەتێکدا دەبوو کەس نەیدەتوانی باسی بکات.. بەو شێوەیە ناوبانگی دەرکرد لە زۆربەی ووتە و پەیڤینەکانیدا لەسەر توندوتۆڵکردنی پەیوەندی خێزانی، بە تایبەتی لە نێوان ژن و مێرددا، چونکە بە بەختەوەری و سەرکەوتنی ژیانی ئەوان ژیانی منداڵەکانیشیان سەرکەوتوو دەبێت..

## ٣٢- ﴿وتاربێژی لاو﴾

دوای دورکەوتنەوەیەکی زۆر لەو شوێنەی کە لەدایکبووم تیایدا گەڕانەوەم بۆی تام و چێژێکی تایبەتی هەبوو، چام دەگێڕا بە زۆر لایەنی جیاوازیدا، و بە ڕوخساری کەسەکاندا، بە ئەوەی کۆن، و ئەوەی نوێش، کەچەندە زۆر بوون.. دوای ئەو دابڕانە درێژە، حەزم دەکرد بە شەقامەکانیدا بگەڕێم، و بە کۆڵانەکانیدا، خانوە کۆنەکان ببینم و گەڕەکە تەسکەکان... لە میانی گەڕانیکی خێرادا کە سەعاتێك زیاتری نەخایاند هەستم کرد کە من زۆر دوور نەکەوتومەتەوە لێی... ساڵانێکی درێژم بڕی لە گەڕانێکی خێرادا، چونکە شتێکی نوێم نەدی.. بۆ ڕۆژی دوایی خۆمان ئامادەکرد بۆ نوێژی هەینی لە مزگەوتی گەورە... کە دیاربوو گەورەو فراوان کرابوو.. هەر تەماشای مینبەرم دەکرد.. ئایا هەمان ئەو مەلایە دێتە سەرەوە کە ساڵانێکە جێم هێشتووە... یان گۆڕاوە؟ کەچی لاوێکم بینی لەش پڕ و ڕیشی هێشتبوویەوە، سڵاوی لە ئامادەبوان کرد بە متمانەیەکەوە کە لە سەدایەوە دیار بوو، پاشان قسەی دەکرد بە هێز و بە تواناوە، وتارێکی خۆش بوو، بە تایبەت دەنگی زاڵ و کاریگەر بوو.. دوای نوێژ حەزم کرد بزانم ئێمە لەخزمەتی چ مەلایەکدا بووین. ئەو وتاربێژە گەنجە ناوازەیە کێ بوو، هاودەمەکەم وتی: ئایا نایناسیت؟ ئەوە ﴿فلان کەسە﴾ بڕوام نەدەکرد، سەرم بادا وەك ئەوەی پێی بڵێم: نا... گومانی هەندێ کەسم دەبرد کە بڵێ ئەوە فلان کەسە، بەڵام ﴿فلان﴾ هەرگیز بەخەیاڵمدا نەدەهات.. لەهەمان ڕۆژدا سووربووم لەسەر ئەوەی سەردانی ئەو وتاربێژە لاوە بکەم لەماڵی خۆیاندا.. ناونیشانی ماڵەکەیانم دەزانی... لە میانی ڕۆشتنم بۆ ماڵیان.. بیروهۆشم گەڕاندمیانەوە بۆ دواوە... هەتا چەند دیمەنێ ببینم کە پەیوەندی بە خودی ئەو گەنجەوە هەبوو.. شتی سەیر سەیرم بینی.. ئێمە چەند کەسێك بووین بەپەنجەی یەك دەست دەژمێردراین.. کاتێ گوێمان لە بانگەوە بوایە دەچوین بۆ نوێژکردن... مزگەوتەکە لەو شوێنەوە زۆر دوور نەبوو کە یاریمان تیادا دەکرد... ئەو هاوڕێیەمان نەدەهات، بەڵکو هەندێ جار گاڵتەی پێ دەکردین، بەڵکو حەزی دەکرد لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا کە زۆر بوون بمێنێتەوە ﴿زۆربەیان ڕێکوپێك نەبوون﴾ بەردەوام بوون لە یاریکردن.. کاتێ نوێژمان تەواو دەکرد، بەخێرایی دەگەڕاینەوە بۆلایان، هەندێ جار ئەوان بەگاڵتەکردنێکی نوێوە

پێشوازیان لێ دەکردین..! لەکاتی سەردانیدا، لاپەڕەیەکی زۆری یادەوەریەکانمان هەڵدایەوە، پاشان داوام لێکرد کە باسی هیدایەتدانی خۆیم بۆ بکات، ئەویش ووتی: لە سەرەتای قۆناغی سانەویدا وازم لە قوتابخانە هێنا، بەهۆی بارودۆخی خۆمەوە کە نارەحەتی کردبووم، پاشان دەستمکرد بە کارکردن.. پارە کەوتە دەستمەوە، خراپ و خراپتر دەبووم، بەڵام خوای گەورە ویستی وابوو کە توشی خێر ببم.. توشی نەخۆشیەك بووم، بە هۆیەوە کەوتمە ناو جێگە.. نەکەن ڕقتان لەشتێك بێت کە خێری تیا بێت بۆ ئێوە ﴿ عَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لكم﴾ البقرة/٢١٦... سروشتی من وابوو کە پەروەردە بووبووم لەسەری کە زۆر لە نەخۆشی دەترسام، دەترسام ئەو نەخۆشیە کۆتایی بە ژیانم بهێنێت.. لە ساتی نەخۆش کەوتنمدا هەستم کرد هاوڕێ خراپەکانم کەمتر سەردانیان دەکردم.. مانگ و نیوێك بە نەخۆشی مامەوە.. هیچیان سەردانیان نەدەکردم بێجگە لە دوانیان و ئەویش زۆر کەم.. لە سەرتادا زۆر بێتاقەت بووم.. پاشان ڕاهاتم لەسەر کارەکە.. ئاشنا بووم بە لاوێك کە بەردەوام سەردانی هاوڕێیەکی دەکرد لەو ژوورەدا کە منیشی تێدا بووم.. کە زیاتر لە بیست قەرەوێڵەی تێدا بوو، ئەو لاوە هیچ ڕۆژێ لەبیری نەدەکردم.. هەرکاتێ بهاتایە سەری لێدەدام و پرسیاری لێدەکردم و دیاری سادە و هەمەڕەنگی پێشکەش دەکردم.. ڕۆژێکیان کاسێتێکی پێشکەش کردم.. داوای لێکردم بە وردی گوێی لێبگرم.. وا هات بە خەیاڵمدا کە لەوانەیە بیەوێ پرسیارم لێ بکات.. منیش بە وردی گوێم لە کاسێتەکە گرت.. ئای خوایەگیان ئەو کاسێتە چ گۆڕانێکی لەدڵمدا دروستکرد.. باسی عاقیبەت شەڕی و هۆکارەکانی دەکرد لە گەڵ چیرۆك و سەرگوزەشتە لەو بارەیەوە، کە بەڕاستی هەموو لەشمی هەژاند.. ڕوخسارم خستە ژێر پێخەفەکەمەوە و شاردمەوە و بە هێواشی دەگریام، هەر ئەو شەوە زیاد لە جارێك گوێم لەو کاسێتە گرتەوە.. هەتا هەموو وشەکانیم لەبەرکرد.. بۆ سبەینێ بەیانی زوو.. تەسجیلەکەم برد بۆ باخچەکەی تەنیشتمان، و نازانم چەندە لەوێ مامەوە و بەردەوام هەر کاسێتەکەم لێدەدایەوە..!! ئەوە سەرەتای هیدایەتدانی من بوو.. پاشان هەنگاونان بەو ڕێگا دوورەدا.. دوای چاك بوونەوەم، وەك یەکەمین هەنگاو کە گرنگ بوو دەبوایە ئەنجامم بدایە وازم لە هاوڕێ خراپەکانم هێنا.. کەسایەتی من لەوان بەهێز تر بوو، بە ئاشکرایی ڕامگەیاند

بۆیان یان دەبێ بەو ڕێگایەدا بڕۆن کە من ڕووناکیەکەیم بۆ ڕوون بوویەوە، یان بەبێ زویر بوون دەستبەرداری یەکتری ببین..!! لەبەر ئەوەی ناوچەکەمان و دەوروبەری مەلایەکی تێدا نەبوو بتوانرێت پەنای بۆ ببرێ.. بۆیە ناچار بووم خۆم هەوڵ بدەم و پشت بەخوای گەورە ببەستم.. گوێم لەیەك کاسێت دەگرت هەتا پیت بە پیتیم لەبەر دەکرد.. چەندین کاسێتم لەبەرکرد، هی وتاربێژە بەناوبانگەکان کە تەنها کاسێتەکانیان دەگەشتە لامان، لەوانە مامۆستای بەناوبانگ ﴿عبدالحمید کشك﴾ بە ڕاستی ڕەوانبێژیەکەی کاریتێکردبووم.. و شێوازەکەی کەمەندکێشی کردبووم، زۆرێك لە وتەکانیم لەبەرکردبوو.. بارودۆخی وڵات ڕێگای نەدەدا بە بونی کتێبخانەی ئیسلامی.. ئەو چەند کاسێتانەشمان بە نارەحەتی و ئەستەم دەست دەکەوت، بە نهێنی و دوور لەچاوی خەڵکی، و هەروەها کتێبیش دەستاو دەستی پێدەکرا.. هەر کتێبێکم بەردەست بکەوتایە چەند جارێ دەمخوێندەوە... هەتا هەموو کتێبەکەم لەبیر و هۆشمدا تۆمار دەکرد، ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی هەتا هەستم کرد زمانم پاراو بووە لەگەڵ ئەو وشە جوانانەدا، و ئەو مانایانە لەدڵمدا دروست دەبن بەشێوەیەکی سەیر.. بۆیە خۆم پێنەگیراو دەستم کرد بە خوێندنی چەند زانستێکی شەرعی ئاسان لە سەرەتادا.. پاش ماوەیەك هەنگاوی ترم نا، بۆیە وانەی ئامۆژگاری و پەروەردەیم دەوتەوە.. وردە وردەو بە کۆمەکی خوای گەورە گەشتمە ئەم شوێنەی کەتۆ ئێستا پرسیارم لێ دەکەیت..

## ٣٣- ﴿گەڕانەوە دوای نەمانی ئومێد﴾

ئەحمەد جانتاکانی لەبەردەم دەرگای شوقەکەیدا دانا، پێش ئەوەی دەسکی دەرگاکە بگرێت، ڕوی وەرگێڕا بۆ سندوقی پۆستەکە.. ویستی بڕواتە ژوورەوە، بەڵام شتێك وای لێ کرد کە سندوقەکە بکاتەوە... جارێکی تر هاتەوە بۆ لای سندوقەکە، لە ناخیدا کۆمەڵێ پرسیار دروست بوو... ئەبێ چی لە ناویدا بێت؟؟ وەسڵی تەلەفۆن و کارەبا.. و چی تر؟؟ دەستی درێژکرد و سندوقەکەی کردەوە.. نامەیەکی بینیەوە تەنها نوسرابوو نەخۆشخانەی منداڵان.. پەیوەندی بە منەوە چیە؟؟ نامەکەی خستە گیرفانیەوە.. و ڕۆشتە شوقەکەوە.. هەموو شتەکان بێتاقەتیان دەنواند.. تەپوتۆز ئەساسی ماڵەکەی داپۆشیبوو.. بۆنی هەناسەی تن دەکرد.. ڕۆشت بۆ ژوورەکەی... بینی هەروەکو خۆی وایە.. تەنانەت ساڵنامەکەش وەك خۆی وایە.. لە کاتی سەفەرکردنیەوە لە ١٤٢١/٣/١٥ك بەروارەکەی نەگۆڕاوە، تەلەفۆنەکەی گرت بە دەستەوە و ژمارەی ماڵی خانەوادەی ژنەکەی لێدا، پرسیاری لە ژن و منداڵەکەی کرد کە بە تەنها بەجێی هێشتبوون.. خێزانی و﴿ئەمەل﴾ی کچی..

– ئەلو...

+ بەڵێ..

– مامەگیان (السلام علیکم)

+ علیکم السلام.. ئەڵێی مامە.. بەخوا وەڵامی سەلامتم نەدەدایەوە تەنها لەبەر ڕێزی سڵاوکردنی ئیسلام نەبێت و ئەگەر نا، شایانی ئەوە نیت وەڵامت بدەمەوە.. بە کورتی ژنەکەت نادەینەوە و تەلەفۆنەکەی داخست..!!

هەستی بە تەنگەتاوی دەکرد بەهۆی ئەو پێشوازیە خراپەوە، ویستی هەرچی شت لەبەردەمیدایە بیشکێنێ.. بەڵام لە ﴿ساڵنامەکەدا﴾ شتێکی بینی کە سەرقاڵی کرد.. لاپەڕەکانی هەڵدایەوە هەتا گەشتە بەرواری ١٤٢١/٦/١٥ك... خوایەگیان سێ مانگە من لەوێم!: بەبێ ئەوەی گوێ بە تەپوتۆزەکە بدات خۆیدا بەسەر جێگاکەدا.. هەستی نەکرد کاتێ نەبێ دەستی برد بۆ گیرفانی و نامەکەی دەرهێنا... ئەبێ ئەم نامەیە هی کێ بێت؟! ﴿باوکی خۆشەویستم.. السلام علیکم ورحمه الله و برکاته.. ئەم نامەیەت بۆ دەنێرم کە گوزارش لە ئازار و برینداری دەکات.. ئەم نامەیەت بۆ دەنێرم و ناشزانم بە چ ناونیشانێ بینێرم.. ئایا بۆ تایلەند.. یان بۆ سوید.. یان بۆ پاریس.. یان بۆ چ شارێ؟ و یان بۆ چ

مەلهایەك یان بۆ چ کافتریایەك یان بۆ چ ئوتێلێك؟ بەڵێ باوکە... گەورە بووم و فێری مانای ئەو وشانەت بووم کاتێ کە سەفەرت دەکرد دەتوتنەوە ﴿ئەمەل باوکت ماندوو بوو لە کارکردن دەچێ پشوویەك بدات﴾ لێی تێگەیشتم باوکە، خۆزگە لێی تێنەگەشتمایە، ئایا لەناو کاری حەرامدا بە دوای بەختەوەریدا دەگەڕایت؟ بەڕاستی تۆ بەو کارەت لە فراوانیەوە بەرە و تەسکی دەچویت... لە فراوانی خواپەرستیەوە بەرەو تەسکی سەرپێچی کردن.. باوکی خۆشەویستم.. حەڤدە پایزە لە تەمەنم تێپەڕیوە و من حەڤدە پایزە چاوەڕوانی تۆم.. هەر کاتێ گوێم لە دەنگی ئۆتۆمبێلێك بوایە ڕامدەکرد بۆ بەردەرگا باوکە حەڤدە پایز تێپەڕی و من ئاواتەخواز بووم هاوارم بکردایە! باوکە بگەڕێرەوە بۆلامان.. ئەمە دڵۆپی فرمێسکەکانمە لەسەر نامەکە.. من خوێن ئەچەڕێنم.. چەند پێویستیم بەتۆ هەبوو، من چاوەڕوان بووم کەسێکی خۆبەخش بێت و بمگەیەنێتە نەخۆشخانە.. چەندە من پێویستیم بەتۆ هەبوو کە بمنێیت بە سنگتەوە.. بە سۆز و میهرەبانیت لە ئامێزم بگریت... پێش ئەوەی قەبری تەنگ و تاریك لە ئامێزم بگرێت.. باوکە.. ڕۆژگار جیای کردوینەتەوە.. بگەڕێرەوە بۆلای خوا هەتا لەبەهەشتا بگەم پێت.. کچت ﴿ئەمەل﴾ی تێکشکاو ١٤٢١/٤/٢٩ك.. نامەکە لە دەستی کەوتە خوار.. فرمێسك بە ڕوومەتیدا هاتە خوار... بەڕاستی زیانی زۆرم کرد... خێزانم لەدەستدا.. ﴿ئەمەل﴾ی کچم لەدەستدا... دینەکەم لەدەستدا.. بەڵێ دینەکەمم لەدەستدا؟؟ ﴿وەرە با زیندووی بکەینەوە﴾ دووری ئاسمانەکانی بڕی و دیوارەکانی بێدەنگی بڕی... بە دەنگێکی ورووژێنەر لۆمەی کرد و سزایدا {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ} ﴿الزمر : ٥٣﴾. واتە: { تۆ، ئەی موحەممەد! بڵێ بەو بەندانەم کە زیادەڕۆییان کردووە لەسەر نەفسی خۆیان لە گوناە کردن و بێ فەرمانیی خوادا: نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، خوا لە هەموو گوناهێ خۆش ئەبێ بۆ هەرکەسێ کە باوەڕی هەبێ کە خوا گوناە بەخش و میهرەبانە }.ڕووی وەرچەرخاند... ژنەکەی بینی دەستی گرت و وتی: ﴿ئەمەل﴾ وەسیەتی بۆ کردم –ڕەحمەتی خوای لێبێت– کە دەستبەردارت نەبم.. هێشتا تەمەن بە بەریەوە ماوە و هێشتا دەرگای تەوبە و گەڕانەوە بۆلای خوا کراوەیە.. با سەرلەنوێ دەست پێبکەین...

## ٣٤- ﴿دایکی نمونەیی﴾

نازناوی یەکەمین دایکی نمونەیی لە شارەکەیدا لە ﴿صەعید﴾ی ﴿میسر﴾ بەدەست هێنا، لە پارێزگای ﴿سوهاج﴾ی کۆماری میسری عەرەبی، کاتێ زەماوەندی لەگەڵ باوکمدا کرد تەمەنی ١٤ ساڵ بوو، وە ئامۆزای بوو، دوای گەشتێکی ئازاراوی لەگەڵ باوەژنەکەیدا، ئەو ئافرەتە لە ﴿صەعید﴾ی میسر سەفەری کرد بۆ قاهیرە، چونکە مێردەکەی لەوێ کاری دەکرد.. هەرچەندە تەمەنی بچوك بوو، بەڵام لە پێنج ساڵدا ﴿٥﴾ کوڕی بوو، لە گەڵ ڕۆشنبیریە سادەکەیدا، گرنگیەکی زۆری بە منداڵەکانی دەدا.

چیرۆکی یەکەم: ﴿لە چیرۆکی یەکێ لە هاوەڵەکان دەکات﴾ لە ساڵی ١٩٤٨ نەخۆشیەکی کوشندە توشی هەموو منداڵانی میسر بوو، ئەویش نەخۆشی ﴿تاعون﴾ بوو، ئەم ئارامگر بوو، بە تەمای ڕەحمی خوای گەورە بوو... دوعای دەکرد: ﴿خوایەگیان یەکێ لە کوڕەکانمت پێشکەش دەکەم لە پێناوی ڕزگاربوونی چوار کوڕەکەی کەمدا﴾ ﴿سبحان الله﴾ منداڵە بچوکەکەیان نەخۆش کەوت و خوای گەورە دوعاکەی گیرا کرد و لەڕۆژی دووەمدا وەفاتیکرد.. خوا لێی خۆش بوو، باوکم بە شەکەتی لەسەر کار گەڕایەوە، دایکیشم فرمێسکەکانی شاردەوە و برا وەفاتکردوەکەمانی لەسەر جێگا داناو چەرچەفێکی دا بەسەردا، وەك ئەوەی کە خەوتبێت. دایك خۆی ڕازاندەوە بۆ پێشوازی لە باوك.. و باشترین خواردنی لە هەموو ڕۆژەکانی تر بۆ ئامادەکرد، کاتێ باوکم هاتە ژوورەوە پرسیاری کوڕە نەخۆشەکەمانی کرد، ئەویش ووتی: ئەو زۆر لە یەکەم جار باشترە و لە جێگاکەیدا ڕاکشاوە.. باوکە نانی خوارد و پشوویدا، پێداویستی خۆیی جێبەجێ کرد، پاشان هەستی بە فرمێسك دەکرد لە چاوانی دایکەکەدا، پێی ووت: چی ڕوویداوە؟ ووتی ﴿بە خۆڕاگریەکی نمونەیی دایکانەی ئیماندارەوە و بە ڕازیبوون بە قەزاو قەدەری خوای گەورە﴾: خوای گەورە ڕاسپاردەیەکی پێدابووین، ڕاسپاردەکەی بردەوە.. مانەوە تەنها هەر بۆ خوایە، کوڕەکەت وەفاتی کرد. باوکە ووتی: من دان بەوەدا دەنێم کە باوەڕی تۆ بەهێزتر و مەزنترە لە باوەڕ و ئیمانی من، هەرچەندە هەژدە ساڵت تێنەپەڕاندووە و من ئێستا ٤٨ ساڵم، بەڕاستی تۆ ئێستا ڕۆڵی هەمان چیرۆکی ئافرەتە صەحابیە خۆڕاگرەکان دەبینیت لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ).

ئەمە سەرەتای دایکێکی نموونەیی بوو، دوای ئەو ڕووداوە بەچەند مانگێکی کەم، سکی بوو، خوای گەورە بە کوڕێکی تر قەرەبووی بۆ کردەوە.. بەڵام وەك دەڵێن هێشتا خۆشیەکە تەواو نەبوو، دوای نزیکەی ٦ مانگ لە سك بوونی، تاقیکردنەوەی مەزن دەستی پێکرد. لەپڕ باوك کۆچی کرد و ئەو سێ کوڕەی بۆ جێهێشت و چوارەمیش لە سکیدایە، ئەمیش ئارامی گرت و ئەوکارەی بەوە دانا کە لەلایەن خواوەیە. بەڵام چی بکات؟ منداڵەکانی هەڵگرت و لە قاهیرەوە گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆیان لە پارێزگای ﴿سوهاج﴾ کە خێزانێکی کەم دەرامەت بوون، سەرچاوەی بژێویان نەبوو، چونکە بەخێوکاریان کە باوکی منداڵەکان بوو وەفاتیکرد، بەڵام خوای ڕۆزیدەر ماوە و نەمردووە.. بەو ئیمانە پتەوەوە دەستی کرد بە گەشتی ژیان، پارەیەکی کەمی شك دەبرد، بۆیە مەکینەیەکی دروومانی لێ کڕی، ئەو پیشەیە فێربووبوو لە ڕێی مامۆستاکەیەوە لە قوتابخانە، دەستی کرد بە دروومانی جل و بەرگی خەڵکی ئەو شارە و گوندەکانی دەوروبەریشی، هێشتا ئاو و کارەبا نەگەشتبوویە ئەو شارە، ئەو پۆشاك و جل و بەرگەکانی لەبەردەم لەمپایەکی ﴿کیروسین﴾دا دەدوری، ئاویشی لە بیر یان لە ماڵی دراوسێکان دەهێنا. خێزانەکەیان کۆبوونەوە و بڕیاریاندا کە: ئەم ئافرەتە جوانە و هێشتا تەمەنی ١٩ ساڵە، پێویستە شو بکات بۆ پارێزگاری خۆی و پەروەردەکردنی منداڵەکانی، هەموو پێشنیارەکانی ڕەت کردەوە، لەگەڵ ئەو هەموو هاندان و زۆرلێکردنە سەختەدا، ئەو ئەم وتەیەی ئاراستەی هەموو ئەندامانی خێزانەکەی دەکرد: ﴿ژن شوو بەیەك پیاو دەکات، بەڵام من شوم بە ٤ پیاو کردووە، ئەوانە کوڕی منن﴾ لە ئێستاوە هەموو ژیانی خۆمم تەرخان کردووە بۆ ئەوان هەتا مردن..

گرنگی پێ دەداین، بەڵکو وانەکانیشی پێ دەوتینەوە و سەعی پێ دەکردین، چونکە خوێندەوار بوو، بەڵکو گرنگی دەدا بە پاکو خاوێنیمان و خۆراکمان و پۆشاکمان و بڕە پارە کەمەی کە بەهۆی دروومانەوە دەستی دەکەوت، و ئەو کۆمەکە مانگانەیەی کە تەنها خاڵی لێخۆشبوومان دەیدایێ. لە شاری ﴿طما﴾ لە پارێزگای ﴿سوهاج﴾ قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی تەواو بوو، خزمانیش دەیان ووت: ﴿بەسە﴾ پێویستە منداڵەکان کارێك بگرنە دەست و تۆش شوو بکەیت، ڕازی نەبوو، ووتی بە ئیزنی خوا

بەردەوام دەبن لە خوێندن هەتا بەرزترینی پلەکان هەتا زانکۆ و بە ئیزنی خوا دکتۆراش. بەهۆی ئەو پێداگرتن و لێبڕانەوە گواستمانەوە بۆ پارێزگای ﴿اسیوط﴾ چونکە زانکۆ لەوێ هەبوو، ئێمەش دوانمان لە کۆلێژی ئەندازیاری و یەکێکمان لە کۆلێژی بازرگانی و بچوکەکەشمان لە کۆلێژی ﴿دەرمانسازی﴾ بوو. نەمان هێشت تەنها دایکمان لە هەوڵ و ماندوبووندا بێت، لەگەڵ خوێندنەکەشماندا دەستمانکرد بە کارکردن، یەکێکمان ئەمینداری نوسینگە بوو، یەکێکیشمان سکرتێر لە نەخۆشخانە... بەهۆی بەردەوام کارکردنی درووماني، چاوەکانی دایکم کرز بووبوون، بۆیە ناچار بوو چاویلکە لەچاو بکات. بەسەرهاتی تێکۆشان و لێبڕان چەندین ساڵی خایاند، بەلام پێویستە بەسەرهاتەکە کورت بکەمەوە، چونکە بە چەندین بەرگی کتێب تەواو نابێت. بە راستی بەرهەمی تێکۆشانی یەکەمین دایکی نموونەیی میسر دەرکەوت، کوڕە گەورەکەی بوو بە سەرۆکی پەیمانگای کارگێڕی گشتی لە شانشینی عەرەبی سعودی، شانشینی عەمان.. بچوکەکەشیان ئەندازیاری پەیوەندیەکان بوو لەشانشینی عەرەبی سعودی، ئەو کوڕە بچوکەشیان کە لە سکی دایکیدا بوو لە کاتی وەفاتی باوکیدا، بوو بە دکتۆر و سەرۆکی بەشی دەرمانسازی لە کۆلێژی دەرمانسازی زانکۆی ﴿زەقاقیق﴾، دکتۆر لە چارەسەر کردنی نەخۆشیەکانی شێرپەنجە، کە بەرزترین خەڵاتی بەدەست هێنا لە بواری پسپۆری میسری کۆلێژەکانی دەرمانسازی زانکۆ عەرەبیەکان. ئەم هاوینە دوای سەردانی دایکی نموونەیی لە ئەسکەندەریە و گەڕانەوەم بۆ سەر کارەکەم لە وڵاتی کوێت، هەواڵم پێگەشت کە دایکم توشی جەڵدەی خوێن بوو لە مێشکیدا کە بە هۆیەوە هۆشی لەدەست داوە، بە پەلە چوومەوە بۆ میسر، سوپاس بۆ خوا بارودۆخ ئاسایی بوویەوە و گەڕامەوە بۆ کوێت، لە ڕۆژی یەکی ڕەمەزان،و لە ڕۆژی هەینی، ئازیزترین و سەنگین ترین دایك لە بووندا وەفاتی کرد، بە راستی لەلایەن پێغەمبەری خواوە مژدەی بەهەشتی پێ دراوە کە ئەمە ماناکەیەتی، وەفاتیکرد و چوار کوڕی هەبوو، بە نەخۆشی وەفاتی کرد، ڕۆژی هەینی وەفاتی کرد، لە ڕەمەزانی ئەمساڵدا وەفاتی کرد.

# ٣٥- ﴿چیرۆکی کچێك كه ناوی (مەلاك)ە﴾

ئەمە بەسەرهاتی کچێکە کە دانیشتوی شاری ﴿عەمان﴾ە، ئەوانەشی چیرۆکەکەیان گێڕاوەتەوە، نزیکترین کەسی ئەون، لەگەڵ هەندێ لە ئەندامانی خێزانەکەی. چیرۆکەکە کاتێك دەست پێدەکات کە گەنجێکی خەڵکی ﴿عەمان﴾ ئافرەتێکی بیانی دەخوازێ، ئافرەتەکە لەسەر ئاینی مەسیحی خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام دەڕوات لەگەڵیدا تا لەشاری ﴿عەمان﴾ بژین.. پیاوەکەش خاوەنی پلەو پایەیەکی باش و سامانێکی زۆر بوو، دەبنە خاوەنی چەند منداڵێك بەڵام لە پەروەردەدا لاواز دەبن.. ئەمە بەسەرهاتێکی غەمناکە چونکە ڕاستەقینەمان بۆ باس دەکات.. باسی حەقیقەتی یەکێ لە کچەکانی ئەو پیاوەمان بۆ دەکات.. ئەو ئافرەتە ناو دەنێم ﴿مەلاك﴾، هیچ ناوێکی تر لەوە باشتر شك نابەم، چونکە بەڕاستی بووبوو بە ﴿فریشتە﴾.

﴿فریشتە﴾ ژیانێکی خۆش دەژیا، هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ ئاواتی دەخواست هەیبوو.. ماڵێکی گەورەیان هەبوو... سەروەت و سامانی زۆر... ئۆتۆمبێل.. پۆشاك.. هەرشتێ بەخەیاڵی مرۆڤدا بهاتایە... زۆربەی کاتەکانیش حەزی لە هەر شتێ بکردایە و لە هەر کاتێکدا بوایە ئەنجامی دەدا.. بەڵام باوکی سەفەری زۆری دەکرد، دایکیشی شایانی ناوی دایکایەتی نەبوو... ئەو کچە بێبەش بوو لە سۆزی باوك و دایك.. دەیەویست یەکێ شك بەرێ گوێی لێبگرێ و کاتی لەگەڵدا بەرێتە سەر... کەسێ لێی تێبگات و متمانەی پێی هەبێت... هەستی بە شتێك کرد کە پێشتر هەرگیز هەستی پێنەکرد بوو... بۆ یەکەمین جار لەژیانیدا هەستی کرد کە ژیانی هیچ ماناو مەبەستێکی تێدا نیە... تەنها بەدوای شوێنێکدا دەگەڕا بحەوێتەوە تیایدا.. ڕقی لەهەموو ئەو شتانە دەبوویەوە.. لە تابلۆکان... لە ماڵ و لە سەروەت و سامان... لە پۆشاك.. لە خێزانەکەیان.. لە هەموو شتێ.. ڕقی لە هەموو شتێ بوو، چونکە تەنها هۆکاری ناخۆشی و بێئومێدی بوون بۆ ئەم... ڕۆشت تا لە ژورەکەیدا بحەوێتەوە... بەڵام ئەو وێنەو هەڵواسراوانەی بینی سەرنجی دان... دەستی کرد بە دڕاندنی شتە هەڵواسراوەکان و شکاندنی وێنەکان.. هەستی بە ماندوو بوون کرد... بەڵام ئەوەی لە ناخیدا هەبوو بەتاڵی کردەوە... ئێستاش کاتی نوێژکردن هاتووە.. ڕۆشت بۆ ڕاڕەوەکە بە هۆی بێدەنگیەوە تا نوێژ بکات... ویستی نوێژ بکات... بەڵام نەیدەزانی

چۆن بیکات!! ڕۆشت بۆ گەرماو تا خۆی بشوات، چونکە نەیدەزانی چۆن دەستنوێژ بگرێت!! پاشان لەسەر بەرماڵی نەنکی وەستا... نەیدەزانی چی بکات... تەنها ئەوەندەی پێکرا سوجدەی برد و دەگریاو لە خوای گەورە دەپاڕایەوە... نزیکەی سەعاتێك بەو شێوەیە مایەوە... ئەوەی لە دڵیدا بوو هەڵیڕشت بۆ پەروەردگاری... هەستی بەحەوانەوە کرد... بەڵام هێشتا زۆری ماوە... پاشان مامەی بیرکەوتەوە کە ماوەیەکی زۆرە نەیبینیوە.. بەهۆی لاوازی پەیوەندی خێزانیەوە... ئەو لەو کەسانەیە کە بتوانێ یارمەتی بدات... بڕیاریدا بڕوات بۆ لای، بەڵام پۆشاکێکی گونجاوی شك نەدەبرد بۆ ئەو سەردانە بشێت... هەموو جلەکانی سەرنج ڕاکێش بوون و بەشێکی جەستەی دەردەخست.. لەو ساتەدا بیری کەوتەوە کە ئامۆژنی عەبا و حیجاب و قورئانێکی بە دیاری پێدابوو... ئەوەی پۆشی کە بۆ ئەو سەردانە بشێت و شۆفێری نەنکی بانگکرد تا بیگەیەنێتە ماڵی مامی... کاتێ تەقەیدا لە دەرگا ئامۆژنی دەرگای لێکردەوە و ئەمیش بە گریان باوەشی پیادا کرد.. ئامۆژنی زانی مەسەلە چیە.. بەڵام هێوری کردەوە و پاشان دەستیانکرد بە ووتووێژ.. پاشان ﴿فریشتە﴾ ووتی ئەمە یەکەمین جارە هەست بە سۆز و خۆشەویستی و گرنگی پێدان دەکات... پاشان داوایکرد کە یەکێ لە کچەکانی مامی ببینێت تا فێری نوێژ و دەستنوێژ و پێویستیەکانی ئاینی ئیسلامی بکەن.. پاشان داوای لێکردن نەیەن بۆلای.. و لەمامی پرسی پێویستی بە چەند هەیە تا قورئانی پیرۆز لەبەربکات.. وتی پێنج ساڵ.. زۆر دڵتەنگ بوو.. ووتی: لەوانەیە پێش ئەوەی ئەو پێنج ساڵە تەواو ببێت بمرم.. دەستی کرد بەو گەشتە نوێیە... دەستی کرد بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز... ﴿فریشتە﴾ زۆر دڵخۆش بوو بەو شێوە ژیانە تازەیە... زۆر دڵی خۆش بوو... دوای نزیکەی دوو مانگ، باوکی زانی کە کچەکەی لە ماڵەوە نیە!!! ئەوە چۆن باوکێکە!!! باوکی ڕۆشت بۆ ماڵی براکەی تا کچەکەی بهێنێتەوە، بەڵام کچەکەی ڕازی نەبوو.. بەڵام کچەکە ناچاربوو لەماڵی باپیری بێت بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان.. ﴿فریشتە﴾ خەونەکەی هاتەدی و قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد... بەڵام لە پێنج ساڵدا نا.. و لە سێ ساڵدا نا.. و دوو ساڵ و یەك ساڵیشدا نا.. بەڵکو لە سێ مانگدا!!! سبحان الله... ئەوە چۆن عەزیمەت و سووربوونێکە لەسەر کار!! بەڵێ تەنها لە سێ مانگدا لەبەری کرد...

پاشان بڕیاریاندا بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ بگێڕن.. هەموان بانگهێشت کران بۆ ئامادەبوون.. هەموان دڵخۆش و ئاسوودە بوون... کاتێ خەڵکەکە گەیشتن... پێی ووتن: دەمەوێ لە ژوورەکەمدا نوێژ بکەم.. چاوەڕوانیی درێژەی کێشا و هەر نەهاتە دەرەوە!!! بڕیاریاندا بچنە ژوورەوە بۆ لای.. بینیان لەسەر بەرماڵەکە کەوتووە و قورئانە پیرۆزەکەش لە ئامێزیدایە و گیانی پاکی بەرزەفڕ بووە بۆ لای پەروەردگاری.. گیانی دەرچووە لە ساتێکدا کە قورئانی پیرۆز لەسەر سنگیەتی ئەو قورئانەی بەسینەیدا لەبەری کردووە... هەموان سەرسام بوون بە وەفاتکردنی.. بڕیاریاندا بیشۆن و کفنی بکەن... پەیوەندیان بە باوکیەوە کرد.. ﴿فریشتە﴾ وەسێتی بۆ باوای کرد بوو کە نابێ دایکی ئامادەبێت هەتا ئاینی خۆی نەگۆڕێت و موسڵمان نەبێت.. برا و خوشکەکانی ئامادەبوون... دەستکرا بە شۆردنی.. یەکەمجاربوو کچی مامەکەی مردوو بشوات.. بەڵام شۆردیان... دەیانووت هەستیان بەوە کردووە کە چەند کەسێك لە شۆردنەکەدا یارمەتیان دەدات... بەڵام نابینرێن!!! کفنەکەیان ئامادەکرد... کاتێ ویستیان کفنی بکەن... کفنەکە دیارنەما... گەڕان بەدوایدا بەڵام نەیان دۆزیەوە!! هەر دەگەڕان و نەیان دەدۆزەوە، ناچار پارچە قوماشێکی سەوزیان هێنا کە خۆشترین بۆنی لێدەهات کە لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا بوو.. بێجگە لەوە هیچیان دەست نەکەوت بۆ کفن کردنی.. کاتێ نوێژیان لەسەرکرد شەش پیاو لە نێوان نوێژکەراندا پۆشاکی سەوزیان لەبەردا بوو... دوای نوێژەکە ئەو پیاوانە ﴿فریشتە﴾یان هەڵگرت بەرەو گۆڕستان و بۆ دفن کردنی... ئەو پیاوانە لە ئەندامانی ئەو خێزانە نەبوون، و دوای دفن کردنەکە ئەو شەش پیاوە دیار نەمان. کەس نەیزانی ئەوانە کێن و لە کوێوە هاتوون و بۆ کوێ ڕۆشتن...!!! بەڵام گومانی تیا نیە کە ئەوانە فریشتەبوون و لە لایەن خواوە هاتبوون و تا مامەڵە لەگەڵ ڕۆحیدا بکەن وەك چۆن خوا فەرمانی داوە..

## ٣٦- ﴿چیرۆکی (یاسەمین)﴾

لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی بەهاری ١٩٩٦ لە شاری ﴿دەمام﴾ لە شانشینی سعودی و لە ئوتێلی ﴿ئوبوزوی﴾. من مەوعیدم هەبوو لەگەڵ هاوڕێیەکم بۆ خواردنەوەی قاوەیەکی عەرەبی، دوای نوێژی عەسر.. گەشتینە ئوتێل و پاشان هۆڵی قاوەخانەی فێنك و جوان کە دیکۆری سەرنج ڕاکێشی هەبوو.. ئەوەش پێش مەوعیدەکەیە بە سەعاتێك.. چوومە قاوەخانەکە و نەمدەزانی لە کوێ دانیشم و تەماشای چی بکەم.. بەڵکو جوانی شوێنەکە ڕایکێشام بۆ پیاسەکردن بە هەموو شوێنێکی هۆڵەکەدا.. بەڵێ دەگەڕام و پیاسەم دەکرد لە نێوان جوانی ئەو دیکۆر و هونەر و کارە جوانانەدا، تا گەشتمە گۆشەیەك لە کۆتایی قاوەخانەکەدا کە شوێنێکی هێمن و ئارام بوو... ڕوناکیەکی کەمی هەبوو.. لەوێدا مرۆڤەکان تەنها تارمایی یەکترین دەبینی.. ئەو دیکۆرە جوانە ڕایکێشام بۆ خۆی... کەمێك نزیك بوومەوە و بەهێمنیەکی زۆر لەتەنیشت ئەو کەسەدا کە دانیشتبوو لەو گۆشەیەدا، تەنها لەبەر ئەوەی کە شوێنێکی باشی هەڵبژاردووە، بەڵام پیاوێکم بینی لە پەنجاکاندا، ڕوخسار لاواز، کە سەردەم چرچی خستبووە ڕوخساری.. چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك.. بەڵام هەوڵی دەدا نەهێڵێ بە ڕومەتیدا بێنە خوارەوە... نزیك بوومەوە لێی و بینیم نقومبووە لە بیرکردنەوەیەکی زۆر قوڵدا... پێم ووت: (السلام علیکم ورحمە الله وبرکاتە). بە سەرسامیەوە تەماشایەکی کردم چونکە نەیدەناسیم و نەمدەناسی ووتی: (وعلیکم السلام...)و بێدەنگ بوو. ووتم: دەتوانم لەم قەنەفەیەی بەرامبەردا دانیشم یان گیراوە؟! وەك کەسێکی بێتاقەت کە پەتی بیرکردنەوەی پچڕابێت ووتی: نەخێر.. بەڵێ.. فەرموو.. فەرموو. لە ڕێگای قسەکردنیەوە زانیم کە خەڵکی وڵاتی شامە و بە تایبەتیش لوبنان... دانیشتم و بێدەنگ بووم.. بەڵام چەنەبازێك چۆن دەتوانێ دانیشێ و بەبێ ئازاردانی زمانی.. ووتم: ببورە... بەڵام بۆچی ئازاری چاوەکانت دەدەیت و نایەڵی فرمێسکەکانت بە ڕوومەتدا بێنە خوارەوە.. ئەگەر من لەجێگای تۆدا بوومایە، ئەوە چاوم دەحەواندەوە لە بەرگەگرتنی گەرمایی ئەو فرمێسکە حەزینانە و دەمناردن بۆ سەر ڕوومەتم.. هەرکە گوێی لە وتەکانم بوو فرمێسکەکانی چۆڕاوگەیان بەست بەرەو ڕومەتی بە چاڵ و چۆڵیە زۆرەکانی ڕوخساریدا هاتنە خوارەوە، بەڵام بە دەستەسڕیش نەیدەسڕی..

پێم ووت: پێ دەچێ بیری کەسانی ئازیزت کردبێتەوە!!

ووتی: تۆ چوزانیت؟

ووتم: ئازیزی ئەوان لەچاوەکانتا دەبینم..

ووتی: بەڵێ زۆر زۆر ئازیزن.

ووتم: ئەی کەی پێیان شاد دەبیتەوە؟

ووتی: بەخوا لەهەموو ساتێکی سەفەردا ئاواتەخوازم پێیان شاد ببم، بەڵام شوێنەکە زۆر زۆر دوورە.

ووتم: ئەی شوێنەکەیان لەکوێیە؟

ووتی: دواهەمین دیدام لەگەڵی لە ئەمەریکا بوو پێش سێ ساڵ، بەڵام جیابووینەوە، و دوای ئەوە تەنها یان لەخەو یان خەیاڵ دەیانبینم..

ووتم: ئەی عاشق هەواڵی ئەو عیشقەتم پێ بدە، ئەگەر ئەمە خۆهەڵقورتاندن نەبێت لە کاری تایبەتی ژیانت.

بەخەندەیەکی بچوکەوە ووتی: نەخێر هەرگیز، لە نێوان من و یاسەمین هیچ نهێنیەك نەبوو، بەڵکو بە پێی گومانی من دڵخۆش دەبێ ئەگەر بەسەرهاتی خۆشەویستی مەزنی خۆمان بگێڕمەوە بۆت.. بەڵام با زانیاریەکی بچوکت بۆ ڕاست بکەمەوە، یاسەمین کچی خۆمە و تەمەنی دە ساڵ بوو.. منیش سەرسام بووم بەوە..

پاشان ووتی: ئایا حەزدەکەیت چیرۆکی خۆشەویستی گەورەمان ببیستی؟!

بە حەماسەوە ووتم: بەڵێ، زۆر حەزدەکەم.

ووتی: دە ساڵ لە (دەمام) دەژیام، خوای گەورە ئەو کچەی پێ بەخشیم و ناومنا ﴿یاسەمین﴾ پێش ئەوە کوڕێکم هەبوو نامنابوو ئەحمەد، هەشت ساڵ لەو گەورەتر بوو، لێرە کارم دەکرد لە بواری ئەندازیاریدا... من ئەندازیار بووم و پلەی دکتۆرام بەدەست هێنا بوو.. یاسەمین بەڵگە و نیشانەیەك بوو لەسەر جوانی، ڕوخسارێکی نورانی و فریشتەیی جوانی بوو.. کاتێ گەشتە تەمەنی ٩ ساڵ هەر لە خۆیەوە حیجابی پۆشی و دەستی کرد بە نوێژکردن، و دەستی کرد بە خوێندنەوەی قورئان بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش.. هەر کە ئەرکی قوتابخانەی تەواودەکرد، خێرا هەڵدەستاو بەرماڵە بچوکەکەی دادەخست و قورئانەکەی دەگرت بەدەستەوە و بە

خوێندنەوەیەکی منداڵانەی سیحراوی دەیخوێندەوە... پێم دەوت هەستە و یاری بکە لەگەڵ هاورێکانت. ئەویش دەیوت: هاورێی من قورئانە و هاورێی من پەروەردگارمە کە باشترین هاورێن... پاشان دەستی دەکرد بە قورئان خوێندن. ڕۆژێکیان هەستی بە ئازارێك کرد لە سکیدا لەکاتی خەوتندا.. منیش بردم بۆ بنکە تەندروستیەکەی نزیك ماڵی خۆمان، ئەوانیش چەند هێمن کەرەوەیەکیان پێدا و بۆ چەند ڕۆژێ ئازارەکەی کەمی کرد... پاشان ئازاری بۆ دەهاتەوە... بەو شێوەیە ئازارەکە چەند جارێ دووبارە دەبوویەوە، منیش لەو کاتەدا گرنگیم پێ نەدەدا... قەدەری خوا وابوو ئەو کۆمپانیایەی کارم تێدا دەکرد بەشێکی لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا کردەوە.. پێشنیاری بەرێوەبەری گشتیان بۆ کردم لەوێ و منیش ڕازی بووم... مانگێك تێنەپەڕی گواستمانەوە بۆ ئەمەریکا، من و خێزانم و ئەحمەد و یاسەمین... ناتوانم وەسفی ئاسودەیی خۆمانت بۆ بکەم بەهۆی ئەو فرسەتە زێرینەوە و سەفەرکردن و ژیان لە ئەمەریکا، ئەو وڵاتە زەبەلاحە، کە هەموو مرۆڤێ خەون دەبینێ بە سەفەرکردن بۆی.. دوای تێپەڕبوونی نزیکەی دوو مانگ، ئازارەکە بەردەوام تووشی یاسەمین دەبوو.. منیش بردم بۆلای پزیشکێکی پسپۆڕی هەناو... ئەویش پشکنینی تەواوی بۆ کرد و ووتی: پاش هەفتەیەك ئەنجامەکەی دەردەچێت و پێویست بە دڵەڕاوکێ ناکات.. قسەکانی پزیشکەکە دڵئارامی خستە دڵمەوە.. بەپەلە گەشتمان کرد بۆ شاری یاریەکانی ﴿ئۆرلاند﴾و لە گەڵ یاسەمیندا کاتێکی خۆشمان بەسەر برد.. لە یاریکردن و گەڕان لێرە و لەوێ... کاتێ سەرقاڵی خۆشی و شادی بووین، دەنگی مۆبایلەکەم هات و... دڵم کەوت.. کەس لە ئەمەریکا نیە ژمارەی من بزانێت. بێگومان ژمارەکە هەڵەیە، منیش دوودڵ بووم لە وەڵامدانەوە.. سەرەنجام پەنجەم نا بە ﴿ئۆکەی﴾دا..

– ئەلو.. کێ قسەدەکات؟؟

+ ئەلو.. جەنابی ئەندازیار چۆنیت.. داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر سەغڵەتم کردبیت من ﴿دەستیفن﴾م.. پزیشکی یاسەمین، ئایا دەتوانم سبەینێ لە عیادەکەم بتبینم؟

– ئایا هیچ ئەنجامێکی ناخۆش لەئارادا هەیە؟!

+ لە واقیعدا بەڵێ... بۆیە دەمەوێ یاسەمین ببینم.

چەند پرسیارێکی کرد پێش دەستنیشانکردنی کۆتایی.
- باشە، سبەینێ عەسر سەعات پێنج لە عیادەکەت ئامادە دەبین.. ترس و بیرۆکەی زۆر لە مێشکمدا تێکەڵ بوون.. نەمدەزانی چۆن هەڵسوکەت بکەم، لە بەرنامەی گەشتەکەشمان تەنها دوو ڕۆژمان مابوو.. یاسەمینیش لەوپەڕی ئاسودەیدا بوو.. چونکە جاری یەکەمی بوو بچێتە دەرەوە بۆ سەیران و گەڕان لەو کاتەوەی کە گەشتبووینە ئەمەریکا... لە کۆتاییدا پێم وتن کۆمپانیاکە دەیەوێ سبەینێ بگەڕێمەوە بۆ سەر کارەکەم، بۆ کارێکی بەپەلە... ئەوەش فرسەتێکی باشە بۆ موتابەعەی شیکردنەوەکانی یاسەمین.. هەموان ڕازی بوون بەو مەرجەی لە پشووی هاویندا بگەڕێینەوە بۆ «ئورلاند».. لە عیادە «دەستیمن» ویستی قسەکردن لەگەڵ یاسەمیندا بخاتە بارێکی ئاساییەوە.
وتی: یاسەمین چۆنیت.
- باشم سوپاس بۆ خوا.. بەڵام هەست بە ئازار و بێهێزی دەکەم، نازانم هۆکارەکەی چیە؟ دکتۆر چەند پرسیارێکی زۆری کرد.. پاشان تەقەتەقی کرد بە سەری و ووتی: فەرموو بۆ ژوورەکەی تر... لە ژوورەکەی تر دکتۆر وەکو گەردەلوول پێی ووتم.. ئاواتم دەخواست زەوی بقڵیشایەو قوتی بدامایە.
دکتۆر ووتی: ماوەی چەندە یاسەمین دەناڵێنێ بەو نەخۆشیەوە؟
ووتم: نزیکەی ساڵێکە..و ئێمەش هێور کەرەوەی پێ دەدەین و ئەویش باش دەبێت.
پزیشکەکە ووتی: بەڵام نەخۆشیەکەی بە مادە هێورکەرەوەکان باش نابێت.. ئەو توشی شێرپەنجەی خوێن بووە لە قۆناغەکانی کۆتاییدا... و تەنها تەمەنی زۆری شەش مانگە ... پێش هاتنتان پشکنینەکانم نیشانی لیژنەی نەخۆشیەکانی شێرپەنجەدا لە ناوچەکەدا و هەموان لە پشکنینەکانەوە وایان خوێندەوە... خۆمم نەگرت و دەستم کرد بە گریان و ووتم: داماوە بەخوا گوناح و داماوە، ئەو گوڵە جوانە.. چۆن دەمرێ و دنیا جێدێڵێ.. ژنەکەم گوێی لە دەنگی گریانمەوە بوو، هاتە ژوورەوە، کاتێ کە ئەنجامەکەی زانی.. بورایەوە... لەو کاتەدا یاسەمین و ئەحمەدی کوڕم هاتنە ژوورەوە...
کاتێ ئەحمەد هەواڵەکەی بیست باوەشی بە خوشکەکەیدا کرد و ووتی: هەرگیز شتی

وا نابیٚ.. یاسەمین نامرێت... یاسەمینیش بە ڕوخسارە گەشاوە بەرانەتەکەیەوە وتی: ئەمرم.. واتە چی ئەمرم؟ هەموان سەرسام بوون لەو پرسیارە.. پزیشکەکە وتی: واتە دەگەڕێیتەوە بۆلای خوای گەورە.. یاسەمین وتی: بەڕاستی، ئەگەڕێمەوە بۆلای خوای گەورە؟! ئایا گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە خراپە.. باوکە گیان ئایا فێرت نەکردووین کە خوای گەورە فەزڵی لە دایك و باوك زیاترە و لە هەموو خەڵکی و لە هەموو دنیا... ئایا گەڕانەوەم بۆلای خوا باوکەگیان وا لە تۆ دەکات بگریت و وا لەدایکم دەکات ببورێتەوە... بۆیە قسە بەرانەتە شەفافەکانی وەك گەردەلولێکی تر وابوو... ئەوەتا یاسەمین مردن بە گەشتێکی خۆش دادەنێت کە ئەویش گەیشتنە بە دیداری خۆشەویسترین زات کە پەروەردگارە.. پزیشکەکە وتی: هەر لە ئێستەوە دەبیٚ دەست بە چارەسەر کردن بکەین.

یاسەمین وتی: ئەگەر هەردەبیٚ بمرم ئیتر چارەسەر و دەرمان و خەرجی بۆ؟

+ بەڵیٚ، یاسەمین، ئێمەی تەندروستیش هەر دەمرین، ئایا مانای ئەوەیە نەخۆین و چارەسەر نەکەین و سەفەر نەکەین و نەخەوین و بنیاتی ئایندەمان نەنێین.. ئەگەر وا بکەین ژیان نامێنیٚ و زیندەوەر لەسەر زەویدا نامێنیٚ...

+ یاسەمین دەزانیت کە لە لەشی هەموو مرۆڤێکدا چەندین ئامێر هەیە هەمویان ڕاسپاردەن لە خواوە، خوای گەورە پێیداوین تا پارێزگاری بکەین، بۆ نموونە تۆ ئەگەر هاوڕێکەت یاریەکت بداتیٚ ئایا هەڵدەستیت بە شکاندنی یان گرنگی پیٚ دەدەیت؟

- بەڵکو گرنگی پیٚ دەدەم و پارێزگاری دەکەم.

+ بەو شێوەیەش کۆئەندامەکانی هەرس و دەمار و دڵ و گەدە و هەردوو چاو و هەردوو گویٚ، هەموویان ئامێرن و پێویستە گرنگیان پیٚ بدەیت و بیانپارێزی لە تیاچوون... ئەو دەرمان و ماددە کیمیاییانەی ئێمە پێت دەدەین دوو ئامانجمان هەیە لێی.

یەکەم: هێورکردنەوەی ئازاری نەخۆشیەکە...

دووەم: بەپێی توان پارێزگاری ئامێرەکانی ناو لەشت لە تیاچوون، هەتا کاتیٚ بە دیداری پەروەردگارت دەگەیت بڵێیت: بەپێی توانام پارێزگاری ئەو ڕاسپاردانەم کرد

که سپاردبووت به من و من بەرپرس بووم لێیان... ئەوەتا منیش گەڕاندمەوە بۆت، ئەوەشی کە فەوتاوە بەبێ نیازی من بووە...

– ئەگەر کارەکە ئاوایە، ئەوە من ئامادەم بۆ وەرگرتنی چارەسەر تاوەکو لە بەردەم خوادا نەوەستم وەك وەستانم لە بەردەم هاوڕێکەمدا ئەگەر کاتێ یاریەکە و پێویستیەکەیم شکاندبێ..

شەش مانگ تێپەڕی بە قورسی و خەفەتباری، بە نیسبەت خێزانێکەوە کە کچە بەناز و خۆشەویستەکەیان لەدەست دەیەن.. بە پێچەوانەی ئەوەشەوە، بەنیسبەت یاسەمینەوە هەر ڕۆژێ تێبپەڕیایە زیاتر ڕووی دەگەشایەوە و جوانتر دەبوو، وە زیاتر نزیك دەبوویەوە لە خوای گەورە... هەستا بە لەبەرکردنی چەند سورەتێکی قورئانی پیرۆز.. لێمان پرسی: بۆچی قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەیت؟ ووتی: زانیومە کە خوای گەورە قورئانی پیرۆزی خۆشدەوێت... بۆیە ویستم پێی بڵێم: پەروەردگارا، چەند سورەتێکی قورئانم لەبەرکرد، چونکە تۆ ئەو کەسەت خۆش دەوێ کە لەبەری دەکات... و لە نوێژەکانیدا زۆر دەوەستا.. و زۆر جاریش لەسەر پێخەفەکەی نوێژی دەکرد.. دەربارەی ئەوەش لێم پرسی؟ووتی: بیستومە کە پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرموێ: ﴿قرة عيني الصلاة﴾ واتە: {سۆمای چاوم نوێژە}، بۆیە حەزم کرد نوێژ ببێتە سۆمای چاوم.

کاتێ ماڵئاوایی هات، و ڕووناکی ڕوخساری گەشاندەوە، و بزەیەکی فراوان کەوتە سەر لێوانی... سورەتی ﴿يس﴾ ی دەخوێند، کە لەبەری کردبوو... بە ناڕەحەتی دەیخوێندەوە هەتا تەواوی کرد، پاشان سورەتی ﴿الحمد﴾ی خوێند...و سورەتی ﴿قل هو الله احد﴾ و پاشان ﴿ايه الكرسى﴾ پاشان ووتی: ﴿سوپاس بۆ ئەو خوایەی فێری قورئانی کردم و هەندێکیم لەبەرکرد و هێزی بە لەشمدا بۆ نوێژکردن و یارمەتیدام و ژیانی ڕووناك کردمەوە بە دایك و باوکێکی ئیماندار و موسڵمان و خۆڕاگر... سوپاسێکی هەمیشەیی و بێ پایان.. و سوپاسی دەکەم کە بە بێباوەڕ و سەرپێچیکار و نوێژنەکەر نەیگێڕاوم﴾.

پاشان ووتی: باوکە گیان کەمێك خۆت بنوشتێنەرەوە، ئەوە سەقفی ژورەکە شەقی برد و چەند کەسێ دەبینم کە دەم بەخەندەن و پۆشاکی سپیان لەبەردایە، بەرەو لای

من دێن، و داوام لێدەکەن لەگەڵیاندا بم بۆ فڕین بۆلای خوای گەورە. زۆری نەبرد چاوەکانی داخست و ڕوخسار بەخەندە و گەشتی کرد بۆلای ﴿الله﴾ی پەروەردگاری جیهانیان... پاشان باوکە دەستی کرد بە گریان.. زۆر بەسەختی گریا..و وای کرد لە هەموو خەڵکی ناو هۆڵەکە تەماشای ئەو شوێنە بکەن کە ئێمەی لێ دانیشتبووین.. پێم ووت: ئارام بەرەوە.. ئەو ئێستا لەژێر ڕەحمەت و بەزەیی و چاودێری پەروەردگاریدایە.. خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات و ئارامی بە دڵتان ببەخشێت..

ووتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت.. بەڕاستی کچێکی گوێڕایەڵ و باوەڕدار و خواپەرست بوو... تەنانەت تا دوا ساتی ژیانی دەستبەرداری نوێژەکانی و قورئان نەدەبوو..

خوای گەورە شادی بکات بە بەهەشتی بەرینی خۆی و فراوانی ڕەحمەتی خۆیەوە.

## ٣٧- ﴿چیرۆکێکی واقیعی﴾

ئەم چیرۆکە لە چنراوی خەیاڵ نیە و ئەندێشە و ئەفسانە نیە، پاڵەوانەکەی ئافرەتێکی ﴿غامیدی﴾یە.. ژیانێکی پابەند و گوێڕایەڵ ژیاوە بۆ پەروەردگاری.. تەنانەت سونەتەکانیشی ئەنجام داوە و کەمتەرخەم نەبووە تیایاندا، سەرەتای چیرۆکەکە ئەو گەشتە بوو کە ڕەخسا بۆ مێردەکەی.. پێکەوە سەفەریانکرد بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دوای ئەوەی ئەم ڕازی بوو، کاتێ گەشتنە ویلایەتە یەکگرتووەکان چوونە ئوتێلەوە، لە ژێر ئوتێلەکەشدا سوپەرمارکێتێك هەبوو.. ئافرەتەکە دەچوو بۆ ئەو بازاڕە، بەڵام چۆن دەچوو بە چ شێوازێك، ئایا دوای ئەوەی دووربوو لە چاوی ناسراوان ئایا پۆشاکی شەرعی لادەبرد.. نەخێر چونکە لێی ڕوون بوو کە چاوێك دەیبینێت و هەرگیز بێئاگا نیە لێی.. کە ئەویش چاوی پەروەردگارە.. بەڵێ کەسێکی باڵاپۆشی بەشەرم بوو، دەهات بۆ ئەو سوپەرمارکێتە و پێداویستیەکانی دەکڕی.. ئافرەتێکی ئەمریکیش کاری دەکرد لەوێ ، کاتێ ئەم ئافرەتە موسڵمانەی دەبینی بە پۆشاکی ڕەش و نامۆوە دێت، ئەو ئافرەتە ئەمریکیە شوێنی خۆی بەجێ دەهێشت و دەهات بۆ لای ئافرەتە باڵاپۆشەکە و پرسیاری دەکرد تا لە پێداویستیەکانی دەبوویەوە.. چونکە سروشتی ئەمریکیەکان وایە، حەزیان لە شارەزابوونە لەشتە نامۆ و سەیرەکان..ئەم ڕووداوە زیاتر لە جارێك دووبارە بوویەوە.. تا ئافرەتە باڵاپۆشەکە دڵنیابوو کە ئەو ئافرەتە ئەمریکیە حەزدەکات نهێنی ئەو پۆشاکە و پابەندبوون پێیەوە بزانێت.. بۆیە هەندێ نامیلکەی پێشکەشکرد بە زمانی ئینگلیزی بۆ ئاشنا بوون بە ئیسلام و لێبووردەیی ئیسلام و پارێزگاری ئافرەت کە نابێت بکرێت بە کاڵایەکی هەرزان... دوای ئەو نامیلکانە ئافرەتە باڵاپۆشەکە پێشنیاری بۆ کرد کە پۆشاکی شەرعی تاقیبکاتەوە و تاقمێك پۆشاکی شەرعی وەك ئەوەی خۆیی پێ بەخشی. تا لەبەری بکات.. بۆیە ئافرەتە ئەمریکیەکەش مۆڵەتی لە خاوەن کارەکە وەرگرت بۆ چەند ساتێك و پێی ووت کاری گرنگی هەیە.. بەو پۆشاکەوە ڕۆشت بۆ ماڵەوە و لەوێ لەبەری کرد و پاشان بەو پۆشاکانەوە گەڕایەوە و لەسەر کورسیەکە دانیشت.. هەڵدەستا بە خزمەتی کڕیاران، کە ئەوەش بووە هۆی شتێکی سەیر.. هامۆشۆکارانی ئەمریکی بۆ ئەو بازاڕە زیادیان کرد، تا ئەو پۆشاکە

ببینن.. سبحان الله وەکو ووتم ئەو گەلە حەزیان لە ئاشنا بوونە بە شتە نازانراوەکان و حەزکردن بە بینینی شتی سەیر، کاتێ خاوەن کارەکە ئەو قەرەباڵغیەی بینی، فەرمانیدا بە کچە فەرمان بەرەکە کە ئەو پۆشاکە ببێتە پۆشاکی ڕەسمی کارکردنی.. دوای ماوەیەك ئەو کچە ئەمریکیە لەژێر کاریگەری نامیلکەکان و ئامۆژگاریەکاندا کە ئافرەتە موسڵمانەکە ئاراستەی دەکرد موسڵمان بوو... دوای موسڵمان بوونی شتێکی سەیر ڕوویدا، ئافرەتەکە داوای لە مێردەکەی خۆی کرد کە ئەو ئافرەتە ئەمریکیە بخوازێت.. مێردەکەشی سەرسام بوو، چۆن ئەو ئافرەتە ئەمریکیە بخوازێ..و چۆن ژنەکەی داوای کاری وا دەکات.. بەڵام ژنەکەی سووربوو لەسەر ئەو کارە، ناچار مێردەکەی ڕازیبوو بەو هاوسەرگیریە و ئافرەتە ئەمریکیەکەی مارەکرد، پاشان گەڕانەوە بۆ خاکی سعودیە و قەدەری خوا وابوو ئافرەتە عەرەبەکە توشی نەخۆشیەکی مەترسیدار بوو، ژنە ئەمریکیەکەش شەونخونی دەکێشا بە دیاریەوە و تیماری دەکرد، هەتا خوای گەورە گیانی کێشا، لە خوای بە توانا داواکارین بە بەهەشتی بەرین شادی بکات، ئافرەتە ئەمریکیەکەش ئێستا چەند منداڵێکی هەیەو خەڵکی گەڕەك شایەتی ئاکار و ڕەوشت بەرزیان بۆ دەدەن..

# ٣٨- ﴿چێژی خواپەرستیی شەوان تایبەتە﴾

یەکێ لە قوتابیانی زانست بەسەرهاتێکی بۆ گێڕامەوە و ووتی: چەند خوشکێکی بەڕێزی موسڵمانم لەلا بوو، وانەی ﴿دەقە زانستیەکان﴾ -المتون العملیه-م پێ دەوتنەوە لە سەنتەرێکی ئافرەتاندا. ووتی: یەکێ لە لاوە ڕەوشت بەرزەکان خوازبێنی خوشکێکیانی کرد، لە شەوی هاوسەرگیریدا، بەڵکو دوای نوێژی عیشا، کاتێ من لە کتێبخانەکەمدا بووم.. پەیوەندی پێوە کردم. منیش لەدڵی خۆمدا ووتم: خێربێت إنشاء الله.. خوشکەکە پرسیاریکرد سەبارەت بە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) کە ئەبوهورەیرە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی:(( رَحِمَ اللهُ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيْلِ ، فَصَلَّى وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ ، فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ ، رَحِمَ اللهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ ، فَصَلَّتْ وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا ، فَإِن أَبَى نَضَحَتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ )) رواه أبو داود بإسناد صحيح.. واتە: ﴿خوای گەورە ڕەحم بەو پیاوە دەکات کە لە شەودا هەڵدەستێتەوە و نوێژ دەکات و پاشان خێزانی خەبەر دەکاتەوە، ئەگەر خێزانەکەی هەڵنەستا، ئاو دەپرژێنێ لە ڕوخساری، و خوای گەورە ڕەحم بەو ئافرەتە دەکات کە لە شەودا هەڵدەستێتەوە و نوێژ دەکات و پاشان مێردەکەی خەبەر دەکاتەوە ئەگەر مێردەکەی هەڵنەستا، ئاو دەپرژێنێ لە ڕوخساری﴾.

ئەزانن بۆچی پرسیاری دەکرد؟ دەیپرسی ئایا دروستە مێردەکەی هەستێنێ بۆ شەونوێژ با یەکەم شەوی هاوسەرگیریشیان بێت.. ئەو برایە دەڵێ: منیش وەڵامم دایەوە بەوەی کە خوا خستبوویە دڵمەوە.. منیش بە خۆمم ووت: سبحان الله، ئا لەو شەوەدا پرسیار دەکات سەبارەت بە شەو هەستان و خەبەرکردنەوەی مێردەکەی.. پیاوانی ئێمەش لەشەوی یەکەمدا نوێژی بەیانیشیان دەفەوتێ!... بەخوا لە خۆشیاندا فرمێسك هاتەخوار بە چاوانمدا بەهۆی ئەو هەڵوێستە جوانەوە.. ئەگەر دەلالەت بێت لەسەر شتێك ئەوە بێگومان دەلالەتە لەسەر خێر و بەرەکەت لەناخی خوشکانماندا.. هەتا دەڵێ: من وا گومانم دەبرد کە هەموو ئافرەتان لەشەوی یەکەمدا تاکە خەمیان خۆڕازاندنەوە و خۆ جوانکردنە.. سوپاسی خوا دەکەم کە خوای گەورە گومانەکەمی بە ڕاست نەگێڕا لەوەدا و ئەوەتا لە نەتەوەکەماندا ئافرەتانێك هەن کە تاکە خەمی هەمیشەییان لەهەموو کاتێکدا بەرز ڕاگرتنی فەرمانەکانی خوای

گەورەیە.. ئەوەتا دایکی یەکیٚ لە کچە بەڕیٚزەکان دەڵیٚ: کچەکەم تەمەنی تەنها حەڤدە ساڵ بوو، تەنها لە قۆناغی لاویٚتیدا نەبوو بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا لە قۆناغی هەرزەکاریدا بوو.. وەك دایکی دەڵیٚ عاشقی شەو بووبوو.. ئەگەر شەو دابهاتایە هەڵدەستا.. بە هاوین و زستاندا ئەوە پیشەی بوو، شەو دریٚژ بوایە یان کورت.. هەموو شەویٚك ئەوە پیشەی بوو.. هەموو شەویٚ دوو جزء قورئانی دەخویٚند.. پەیمانی بەخوای دابوو نە زیادی بکات نە کەم.. لە مانگیٚکدا دووجار خەتمی قورئانی دەکرد تەنها لە نویٚژەکانی شەودا.. وەك دایکی دەڵیٚ من بەزەییم پیایدا دەهاتەوە.. بەڵام بۆم دەرکەوت خۆشی و بەختەوەری ئەو لە شەو هەستانداییە.. و داواکاربووم لە خوای گەورە کە دامەزراوی بکات لەسەر ووتەی جیٚگیری لە ژیانی دنیاو لە ئاخیرەتدا، و کۆتایی ئیٚمە و ئەویش بەخیٚر تەواو بکات..

# ٣٩- ﴿ئەمریکیەك بە خەندەیەك موسڵمان دەبێ﴾

بـانگخوازی ناسـراو شـێخ ﴿نبیـل العوَضـی﴾ لـە موحازەرەیەکیـدا بـە ناونیـشانی ﴿چیرۆکەکان لە واقیعەوە﴾ ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: من لە ئەمەریکا بـووم، یـەکێ لـەموحازەرەکانم پێـشکەش دەکـرد، لـە نیوەیـدا یـەکێك هەسـتایەوە و قسەکانی پێ بڕیم.. ووتی: مامۆستا تەڵقینی شایەتومان بە فلان کەس بکە، ئامـاژەی بە ئەمریکیەکدا لە تەنیشتیەوە.. ووتم: الله اکبر... ئەمریکیەکەش لەبەردەم خەڵکەکەدا لێم نزیك بوویەوە.. پێم ووت: چی وای لێکردیت ئیسلامت خۆش بوێت و موسڵمان ببیت؟ ووتی: من سەروەت و سامانێکی زۆرم هەیە و خاوەنی کۆمپانیام.. بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان هەستم بە بەختـەوەری نـەکردووە.. لـە کۆمپانیاکەمـدا فەرمانبـەرێکی هینـدی موسڵمان کـارم بـۆ دەکـات، موچـەکەی کەمـە، هـەرکاتێ بـچومایە بـۆ لای بەخەنـدەوە دەمبینـی.. منـیش ملیـۆنێرم و ڕۆژێ لـە ڕۆژان دەم بەخەنـدە نـەبووم.. بـە خـۆمم ووت: من سەروەت و سامانم هەیە و خـاوەنی کۆمپانیـام، کەچـی ئـەو فەرمانبـەرە هـەژارە دەم بەخەندەیەو منیش دەم بەخەندە نیم.. ڕۆژێکیان چووم بۆلای و ووتم: دەمەوێ دانیشم لەگەڵتدا.. سەبارەت بەو خەنـدە هەمیشەییەی پرسیارم لێ کرد. پێی ووتم: بەڕاستی مـن موسـڵمانم و شـایەتومانم هێنـاوە کـە بێجگـە لـە ﴿الله﴾ پەرسـتراوی تـر نیـە، و محمـدیش پێغەمبـەری خوایـە.. پـێم ووت: ئایـا واتـە موسـڵمان بـە درێـژایی ژیـانی بەختـەوەرە؟ ووتـی: بـەڵێ، ووتم: ئـەوە چـۆنە؟ ووتـی: چـونکە ئێمـە گوێمـان لـە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) بووە کە دەفەرموێ: (( عَجَباً لأمرِ المُؤمنِ إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ لَهُ خيرٌ ولَيسَ ذلِكَ لأحَدٍ إلاَّ للمُؤْمِنِ : إنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكانَ خَيراً لَهُ ، وإنْ أصَابَتْهُ ضـرَاءُ صَـبَرَ فَكانَ خَيْراً لَهُ )) رواه مسلم .

واتە: ﴿ سەیرە کاری موسڵمان، بە راستی هەموو کارەکانی خێر و چاکەیە بۆی، و ئەوە بۆ هیچ کەسی تر نیە بێجگە لە ئیماندار: ئەگەر توشی خۆشی بوو، سوپاسگوزار بوو، ئەوە خێر و چاکەیە بۆی، و ئەگەر توشی ناخۆشی بوو، ئارامی گرت، ئەوە خێر و چاکەیە بۆی ﴾.

وە کاروباری ئێمەش هەمووی لەنێوان خۆشی و ناخۆشیدایە.. نارەحەتی ئارامگرتنە بۆ خوا و خۆشی و شادیش سوپاسکردنە بۆ خوا، و ژیانمان هەموی خۆشیە لەناو

خۆشیدا، پێم ووت: دەمەوێ منیش بێمە ناو ئەم ئاینەوە. ووتی: ﴿اشهد أن لا إله إلا الله و اشهد أن محمداً رسول الله﴾ ﴿العوضی﴾ دەگەڕێتەوە بۆ قسەکانی شێخی بانگخواز و لەسەر زمانی ئەو دەڵێ: شێخ ووتی: لەبەردەم خەڵکەکەدا گریا.. چەند کەسێکیش هاتن و دڵنەواییان کرد.. پێم ووتن: وازی لێبێنن با بگری.. کاتێ لە گریانەکەی بوویەوە، پێم ووت: چی وای لێکردیت کە بگریت؟ ووتی: بەخوا خۆشیەك چووە ناخمەوە کە چەندین ساڵە هەستم بە خۆشی وا نەکردووە. پاشان ﴿العوضی﴾ سەبارەت بەو چیرۆکە دەڵێ: سینەفراوان بوون بە تەماشاکردنی زنجیرە و فیلم و ئارەزوبازی و گۆرانی نیە، هەموو ئەوانە سنگی مرۆڤ دەگوشن، بەڵکو سینە فراوانی بە خوێندنەوەی قورئان و ڕۆژوو گرتن و بەخشین و خێرکردنە ﴿أَفَمَنْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَى نُورٍ مِنْ رَبِّهِ فَوَيْلٌ لِلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ أُولَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ(٢٢)﴾**الزمر**.. واتە: ﴿ئایا کەسێ خوا سنگی کردبێتەوە بۆئیسلام و ئیتر ئەو لەبەر ڕووناکی خوای خۆیدا بێ، ئەوکەسە وەك کەسێکی دڵ تاریك وایە خوا هیدایەتی نەدابێ؟ دەی هاوار بۆ ئەکەسانەی دڵیان ڕەق بووەو یادی خوا نایەت بە دڵیانا، ئەوانە لەگومڕاییەکی ئاشکراو دیاردان﴾.

## ٤٠- ﴿منداڵێکی بەریتانی لە خودی خۆیەوە موسڵمان دەبێ﴾

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: ﴿كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ﴾.. واتە: ﴿هەموو منداڵێکی لەدایك بوو لەسەر فیترەتی پاك لەدایك دەبێ، بەڵام باوك و دایکی دەیکەن بە جولەکە یان مەسیحی یان مەجوسی (ئاگر پەرست)﴾.

جۆرجیا کچە منداڵێکی بەریتانیە بە فیترەت موسڵمان دەبێ و پیتی عەرەبی دەڵێ و باسی ناوی ﴿الله﴾ دەکات و ڕایدەگەیەنێ کە موسڵمان بووە، هەرچەندە لەو کاتەدا تەمەنی پێنجساڵیش نابێت. ئەمە بەسەرهاتی ﴿جۆرجیا﴾یە لەگەڵ ئیسلامدا، بێگومان بەهەموو پێوەرەکان چیرۆکێکی سەیرە... با بوار بدەین بە دایکی کە ناوی ﴿سامانشا﴾یە، بەسەرهاتەکەمان بە درێژی بۆ بگێڕێتەوە.

﴿سامانشا﴾ دەڵێ: کە دواتر ناوی خۆی گۆڕی بۆ ﴿سەمیرە﴾ دوای ئەوە کە موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند.. بەڕاستی ئەوە بەسەر منداڵەکەمدا ڕوویدا دەڵێی ئەفسانەی پێشینانە. جارێکیان منداڵەکەم نەستەلەیەکی لە یەکێ لە دوکانەکان کڕی، و وشەی عەرەبی لەسەر نوسرابوو، نەیدەتوانی لێی تێبگات، هەمیشە پرسیاری ئەو پیتانەی دەکرد و ئەو گەلەی کە ئەو جۆرە خەتە بەکاردەهێنن، هیچم شك نەدەبرد ئەوە نەبێت دووری بخەمەوە و بۆم ڕوون دەکردەوە کە عەرەبەکان تیرۆریستن و بەرپرسن لە مردنی ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی بێتاوان، هەرچەندە ئەو بەسەرهاتانە سوودی نەبوو بۆ کچێکی وا بچووك کە دڵی پڕ بووبوو لە ڕووناکی ئیمان، و بەردەوام داوای لە هەموان دەکرد کە دەیەوێ کتێبی خوای دەست بکەوێت، کە من هەستام بە کڕینی بۆی، وەك دیاریەك لە جەژنی پێنجەمین ساڵی لەدایك بوونیدا لە گەڵ جلی تایبەت بە نوێژکردن کە بە ﴿خۆڕایی﴾ دەیاندا بە هەرکەسێ کە ئەو کتێبە پیرۆزەی موسڵمانان بکڕێت، وەك هاندانێك بۆ کچە بچوکەکان بۆ نوێژکردن.

پاشان چی ڕوویدا؟

** لەماڵەکەماندا ئاگرێکی گەورە کەوتەوە هەموو شتێکی سوتاند تەنها ئەو قورئانە پیرۆزە نەبێت، ئەوەش لە شارەکەمان ﴿کنت﴾ کە لە لەندەنی پایتەختەوە نزیك بوو،

وە لەو ڕۆژەوە بڕیارمدا پارێزگاری ئەو منداڵەم بکەم، و هەروەها باوکیشم کە داوای لە هەموان کرد ناڕەحەتی نەکەن و سەرزەنشتی نەکەن، چونکە ئەوەی ڕوویدا بە ڕاستی موعجیزەیەکی ڕاستەقینە بوو... وە گەورەترین نمونەیە لەسەر ئەوەی کە سەردەمی موعجیزە هێشتا کۆتایی نەهاتووە.. و هەروەها سەیر لەوەدا بوو سووربوو لەسەر لەبەرکردنی پۆشاکی نوێژ کردنەکە، کە دیاریەکی خۆڕایی بوو بۆ هەرکەسێ کە قورئانێکی پیرۆز بکڕێت.. بەرماڵەکەی لەسەر زەوی دادەنا و نوێژی دەکرد.

– ئەی کێ فێری نوێژ کردنی کرد؟

+ هیچ کەس، خۆی هەڵدەستا بەو جوڵەیەی کە موسڵمانان لە نوێژەکانیاندا پێی هەڵدەستن، بەبێ ئەوەی قسەبکات.

– ئەی سەبارەت بەوە پەرچە کرداری تۆ چۆن بوو، وە ئایا تۆ دڵنیایت کە ئەو کچەت کاریگەر نەبووە بەیەکێ لە هاوڕێ موسڵمانەکانی، چونکە لەندەن پڕیەتی لە موسڵمانان؟

+ سەرەتا دڵنیاتان دەکەم کە ئێمە لە شارێکدا دەژیاین تەنانەت یەك موسڵمانیشی تێدا نەبوو، وە مزگەوتی تێدا نەبوو، کچەکەم لە قوتابخانەیەك دەیخوێند پێیان دەوت ﴿هارلو﴾.. وە هەستام بە سەردانێك بۆ ئەوێ و دڵنیابووم کە قوتابی موسڵمانی لێ نیە...

ئێمە خێزانێکی دیندار نەبووین ڕانەهاتبووین کە سەردانی کەنیسشە بکەین، و هەروەها ئاهەنگێڕان بە جەژنی زاینی پیرۆزەوە بریتی بوو لە بۆنەی کۆمەڵایەتی نەك بۆنەی ئاینی و لەسەر شێوازێکی تەقلیدی کۆن.

– ئەی چی وای لەتۆ کرد موسڵمان ببیت؟

+ ئەوەی بەسەر کچەکەمدا ڕوویدا پاڵی پێوەنام لە ئینتەرنێتدا سەبارەت بەو ئاینە زانیاری پەیدا بکەم.

– ئەی چی بوو ئەو بارودۆخە، و بۆچی ئەو جەنگە هەمە جیە دەکرێتە سەر ئیسلام کە ڕۆژئاوا ڕابەرایەتی دەکات بە سەرۆکایەتی ئەمریکا.

+ ژمارەیەکی زۆر زانیاری گرنگ و مەترسیدارم خوێندەوە.. کە دای لە دڵم، و هەروەها ئەوەی کە ڕوویدا بەسەر کچەکەمدا وای لێکردم بڕیارێك بدەم کە گرنگترین

بڕیار بوو له ژیانمدا، كه ئەویش شوێنكەوتنی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە بەشێوازێكی دروست.. بۆیه لەگەڵ كچەكەمدا ڕۆشتم بۆ مزگەوتی مەركەزی له لەندەن لەوێ چاوم كەوت به دكتۆر مەنصور مالیك كه ژمارەیەكی زۆر كتێب و زانیاری بەسوودی پێدام، و هەوڵی نەدەدا پاڵم پێوەنێ بۆ هەستان به هەر شتێ كه باوەڕم پێی نەبێ، بەڵكو بەشێوەیەكی تەدریجی خەریك بوو لەگەڵماندا... لەو ساتەدا كچەكەم شایەتومانی هێنا، و ناوی خۆیی له ﴿جۆرجیا﴾وە گۆڕی بۆ ﴿جەمیلە﴾ منیش به شوێنی ئەودا و بەو جێگیریە شایەتومانم هێنا و ناوی خۆمم گۆڕی بۆ ﴿سەمیرە﴾.

– ئەی چ هۆكارێ وای لێ كردن سەردانی ئیمارات بكەن؟

+ له ڕێگای تەلەفزیۆنەوە مەراسیمی ﴿حەج﴾م بینی، بۆیه داوام له بەڕێز كاك ﴿منصور﴾ كرد، هاوكاریمان بكات بۆ زیارەتی ئەو خاكه پیرۆزە، بەڵام پێی ڕاگەیاندم سەردان بۆ سعودیە نارەحەتە، پێویستە مەحرەمێكم لەگەڵدا بێت.. بۆیه سەردانێكی ڕێكخست بۆمان بۆ ئیمارات، چونكه كوڕەكەی لەوێ نیشتەجێ بوو، بەرنامەیەكی بۆ دانانین بۆ سەردانی مزگەوتەكانی موسڵمانان.

– ئایا هەستت به هیچ ترسێك دەكرد دوای ئەوەی موسڵمان بوون، و ئایا پەرچەكرداری هاوڕێیان و خزمانتان چۆن بوو بەرامبەر بەو هەڵوێستەتان؟

+ نەخێر، هەستم به هیچ ترسێك نەدەكرد، و توشی هیچ نارەحەتیەكیش نەهاتم، بەڵام هەندێ كەس به سەرسامیەوە دەیانڕوانیه ئەو گۆڕانه و پرسیاریان دەكرد، به شێوەیەكێ له هاوڕێكانم لێی پرسیم: ﴿ ئەوە چیتان لێ هاتووە، ئایا شێت بوون؟!﴾ مێردەكەشم بەهۆی موسڵمان بوونمەوە لێم جیابوویەوە له كاتێكدا ﴿جاكوب﴾ی كوڕم ﴿كه تەمەنی ١٣ ساڵ بوو﴾ و ﴿میجان﴾ی كچم ﴿كه تەمەنی ١٠ ساڵ بوو﴾ زۆر بێتاقەت نەبوون بەو ڕووداوە، بەڵكو كۆمەكی من و خوشكه بچوكەكەیان دەكرد.

– ئایا ژیانت چۆن بووە پێش موسڵمان بوون و دوای موسڵمان بوون؟

+ پێش ئەوەی موسڵمان بم، ژیانێكی بێهودە دەژیام، كه پڕبوو له گوناه و تاون، بەڵام كاتێك ئیسلام چووە دڵمەوە ژیانم گۆڕا بۆ ئارامی و هێمنی و دڵنیایی...

– ئەو پلانه چی بوو كه ﴿دوبەی﴾ ئامادەیكرد بۆتان كاتێ لەو وڵاتەدا بوون؟

+ گەشتێكیان ڕێكخست بۆمان بۆ سەردانی مزگەوتەكان، و هەروەها لەلایەن

خێزانێکی نیشتەجێی ئەویّ میوانداری کراین، تا لەنزیکەوە ئاگاداری شێوازی ژیانی موسڵمانان بین... و هەروەها ﴿ئەوقافی دوبەی﴾ گەشتێکی بۆ ڕێکخستین بۆ خاکی پیرۆزی مەککە بۆ ئەنجامدانی عەمرە، و پێشنیاریان بۆ کردین کە وانە بە ﴿جەمیلە﴾ بوترێتەوە سەبارەت بە مەنهەجەکانی ئیسلام، ئەوەش لە قوتابخانە ئیسلامیەکاندا کە تایبەتمەند بوو.. ئایا لێرە لە دوبەی بێت یان لە بەریتانیا، ئەوەش ڕێکخرا لە لایەن خوشکە ﴿ئیمان الهاشمی﴾ سەرۆکی بەشی موسڵمانە نوێکان، کە باسی کچەکەمی بەو شێوەیە دەکرد کە ئەو ڕووداوەی بەسەر کچەکەمدا ڕوویداوە بە موعجیزە لێکی دەدایەوە، و ڕووداوێك بووە کە پێشتر ڕووی نەداوە، یان لەوانەیە خەونێکی ڕووناك بێت کچەکە بینیبێتی، بەڵام هەرکامیان بێت، ئەوەی کە ڕوویداوە دیاریەکی پیرۆزی ئاسمانی بووە..

# ٤١- ﴿چیرۆکێك بەهۆیەوە زەوی لەرزی﴾

خاتونێك هەر لەسەرەتای مانگەکانی سك بوونیدا مێردەکەی وەفاتیکرد، لەو پیاوە کچێکی هەبوو تەمەنی نزیکەی ﴿٤﴾ ساڵ بوو.. کاتێ ساتی منداڵ بوونەکەی نزیك بوویەوە، ئەو ئافرەتە وا هەستی دەکرد کە فریشتەی ئاسمانەکان و زەوی لە ساتی منداڵ بوونیدا گیانی دەکێشێت، بۆیە داوای لە براکەی کرد کە چاودێری کچەکەی و ئەو ﴿ساوا﴾ نوێیە بکات، لەساتی وەفات کردنیدا وا دیاربوو کە گیانێکی شەفاف و ئاسکی هەیە و هەستی بەوە دەکرد کە چاوەڕوانی دەکات لە کاتێکی نەزانراو، کاتێ چووە نەخۆشخانە بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری منداڵ بوون، لەو ساتەدا کە خوای گەورە ساوایەکی پێ بەخشی فریشتەی مردن گیانی ئەمی کێشا، کاتێ براکەی هەستا بە ئەسپەردەکردنی گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان و خوشکەزاکەی و ساوا بچوکەکەی پێ بوو، کەچی ژنەکەی هەڵشاخا پیایدا و پێی ووت: یان دەبێ من لەم ماڵەدا بم، یان خوشکەزاکەت؟؟؟ خاڵی منداڵەکان پەنا بەخوا بەو شەوە هەستاو دوو منداڵەکەی برد بۆ گۆڕستان و هەستا بە هەڵکەندنی گۆڕی خوشکەکەی و منداڵە ساوا تازە لەدایك بووەکەی خستە ناو گۆڕەکەوە لە نیشت دایکە مردووەکەیدا، و کاتێ ویستی منداڵە بچووکەکەی تر بخاتە ناو گۆڕەکەوە کە تەمەنی ٤ ساڵان بوو، کچەکە لەترساندا و لە تاریکایی ئەو شەوەدا دەستی کرد بە گریان، کە پێشتر تاریکایی وای نەدیبوو... خاڵەکەشی ﴿شەقشەقە﴾یەکی دایە دەستی و پێی ووت: نەترسیت، دایکت ئێستا هەڵدەستێ بەدەمتەوە، پێویستە تۆش لە تەنیشتی خۆیەوە ببینێتەوە، کچەکەش بڕوای بە خاڵۆکەی کرد و کاتێ کە منداڵەکە دەگریا خاڵۆی پێی ووت: کاتێ منداڵە ساواکە دەگری ﴿شەقشەقە﴾ی بۆ ڕاوەشێنە و پێی ووت: منیش هەموو ڕۆژێ یەم بۆ لات بۆ ئەوەی خواردنتان بۆ بێنم و دڵنیابم لە تۆ و لە دایکت و لەو منداڵە ساوایە... پاشان قەبرەکەی پڕکردەوە و ڕۆشت.. لە بەرەبەیانی ڕۆژی داهاتوودا و لەکاتی ڕەت بوونی کەسێك بە تەنیشت قەبرەکەدا، گوێی لە گریانی منداڵێك و ﴿شەقشەقە﴾یەکەوە بوو، لەناو قەبرەکەدا، زۆر ترساو خێرا ڕایکرد، پاشان جارێکی تر گەڕایەوە، بۆ ڕۆژی دواتر هەمان دەنگی بیستەوە، بۆیە بە خێرایی و لە ترساندا ڕایکرد، هەر بیری دەکردەوە چی ڕوو دەدات لەو قەبرەدا، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ

نەڕۆشتەوە بەلایدا، ماوەی ﴿١٥﴾ ڕۆژ، پاشان سەرلەنوێ گەڕایەوە تا گوێی لەهەمان دەنگەوە بێت، بۆیە کۆمەڵێ مەلا و پیاوی ئاینی کۆکردەوە و بەرەو گۆڕەکە لەگەڵیدا ڕۆشتن، بەڵێ لەوێ گوێیان لەدەنگی گریان و شەقشەقەوە بوو.. هەستان بە هەڵکەندنی گۆڕەکە ﴿بەڵێ موفاجەئات ڕوویدا کە لەش دێنێتە لەرزین، منداڵە ٤ ساڵانەکە و منداڵە ساواکە زیندوو بوون﴾ لە تەنیشت تەرمی دایکیاندا، بۆیە هەواڵیاندا بە پۆلیس و پزیشکی شەرعی.. کاتێ پرسیاریان لە منداڵەکە کرد سەبارەت بەو ڕووداوە، ئەویش بەسەرهاتی خاڵۆی گێڕایەوە.. وتیان: چۆن ئەو ماوەیەت بەسەر برد و هەر زیندووش بوویت لەو گۆڕەدا بەبێ خواردن و خواردنەوە، تۆ و ئەو منداڵە ساوایە؟... وتی: کاتێ براکەم دەگریا شەقشەقەکەم بۆ ڕادەوەشاند و دایکیشم لە خەوەکەی هەڵدەستا و شیری دەیایە، پاشان دەنوستەوە، کاتێکیش من هەستم بە برسێتی دەکرد، پیاوێك کە نەمدەناسی و پۆشاکی سپی لەبەردا بوو خواردنی دەیامێ و دەڕۆشت.. ئێمە لە ماڵێکی فراوان و ڕووناك و جواندا بووین. و کاتێ پرسیار لە پزیشکی شەرعی کرا سەبارەت بە حاڵەتی تەرمەکە کاتێك کە دوو منداڵەکەیان دەرهێنا لە وەڵامدا وتی: لاشەی گەرم بوو، وەك ئەوەی لە ژیاندا بووبێت.. نەك دوای تێپەڕبوونی بیست ڕۆژ بەسەر ئەسپەردەکردنیدا..

پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە..

## ٤٢- ﴿چەند چیرۆکێك جەستە دێنێتە لەرزین﴾

چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە لە لایەن مردوو شۆرێکەوە گێڕدراوەتەوە پێی دەڵێن (دایکی ئەحمەد).

وەرگێڕدراوە.

**چیرۆکی یەکەم:** یەکێ لە براکان گێڕایەوە کە دراوسێیەکی لە شاری مەنصورە موعتاد بوو بە گۆرانیەوە، هەرکاتێ قسەی لەگەڵدا بکردایە گاڵتەی پێدەکرد.. ووتی: کاتێ چوو بە ساڵدا و مەرگ بوو بە میوانی، هەر گوێی لە گۆرانی دەگرت و لەکاتی گیاندانذا بوو!!

چووم بۆلایی و ووتم بە کوڕەکانی: لە خوا بترسن، باوکتان لە گیاندانداییە و ئێوەش گۆرانیتان بۆ خستۆتە سەر، ووتیان: دەی تۆ کاسێتی قورئان بخەرە سەر.. ئەو برایە سوێندی خوارد کاتێ دەستی درێژکرد تا کاسێتی قورئان بخاتە سەر و کاسێتی گۆرانیەکە لابەرێت.. پیاوەکە لە گیانەڵادا بوو پەردەکەی بە ڕوخساریەوە لابرد و تەماشای ئەو برایەی کرد و ووتی: نا... با گۆرانیەکەی لەسەر بێت، بەڕاستی دڵم دەبووژێتەوە پێی.!!!

براکە ووتی: بەخوا بەو شێوەیە گیانی دەرچوو.. کاتێ وەفاتی کرد لە ئەسپەردەکردندا دوا کەوت، هەتا براو خۆشەویستانی هاتن، نوێژی عیشامان کرد، بۆنێکی ناخۆشی لێ بەرز دەبوویەوە کەسوکاری دەیانەویست پەلەبکەن لە ئەسپەردەکردنیدا، دەڵێ: بردمان بۆ نزیکترین مزگەوت تا نوێژی لەسەر بکەین، تا کەس بێزار نەبێت لە بۆنە ناخۆشەکەی.. دەڵێ: چووینە مزگەوتەوە و ئەو گەڕەکە هەر هەمووی ئاوی لێ برا، کەسمان نەبینی نوێژی عیشا بکات لەو مزگەوتەدا.. دەڵێ: ئەی چارە چیە!! هەموان وتیان: بیبەن بۆ گۆڕستان.. دەڵێ: بەخوا تەنها من و دوو سێ برای تر نوێژمان لەسەر کرد.

ئەوەی ژیانی بە چ شێوازێك بەرێتە سەر بەو شێوازە دەمرێت ئەوەشی بە چ شوێوازێك بمرێت هەر بەو شێوازە زیندوو دەکرێتەوە.. {إنا لله وإنا إليه راجعون...}

**چیرۆکی دووەم:**

لە شاری ﴿ریاض﴾ ڕوویداوە... و هەر کەس لەو گروپە بێت ڕوودەدات بە سەریدا، کە کۆمەڵێ لاو بوون یەکێکیان دەڵێ: ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی بڕۆین بۆ ناوچەی ﴿الثمامە﴾ لە شاری ﴿ریاض﴾ بۆ کات بەسەر بردن بە گۆرانی و سەما و دەهۆڵ لێدان بە یەك ئۆتۆمبێل کەوتینە ڕێ.. دەڵێ: لە ڕێگادا باوکم بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوە کردم، کە یەکێ لە خزمەکانمان هاتووە و پێویستە بگەڕێیتەوە و بیبینیت، هەوڵمدا پۆزش بهێنمەوە بەڵام باوکم هەر سوور بوو لەسەر گەڕانەوەم... هەواڵم دا بە هاوڕێکانم.. گەڕاندمیانەوە بۆماڵەوە و ئەوان گەڕانەوە، ڕێکەوتم لەگەڵیاندا کە لە کۆتایی شەودا بگەڕێمەوە بۆ لایان.. منیش لەگەڵ باوکمدا بووم بۆ پێشوازی لە خزمەکانم، کاتێ لە نان خواردنی ئێوارە بوینەوە، پەیوەندیم بە هاوڕێکانمەوە کرد، پەیوەندیم بە یەکەمیانەوە کرد وەڵامی نەدایەوە، پەیوەندیم بە دووەمیانەوە کرد وەڵامی نەدایەوە، سێیەم، چوارەم، وەڵامیان نەدایەوە.. وا گومانم برد کە زوویر بوون لێم، چونکە لەگەڵیاندا نەچووم، بۆیە منیش ڕۆشتم بۆ ئەو شوێنەی کە ڕێکەوتبووین لەسەری کە کۆببینەوە تیایدا.. کاتێ ڕۆشتمە شوێنەکە، تاماشام کرد ئۆتۆمبیلێکی زۆر و ئیسعافی لێیە، کاتێ نزیك بوومەوە لە شوێنەکە، تەماشام کرد هاوڕێکانم لەناو ئۆتۆمبێلەکەیاندا وەرگەڕاون و ویستوویانە بڕۆن بۆ ئەو شوێنە بۆ کۆبوونەوەی بەزم و سەفای ناشەرعی.. منیش گریام و ووتم سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕزگاری کردم و کاتێك منیش بەرەو ئەو سەرپێچیکردنە دەچووم گیانی نەکێشام.. بۆیە بڕیارمدا تەوبە بکەم و بگەڕێمەوە بۆلای خوای میهرەبان و باڵادەست..

**چیرۆکی سێیەم:**

ئەمە چیرۆکێکی واقعیە و مردوشۆرێك بۆمان دەگێڕێتەوە، یەکێ لە مردوو شۆرەکان لە سعودیە بۆمان باس دەکات و دەڵێ: کوڕێکی گەنجیان هێنا کە لەسەرەتای لاوێتیدا بوو، لە ڕوخساریدا تاریکایی تاوان دەبینرا، کاتێ لە شۆردنی بوومەوە، هەستم بە شتێکی سەیر کرد کە لە گوێیەوە دێتە دەرەوە.. لە خوێنیش نەدەچوو بەڵکو لە کێم دەچوو بە بڕێکی زۆر، حاڵەتەکە سەرنجی ڕاکێشام چونکە لە ژیانمدا شتی وام

نەبینیبوو... وام گومان دەبرد هەرچی لە مێشکیدایە یەتەدەرەوە.. چاوەڕوانیم کرد بۆ ماوەی پێنج خولەك...وە... چارەکە سەعاتێك... هەر نەوەستایەوە، بەڕاستی شوێنی مردوو شۆردنەکە پڕ بوو لە مێروو، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەو هەموو کارانە دەسازێنێ.. دەماخ هەرچی لە ناویدا بێتە دەرەوە تەنها دە خولەك دەخایەنێ، بەڵام بۆم ئاشکرا بوو کە ئەوە قودرەت و توانای خوای بەدەسەڵاتە.. کاتێ بێزاربووین لە وەستاندنەوەی ئەو کێم و جەراعەتە، کفنمان کرد و تەنانەت نەوەستایەوە لە کاتێکیشدا کە دامان هێڵایە ناو گۆڕەکەی.. منیش ئۆقرەم نەگرت.. دەستم کرد بە پرسیارکردن سەبارەت بەو کوڕە گەنجە کە چی بووەتە هۆی ئەوەی ئاوای لێبێت.. خزمەکانیشی لە وەڵامدا وتیان: ئەو کوڕە شەو و ڕۆژ و بەیانیان و ئێواران گوێی لە گۆرانی دەگرت، هەندێ لە چاکە خوازانیش هەندێ کاسێتی قورئان و موحازەراتیان دەدایە ئەویش گۆرانی لەسەر تۆمار دەکرد..

پەنادەگرین بەخوای گەورە لەو جۆرە کارانە..

## ٤٣- ﴿ئافرەتێکی عەرەب لە ئەوروپا﴾

ئافرەتێکی عەرەب گەشتێکی کرد بۆ ئەوروپا.. چۆن هەندێ لە ئافرەتانمان ﴿مەبەستی ئافرەتانی سعودیەیە﴾ گەشت دەکەن بۆ ئەوروپا و پۆشاکی شەرم و حەیا فرێدەدەن! ئەو ئافرەتە ڕۆشت بۆ وڵاتێکی ئەوروپی، پۆشاکی کورتی کردە بەر تا بەشێوەیەکی ﴿شارستانی!!﴾ خۆی بنوێنێت.. کاتێ کە لەبازاڕدا بوو دیمەنێکی سەیری بینی لەو وڵاتەدا، ئافرەتێکی بینی لە سەریەوە تا قولەپێی داپۆشیبوو، نە قژ و نە نینۆکی بەدەرەوە نەبوو. ئەو ئافرەتە عەرەبیە سفوورە ڕۆشت بۆلای ئافرەتە باڵاپۆشەکە. بە سەختی لەگەڵیدا دواو سەرزەنشتی کرد: ئایا لێرە ئەم جورە پۆشاکانە دەپۆشی؟ بە پۆشاکەکانت فەزح و لەکەدارت کردین!! شکستت پێ هێناین!! ئافرەتە باڵاپۆشەکە هیچ وشەیەك تێنەگەیشت، بەڵام تێگەیشت بەشێوەی قسەکردنەکەیدا ئەم کەمتەرخەمە.. بە زمانی بیانی پێی ووت: ئایا دەتوانی بە ئینگلیزی قسە بکەیت؟ ووتی: بەڵێ، (پاشان زمانی قسەکردنەکەی گۆڕی بۆ ئینگلیزی)..

ووتی: تۆ دەتویست چی بڵێیت؟

ووتی: ئەو پۆشاکە چیە لەبەرتدا؟ ئەو پۆشاکە لە وڵاتی ئێمەدا لەبەردەکرێ! تۆ ئێستا لە ئەوروپادایت! ئەو پۆشاکە دواکەوتوانەیە!

ئافرەتە باڵاپۆشەکەش زۆر بە هێمنیەوە ووتی: بەڵام من عەرەب نیم!! من ئەڵمانیم.. و وەڵامی دووەمی دایەوە کە وەك گەردەلوول وابوو: وە من تەنها شەش مانگە موسڵمان بووم! ئافرەتە عەرەبە سفورەکە حەپەسا و وات هەست دەکرد گێژەخوات کاتێك گوێی لەو قسانە بوو... چۆن؟ کۆمەڵێ پرسیار هات بە مێشکیدا!!! چۆن پابەندە بە پۆشاکەکانیەوە لە کاتێکدا تەنها ماوەی شەش مانگە موسڵمان بووە! من چۆن دەستبەرداری پۆشاکی ئیسلامیانە بووم، لەکاتێکدا لە باوك و دایکێکی موسڵمان بووم؟ چۆن.. لەکاتێکدا من لە وڵاتێکی عەرەبی موسڵمان گەورە بووم؟ ئەو وشانە زۆر بەهێزتر بوون لەهەموو ئامۆژگاریەکان و ئەو وشانە وای لێکرد کە ئەو ئافرەتە ، هەر لەنوێ پابەند بێتەوە بە پۆشاکە ئیسلامیەکەیەوە.. سبحان الله.. چۆن ئیسلام نموونەی ئافرەتانی ئاوا دەسازێنێ.

# ٤٤- ﴿چۆن ئەوانە موسڵمان بوون.. سبحان اللّە﴾

﴿بەڕاستی من زوڵمم لەخۆم کرد﴾ ئەمە کە دەربڕینێکە سەبارەت بە بارودۆخی من و گشتگیرترین دەربڕین، چونکە خوای گەورە بەکاری هێناوە کاتێ وەسفی سەرەڕۆیان دەکات.. من موعتاد بووبووم بە ژوورەکانی ﴿چات﴾ کردنەوە، گرنگیەکی زۆرم پێ دەداو یەکێك بوو لە ئارەزووە گەورەکانم.. بەتایبەتی ئێمە باسی ئەوە دەکەین کە خوای گەورە حەرامی کردووە.. من لەزەتێکی سەیرم لێ دەبینی.. نازانم بۆچی؟؟

ڕۆژێکیان ئاشنا بووم بە کچێك لە ئەمریکا تەمەنی ٢٠ ساڵ بوو، شوی کردبوو کوڕێکی جوانی هەبوو.. بە ڕێکەوت ناسیم.

پێی ووتم: ناوت چیە؟ ووتم: ناوم ﴿محمد﴾ە.

هەرکە ئەو وتەیەم ووت، خەریك بوو لە خۆشیاندا دەفڕی، پێی ووتم: کەواتە تۆ موسڵمانی، بەڕاستی موسڵمانی، بڕواناکەم، دەمەوێ سەبارەت بە ئیسلام زۆر بزانم، تکا دەکەم دەستبەردارم مەبە، وەك چۆن کەسانی تر دەستبەردارم بوون.. هەزاران پرسیارم لایە کە دەمەوێ بیانکەم. لە دڵی خۆمدا ووتم: چەند کەسێکی بێزارکەرە، لە دوورترین شوێنەوە داوای ئیسلام دەکات... خوایە پەنا بەخوا!!!... بەڵام بەڕاستی بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا هەستم کرد کە گرنگی بە کاروباری ئاینیم دەدەم!! یەکەمین جارە بۆ ئامانجێ بژیم.. هەستم بە ئیحساسێکی تری سەیر کرد، بۆ یەکەمین جار بوو وازبێنم لە شەهوەت و ئارەزووی خۆم بۆ شتێکی تر.. هەتا ئێستاش نازانم ئەو شتە چیە.. هیچی لێنازانم تەنها ناوەکەی نەبێ کە ئیسلامە.. پێم ووت: لەوانەیە پرسیارم لێ بکات و منیش وەڵام بدەمەوە، لەگەڵ بێزاری تەواومدا لەسەر توانای وەڵامدانەوەم..

بەڵێ ووتی: ئیسلام چیە؟

منیش پێم ووت: تکادەکەم یەك چرکە بوەستە.. ڕۆشتم بۆ پێگە ئیسلامیەکان.. ئەگەڕام بەدوای هەر پرسیارێکدا کە دەیکرد، هەتا سەرکەوتوو بووم لە وەڵامدانەوەی زۆربەی پرسیارەکان..

پێی ووتم: عائشە کێیە؟

پێم ووت: عائشە؟؟؟ من هیچ نازانم دەربارەی، دەستم کرد بە گەڕان بە سایتە

ئیسلامیەکاندا... کاتێ کە دەگەڕام هەستم بە حەزێکی سەیر دەکرد بۆ یارمەتیدانی... پێم ووت: چەند ڕۆژێ مۆڵەتم بدە چەند کتێبێکت بۆ دەنێرم کە فێرت بکەن ئیسلام چیە.

نازانی چەندە بەختەوەر بووم بە ووشەی ﴿خوشکم﴾ یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا کچێك بانگ بکەم بە ووشەی ﴿خوشکم﴾ الله ﴿خوشکم﴾... یەکەمین جار بوو هەستم بە پاکێتی دەکرد... هەتا فرمێسك بە چاوانمدا هاتە خوارەوە... ئەو شەوە نەخەوتم... پرسیارم لە خوشکەکەم دەکرد.. ﴿ئایا بالا پۆشی فەرزە؟ و پرسیاری تریش﴾

ڕۆشتم بۆ کتێبخانە بۆ کڕینی کتێب، پێش ڕۆشتن تەماشام کرد بڕێکی کەم پارەم پێیە... ووتم: ئەی چی بکەم... هەستم کرد کە مردن پێش من بەرۆکی پێ دەگرێ و پێویستە خێراکەم و پێش ئەوەی بمرێت و بڕواتە ئاگرەوە.. بۆ یەکەمین جاربوو بەو شێوەیە لەگەڵ خۆمدا بدوێم.. سەرسام بووم بە خۆم.. چووم بۆ لای یەکێ لە هاوڕێ خراپەکانم کە زۆر دەوڵەمەند بوو، بڕێ پارەم لێ قەرز کرد.. نیازم وابوو بۆی نەگێڕمەوە، بەڵام دوای پابەند بوونم بە ئیسلامەوە بۆم گێڕایەوە، چونکە گرنگی گەڕانەوەی قەرزم بۆ دەرکەوتبوو... سوپاس بۆ خوا.. پێش ئەوە دوو کتێبم بۆ کڕی بوو خوێندبوونمەوە.. زۆر بەباشی بە ئینگلیزی قسەم دەکرد.. هەستم کرد کە ئەم ئاینە زۆر مەزنە.. و پۆشاکێکی ئیسلامی جوانم بۆ کڕی وەك ئەو شێوەیەی کە خوشکەکەم لەبەریدا بوو.. دەمزانی دەستکەوتنی ئەو جۆرە پۆشاکە ئیسلامیانە لەوێ زەحمەت و نارەحەتە، وە دوو خەتم بۆ کڕی بە دەنگی ﴿غامیدی﴾ و ﴿عەجمی﴾.. و ئەو شتانەم بە پۆستی خێرای نێودەوڵەتی بۆ نارد تا لە کەمترین کاتدا بگاتە دەستی.. بەڵێ هەموو ئەو شتانە گەشتنە دەستی... دوو کتێبەکەی خوێندەوە..و پێی ووتم: من ئا ئەوەم ویست، چی بکەم هەتا ببمە موسڵمان... لەو کاتەدا وێنای ناکەیت چیم بەسەرهات.. زۆر زۆر گریام... فرمێسکم دەڕشت... پێی ووتم: مەگری.. ئەو گوێی لەمنەوە بوو چونکە بە ﴿مایك﴾ قسەم لەگەڵدا دەکرد.. پێم ووت: چونکە لەدایك بوونی من لەگەڵ لەدایك بوونی تۆ دایە ﴿لە ماناکەی تێنەگەیشت﴾ بەڵام پێم ووت: کە شایەتومان بهێنێ و بڕوات خۆی بشوات ﴿غوسڵ دەربکات﴾ وێنای ناکەیت ئەویش بەدوای مندا دەیوت ﴿اشهد ان لا إله إلا الله.. وأن محمد رسول الله﴾ وەك

ئەوەی بۆ یەکەمین جار لەگەڵیدا بیڵێمەوە.. نایەتەوە یادم کەپێش ئەو ساتە وتبێتم..
پێی ووتم: ماناکەی چیە؟
پێم ووت: واتە پەرستراو نیە بێجگە لە ﴿الله﴾ لە گەردوندا و بێگومان ﴿محمد﴾یش پێغەمبەری خوایە.. هەر لێکم دەدایەوە بۆی، بەڵام سەیر لەوەدا بوو من نەمدەزانی ئەو ووشانە چین کاتیَ کە ڕاڤەم دەکردن.. هەموو ئەو مانایانە وون بوون لەلای من.. بۆم دەرکەوت کە ئەو ووشەیە مانای مەزنی زۆری هەیە.. پاشان ووتی: محمد بڵیَ ﴿لا إله إلا الله﴾ پێکەنیم و منیش ووتم، لە خۆشیاندا هەر دەگریام.. گریانێکی زۆر... پاشان ووتم: خوشکم بڵیَ ﴿محمد رسول الله﴾.. بەشادیەوە پێکەنی و ووتی: محمد ئێستا ژیانی خۆمم دۆزیەوە.. بەڕاستی من تێکشکابووم و دڵم شکا بوو.. پێنج جار هەوڵی خۆ کوشتنم دابوو.. بەڵام مێردەکەم ڕزگاری دەکردم.. بەڵام ئێستا هەست بەخۆشیەکی زۆردەکەم و هەستدەکەم کە من خۆم و بەختەوەری خۆمم دۆزیوەتەوە..
پێم ووت: کەواتە تۆ ئەم شەو لەدایك بوویتەوە.
ووتی: بەڕاستی وایە..
پێم ووت: وە هەروەها منیش.. بەسەرهاتی خۆمم بۆ باسکرد کە چۆن تەنها بەناو موسڵمان بووم... ئێستا هەست دەکەم سەرلەنویَ لەدایك بوومەتەوە...
ووتی: ئێستە تێگەیشتم لە وتەکەی تۆ کە وتت ﴿ئێمە پێکەوە لەدایك بووین﴾.
پاشان ووتی: کەواتە برای بەڕێزم بڵیَ (لا إله إلا الله..)
پێم ووت: بەڵیَ (لا إله إلا الله رب العالمین).. پێکەنیم و وام هەست دەکرد کە سەرلەنویَ موسڵمان بوومەتەوە. هەستایەوە و غوسڵی دەرکرد و ڕێکەوتین کە پاش ٣٠ خولەکی تر پەیوەندی بەیەکتریەوە بکەینەوە.. گوێم لە بانگی بەیانیەوە بوو.. هەستامەوە و دەستنوێژم گرت.. هێشتا دەستنوێژ گرتنی قوتابخانەم لەیاد مابوو. لەگەڵ ئیمامدا ڕۆشتمە ژوورەوە.. چاوەکانم پڕبوو لە فرمێسك هەستم بە لەزەتێکی سەیر کرد زۆر لەوە بەلەزەتتر بوو  کە بەهۆی شەهەوات و ئارەزووەوە هەستم پێدەکرد.. لەزەتی ئیمان.. بەڕاستی چێژێکی تایبەتی هەیە... گەڕامەوە بۆلای پەیوەندیەکەم و پێی ووتم کە عائیشە کێیە، بۆیە بەهۆی ئەوەوە زانیاریم پەیداکرد سەبارەت بە عائیشەو پێشەوامان پێغەمبەر (د.خ)...  وێنای بکە... من لە کێوە فێری

ئاینەکەم دەبم.. لە کەسێکەوە کە من هۆکار بووم بۆ موسڵمان بوونی کە چەند ساتێکە موسڵمان بووە... شتێکی سەیر وای لێکردم فرمێسك بەچاوانمدا بێتە خوار.. بینیم ناوی خوازراوی خۆیی گۆڕی بۆ عائیشە.. دوای دوو ڕۆژ مێردەکەشی موسڵمان بوو، کوڕەکەشیان ناونا ئەحمەد... زۆر بە کوڵ گریام... سوپاسی زۆری خوای گەورەم کرد.. ئاه.. ناتوانم کە بڕوابکەم کە بەڕاستی بوومە هۆی موسڵمان بوونی سێ کەس و لە ڕۆژی قیامەتدا دەچنە سەر ترازووی کردەوە چاکەکانم.. منیش هیچم لە لانیە سەبارەت بە ئیسلام.. لەو کاتەدا زیاتر و زیاتر لە ئیسلام شارەزا دەبووم.. لە کتێبخانەی براکەمدا کە پێش هەفتەیەك لە موسڵمان بوونم ژنی هێنا... هەر دەمخوێندەوە و دەمخوێندەوە و فێردەبووم.. تەماشام کرد هەڵسوکەوتم باشتر دەبێت، هەستم بەچێژ و تامی نوێژ و خواپەرستیەکان دەکرد.. وازم لەهەموو شەهوات و ئارەزووەکانم هێنا.. و لە هەموو هاوڕێ خراپەکانم لە شارەکەدا و هەموو جیهاندا.. و هەموو کاتێ دەموت ﴿أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمد رسول الله﴾و دەگریام و دەگریام.. دایکم زۆر دڵخۆش بوو پێم...

وتی: ڕاستە ﴿هەموو شتێ کاتی خۆی دێت﴾

پێم وت: ڕاست دەکەیت دایکە گیان.. لەگەڕان بەدوای خراپەکاریدا گۆڕام بۆ گەڕان بەدوای هەرکەسێکدا کە ئیسلامی دەوێ و دەیەوێ شتێکی لێوە فێر ببێت.. وێنای بکە کەسانێکی زۆر زۆرم دەهاتە ڕێ کە دەیانەویست لە ئیسلام شارەزا بن.. هەرکاتێ ئاشنا دەبووم بە کەسێك هەمان ئەو کتێبانەم بۆ دەناردن لە گەڵ نوسخەیەك لە قورئانی پیرۆز... تا لەسەردەستم سێ کەسی تریش موسڵمان بوون... دوان لە ئەمریکا و کوڕێکی گەنجیش لە بەریتانیا... زۆر دڵخۆش بووم بەوە.. دایکی ئەحمەد ئەو ئافرەتەی کە موسڵمان بوو هاوکاری دەکردم لە قسەکردن لەگەڵیاندا.. هەتا ئەو ڕادەی توانی قەناعەت بە خوشکەکەشی بکات کە موسڵمان ببێت.. سوپاس بۆ خوای جیهانیان..

## ٤٥- ﴿سوڵتانێکی (چاد)ی نەصرانیەکی توندڕەو بوو: ئێستا ئەو لە بە ناوبانگترینی بانگخوازانە﴾

ئەمە بەسەرهاتێکی سەیرە.. کە شایەنی خوێندنەوەیە.. بەسەرهاتی ئەو نەصرانیە توندڕەوەی کە خوای گەورە ڕێنمایی کرد بۆ ڕێگای ڕاست.. پاشان بوو بە بەناوبانگترین بانگخواز لە کیشوەری ئەوروپا.. کاتێ قسەمان کرد لەگەڵیدا هەر لەسەرەتاوە باسی خۆیی بۆ کردین و چاوەڕوانی پرسیاری ئێمەی نەدەکرد.. بەتەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاینەوە: سوڵتانی یەکێ لەهەرێمەکان بوو، ناوی ﴿عەلی ڕەمەزان ناجیلی﴾ بوو.. سوڵتانی ﴿قیندی﴾ لە چاد، نەصرانیەکی توندڕەو بوو.. وەك پێی ووتین: زۆر ڕقی لە موسڵمانان بوو، ئەگەر دەسەڵاتی هەبوایە هەموویانی دەسوتاند.. دەڵێ: زۆر سەرگەردان و سەر لێ تێکچوو بووم هەتا لەساڵی ١٩٧٧ موسڵمان بووم لەسەر دەستی مەلایەکی نێجیری کە لەبواری بانگەوازدا کاری دەکرد.. بە شێواز و بەڵگە بەهێزەکانی توانیبووی زۆرێك لە خەڵکی هەرێمەکەمان وا لێبکات کە موسڵمان بن.. من لە ڕابردوودا موسڵمانی ترم زۆر بینیبوو، وە هاتن بۆ ناوچەکەمان و مەرجیان دادەنا بۆ هەرکەسێ کە موسڵمان ببوایە، ئەویش ئەوە بوو دیاریان بدەنێ وەکو میوە و وڵاخ.. یان پۆشاك.. ئەوە وای کرد کە زۆربەی خەڵکی کە موسڵمان نەبن، چونکە وەك ئاینێك دەهاتە پێش چاویان کە ئیستیغلالی مرۆڤ دەکات.. بەڵێ ئێمە بەو شێوەیە ئەوانمان دەناسی.. بەڵام دوای ئەوە، مەلایەکی نێجیری هات ئیسلامی ڕاستەقینەی نیشاندا.. بۆی سەلماندین کە ئیسلامەتی بەوشێوەیە نیە کە ئەوانەی پێشوو بانگەشەیان بۆ دەکرد.. بۆی باسکردین کە چۆن بێباوەڕان پێشنیاری پۆستی بەرز و سەروەت و سامانیان دەکرد بۆ پێغەمبەری خوا (د.خ)، بەڵام ئەو لەپێناوی بانگەوازەکەدا ڕەتی دەکردەوە و پێی دەوتین کە چۆن جیهادی کردووە دژ بە موشریکە بێباوەڕەکان بۆ چەندین ساڵ و ئارامی گرتووە لەسەر سوکایەتی کردن و ئازاردانیان پێی ... هەتا بانگەوازەکە سەرکەوت و بەجیهاندا بڵاوبوویەوە.. دوای هەموو ئەو شتانەی پێمان ووت و دوای چەند مانگێ لە بانگەواز کردنەکەی، توانی وامان لێبکات کە ئیسلامەتی قبوڵ بکەین.. ئێمەش بە ئیمانێکی تەواوەوە ڕۆشتینە

ناو ئەو ئاینە.. بە ویستی خۆمان بوین بە موسڵمان.. هۆگری ئاینێك بووین كە دەمانتوانی بەوپەڕی دڵسۆزیەوە خواپەرستی بكەین.. پەرستنی خوا بەتاك و تەنهایی هیچ مرۆڤ و بتێك نزیكی نەدەكردینەوە لێی یان دوورمان بخەنەوە لە سیحر و شەیتانەكان... بووم بە موسڵمان و چوومە ڕیزی موسڵمانانەوە، باوكیشم لە نێو ئەوانەدا كە موسڵمان بوون باوەڕی بە ئیسلام هێنا، كە باوكم سوڵتانی هەرێمی ﴿ماهیم توكی قیندی﴾ بوو لە نێجیریا پێی ووتم: لە ئێستە بەدواوە، تۆ موسڵمانیت و لەگەڵ مندا دەمێنیتەوە و خزمەتی ئەو زانایە دەكەیت كە فێری ئیسلامەتی كردین..

باوكم ووتی: من ئەم كوڕەت پێشكەش دەكەم لەپێناوی خوادا بۆ خزمەتی ئیسلام، ڕۆشتم لەگەڵیدا و بۆ ماوەی شەش ساڵ لەگەڵیدا مامەوە.. پاشان دەرچووم لە خزمەتی، وەك بانگخوازێك، دوای دیراسەكردنی ئیسلام لەو ماوەیەدا لە نێجیریا..

دوای كۆتایی ئەو شەش ساڵە، پێی ووتم: كاربكە لەگەڵم لە نێجیریا، پێم ووت: لە قورئاندا خوێندومەتەوە كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ(٢١٤)﴾ الشعراء... واتە: {عەشیرەت و خزمە نزیكەكانت ئاگادار بكەرەوە}

پرسیار: چۆن بووی بە سوڵتانی هەرێمەكە؟

– بوم بە سوڵتان دوای وەفاتی باوكم، دوای بانگەواز كردنی خەڵكی لە هەرێمەكەدا بۆ ئیسلامەتی بۆ ماوەی دوو ساڵ.. بووە هۆی ئەوەی ٢٧٢٢ كەس لە هۆزی ﴿ساراقولای﴾ موسڵمان بن، لە نێویاندا ١٤ قەشەی نەصرانی، لەو كاتەوە دەستكرا بە بەرەنگاربوونەوەمان لەلایەن ڕێكخراوە مەسیحیەكانەوە لە باشوری چاد.. هەوڵیان دەدا بانگەوازە ئیسلامیەكە تێك بشكێنن و ئەوانەی كە موسڵمان بوون بیانكەنەوە بە مەسیحی بە بەكارهێنانی گەلێك هۆكار!! ئیسلامیان بە تاكە ڕكابەری خۆیان دەزانی كە هەڕەشە لە بڵاوبوونەوەی نەصرانیەت دەكات.. هەوڵیاندا بە پارە و سامان ئافرەت پەشیمان بكەنەوە، و بە پێشنیاركردنی خانوو و كێڵگە تا واز لە ئیسلامەتی بێنم.. دەیانەویست منیش لە پێناوی ئەوانەدا هەمان شێواز بەكاربهێنم، كە بەكارم دەهێنا كاتێ كە ئەو ژمارە زۆرە خەڵكە موسڵمان بوون.. ئەوە بوو ئەوانی بێتاقەت دەكرد، چونكە ئەوان سەروەت و سامان و ڕێگای زۆریان بەكاردەهێنا بەڵام ئەو ئەنجامەیان بەدەست نەدەهێنا كە ئێمە لە باشوری ﴿چاد﴾ بەدەستمان دەهێنا... ئەوە وای كرد لە

حوکمەتی ﴿چاد﴾ کە من دابمەزرێنیّ وەك ئەندامێك لە لیژنەی باڵا بۆ کاروباری ئیسلامی لە کۆماری چاد.. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو بارودۆخەدا.. هەموو پێشنیارەکانیانم ڕەت دەکردەوە، دەستیانکرد بە وروژاندنی ڕۆمانیەکان دژی موسڵمانان لە باشور، بەڵام هەوڵەکانیان شکستی دەهێنا.

پرسیار: چۆن هاتیت بۆ سەردانی شاری ﴿مەککە﴾؟

- ﴿ڕێکخراوی بانگەوازی ئیسلامی﴾ مۆڵەتی پێدام کە ﴿حەج﴾ ئەنجام بدەم، کاتیّ سەردانی مەککەم کرد و موسڵمانانم لەویّ بینی سپی و ڕەش، بەبیّ جیاوازی، هەموویان هەمان پۆشاکیان لەبەردا بوو بە یەك پۆشاك و یەکسان لە شوێنی نیشتەجێبووندا.. توانام نەبوو کە نەگریەم.. هیچ کەس لە ئەندامی خێزانەکەمان لەگەڵمدا نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەستم دەکرد کە هەموو ئەو خەڵکەی بە دەورو بەرمەوەن کەسوکار و برای منن.. ئەوە وای لێکردن کە زیاتر لێبڕاوانە هەولّ بدەم لە بواری بانگەوازدا... تا ڕێنمایی کەسانی تر بکەم بۆ ئەم ئایەتە مەزنە... و بۆ ئەوەی ئەو خۆشیە ڕۆحیە تەنها بۆ خۆم قۆرخ نەکەم...و براکانی ترم ڕزگاربکەم لە سەختی قیامەت و ئاگری دۆزەخ.. بڕیارمدا دەست بە هەڵمەتی بانگەوازکردن بکەم لە نیشتیمانەکەمدا، لە ﴿چاد﴾.

پرسیار: پەیوەندیت چۆنە لەگەڵ سەنتەرە ئیسلامیەکان، و ئەو سەنتەرانە چۆن گەشەیانکرد؟

- کاتیّ لە حەج گەڕامەوە، بڕیارمدا سەنتەرێکی ئیسلامی دروست بکەم کە بتوانیّ یارمەتی موسڵمانان بدات لە دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانەدا.. و سوپاس بۆ خوا توانیم ١٢ مزگەوت و قوتابخانەیەك بۆ منداڵانی موسڵمان بنیات بنێم.. و هەروەها ﴿١٢﴾ بیرمان لە هەرێمی ﴿قندی﴾ بۆ موسڵمانان هەڵکەند... هەروەها کارمکرد لە بنیاتنانی دامەزراوەیەك بۆ ڕاهێنانی موسڵمانە نوێکان لەسەر بانگەواز.. لە سەرەتادا ئامانجم بڵاوکردنەوەی ئیسلام بوو بە تەعالیم و ئەخلاقیات و سلوکیاتیەوە و جەختکردن لەسەر زمانی عەرەبی و ئیسلام.. و دروستکردنی ئەڵقە قورئانیەکان.. سوپاس بۆ خوا هەموو ئەمانە ڕاپەڕێنران..

پرسیار: ووتت مەسیحیەکان گەورەترین لەمپەری بەردەم ئێمە بوون... ئایا لەمپەری

تر هەبوو؟

- چەندین لەمپەر هەبوو کە بەرەو ڕووی بانگەواز دەبوویەوە لە باشوری ﴿چاد﴾.. لەمپەری سەرەکی مادده بوو.. چونکە خەڵکی ئەوێ هەژارن و توێشوی ڕۆژانەیان دەست ناکەوێ.. زۆربەی ئەوانەی موسڵمان دەبوون، ئەوەندەیان نەبوو تەنانەت لە کاتی نوێژدا عەورەتی خۆیانی پێ دابپۆشن.. و هەروەها ڕێگاوبان لە هەرێمەکەدا زۆر کەم بوو.. وە هەروەها هۆکاری گەیاندن نەبوو بۆ ڕۆیشتن بۆ ناوچە ڕۆحیە سەرەتاییەکان تا هەستین بەکاری بانگەواز لەو گوندانەدا، چونکە زۆربەی خەڵکی لەوێ مەسیحی بوون.. و هەروەها بانگەوازی پسپۆڕیشمان کەم بوو.. زۆربەی موسڵمانان لەوێ تەنها شایەتومانیان دەزانی.. کەچی لەولاشەوە بەبەراورد لەگەڵ ئەمەدا هەوڵی ڕێکخراوە بە مەسیحیکردنەکان بە ماددەی بنچینەیی و کەسانی پسپۆڕەوە کاریان دەکرد تا زامنی سەرکەوتن بکەن... لەبەر ئەوە هەوڵی ئەوان مەزنترین لەمپەر بوو کە لەهەرێمەکەدا بەرەو ڕووی دەبووینەوە.. کاتێ پاشای ڤاتیکان سەردانی هەرێمی ﴿قەند﴾ی کرد لەکۆتایی گەشتەکەیدا بۆ ئەفریقیا.. قسەی لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە خەڵك دەکەنە مەسیحی و پلانی گەورەی دانا بۆ مەسیحیکردنی هەرێمەکە.. بەوشێوەیە، دەستیانکرد بە ناردنی ئەو ڕێکخراوانەی خەڵك دەکەن مەسیحی لە ژمارەیەك لە وڵاتە ئەوروپیەکانەوە.. هەروەها پارەی پێویستیان دابینکرد بۆیان و هەروەها ڕایانگەیان کە بەنیازن ژمارەیەك کەنیسە لە هەرێمەکەدا دروست بکەن.. یەکێ لەوانەی کە خەڵکیان دەکردە مەسیحی ووتی: ئەم هەرێمە تا ساڵی ٢٠٠٢ هەمووی دەبێتە مەسیحی. هەموو مانگێ هەڵدەستان بە ئاهەنگی نیوخۆیی بەشێوەیەك خواردن و خواردنەوە و مەشروباتیان پێشکەش دەکرد.. و هەروەها سەردانی ئەو شوێنانەیان دەکرد کە خانەی هەتیوان بوون و یارمەتیان دەدان و کۆمەکیان دەکردن تاوەکو هەستن بەوەی ئەو منداڵانە بکەنە مەسیحی... ئای چەندە فێڵباز بوون! لەوێ بەناوی خاچی سورەوە کاریان دەکرد، کاتێ کە دەرکەوت کە هەستاون بە نەزۆك کردنی ئافرەتان و دەرمانیان پێداون کە ئیتر منداڵیان نەبێت! ئەوە یەکێ بوو لە هۆکارە ئامانجدارەکانیان بۆ سنوردانان بۆ ژمارەی موسڵمانان و دانانی کۆتاییەك بۆ ئیسلام لە وڵاتی ﴿چاد﴾.

پرسیار: چیت له ئیسلامدا بینیەوە؟

– شیرینیم له ئیسلامدا دۆزیەوە، کەس گومانی لەوە نیه که ئاینێکی دادپەروەر و ئاسمانیه، جیاوازی له نێوان کەسێك و کەسێکی تردا نیه... نێوان دەوڵەمەندێك و هەژارێك، تەنها به تەقوا و لەخوا ترسان نەبێت.. هەمووان ڕوودەکەنه خواو هەموانیش بەندەی گوێڕایەڵی خوای گەورەن.. ئامۆژگاریم بۆ هەموو موسڵمانان ئەوەیه که: ئەگەر دەیانەوێ ئیسلام گەشه بکات با به گوفتار و کردار شوێنی ئەم ئیسلامه بکەون.. چونکه ئەمه تاکه ڕێگایه بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلام.. چونکه کەسانی تر ئەو تایبەتمەندیه پاکانەیان نیەو ئەو نەریته جوانەیان نیه که دوو هۆکارن لەپشت ڕاکێشانی خەڵکەوه بۆ ئیسلامەتی.. ئیسلام سود دەگەیەنێ، چونکه گەنجینەی مەزن بۆ مرۆڤ زامن دەکات.. و تەعالیمی بەرز و پەند و ئامۆژگاری بۆ خەڵکی..

# ٤٦- ﴿مندالّێ دەبێتە هۆی ڕێنمایی باوکی﴾

ڕۆژێکیان مندالێک لە قوتابخانەکەی دەگەڕێتەوە و لە پۆلی سێی بنەڕەتیدا دەبێت لە میانی یەکێ لە وانەکاندا مامۆستا باسی نوێژی بەیانی دەکات.. بە شێوەیەك باسی دەکات هەموو ئەو مندالانە دێنێتە خۆشی و باسی فەزلی و گرنگێتی ئەو نوێژە دەکات... مندالەکەش گوێی لێ دەبێت و کاری تێدەکات.. پێشتر نە خۆی و نە مالەوەیان ئەو نوێژەیان نەکردووە... کاتێ مندالەکە دەگەڕێتەوە بۆ مالەوە.. بیر دەکاتەوە کە چۆن سبەینێ بۆ نوێژی بەیانی هەستێت و نوێژەکەی نەفەوتێت... هیچ چارەسەرێك شك نابات ئەوە نەبێ بە درێژایی شەوەکە نەخەوێت تا بتوانێ نوێژی بەیانی بکات.. بۆیە ئەوەی بیری لێکردەوە جێبەجێی کرد و کاتێ گوێی لە بانگی بەیانیەوە بوو.. ئەو گولە جوانە هەستایەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژ، بەلام کێشەیەك بەرەو ڕووی مندالەکە بوویەوە.. مزگەوتەکە دوورە و ئەمیش بەتەنها ناتوانێت بڕوات.. بۆیە مندالەکە دەستی کرد بە گریان و لەبەردەم دەرگاکەدا دانیشت.. بەلام لەپڕ گوێی لەتەقەی پێلاوەوە بوو لەسەر شەقامەکە، دەرگاکەی کردەوە و بەخێرایی ڕۆشتە دەرەوە، پیاوێکی پیری بینی بەرەو مزگەوت دەڕوات، تەماشای پیاوەکەی کرد و ناسیەوە، بەلێ ناسیەوە چونکە باپیری ئەحمەدی هاوڕێیەتی کە دراوسێیانە، ئەو مندالە بە ئەسپایی و بە پەنهانی بەدوای پیاوەکەدا کەوتەڕێ هەتا هەستی پێنەکات و بەمالەوەیان بلێ و ئەوانیش سزای بدەن.. بەو شێوەیە ئەم مندالە بەردەوام بوو لە نوێژکردنی بەیانیان لەمزگەوت.. بەلام مەحالە ئەم کارە هەروا بەردەوام بێت، بۆیە ئەو پیاوە کە ﴿باپیری ئەحمەد بوو﴾ وەفاتیکرد.. مندالەکە هەوالەکەی بیست و زۆر بێتاقەت بوو.. زۆر بەسەختی دەگریا.. دایك و باوکی سەرسام بوون لەو گریانەی و باوکی لێی پرسی: کوڕی خۆم بۆچی بەو شێوەیە دەگریت بۆی ئەو لە تەمەنی تۆدا نەبوو تا یاریت لەگەلێ کردبێ و نزیکی تۆ نەبوو-تا مالەکەمانی جێهێشتبێ، مندالەکەش بەچاوی پڕ لەفرمێسك تەماشای باوکی کرد و پێی ووت: خۆزگە تۆ لەجیاتی ئەودا بمردیتایە،.. باوکی توڕە بوو هەلشاخا پیایدا، بۆچی کوڕەکەی بەم شێوازە وای پێدەلێ و بۆچی ئەو پیاوەی زیاتر خۆش دەوێ؟

مندالەکە ووتی: من لەبەر ئەوە خەفەتبار نیم بۆی یان لەبەر ئەوەی کە تۆ دەیلێی،

باوکی سەرسام بوو، ووتی: ئەی کەواتە لەبەرچی؟ منداڵەکە ووتی: لەپێناوی نوێژدا.. بەڵێ لەپێناوی نوێژدا!! پاشان تفی دەمی قوتدا و ووتی: بۆچی باوکە تۆ نوێژی بەیانی ناکەیت؟ بۆچی باوکە تۆ وەك ئەو پیاوە و وەك زۆربەی ئەو پیاوانە نیت کە من بینیومن؟ باوکە ووتی: لە کوێ بینیوتن؟ منداڵەکە ووتی: لە مزگەوت. باوکە ووتی: چۆن؟ ئەمیش بەسەرهاتەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە و باوکیشی زۆر کاریگەر بوو پێی و موچورکەی پێدا هێناو خەریکبوو فرمێسکەکانی دەکەوتنە خوارەوە، بۆیە باوەشی بە کوڕە خۆشەویستەکەیدا کرد و لەو ڕۆژەوە وازی لەهیچ نوێژێ نەهێنا لە مزگەوتدا!!

## ٤٧- ﴿كاتێ ئیسلامم خۆشویست ئەسانسیرەکەم گۆڕی﴾

سەرەتای ئەم کارە لەگەڵ شەهابی کوڕمدا دەستی پێکرد، کە ڕۆژێکیان بە بێتاقەتیەوە پرسیارێکی لێکردم: باوکە ئێمە سوننەتی پێغەمبەر (د.خ) زیندوو ناکەینەوە و شەونوێژ ناکەین؟ سەرسام بووم لە پرسیارەکەی، دواتر بۆم دەرکەوت کە لەگەڵ قوتابیەکدا لە قوتابخانە وتووێژی کردووە، شەهاب هەموو پێداویستیەکی سەردەمیانەی لەماڵەوە هەبوو، منیش سوپاس بۆ خوا دەوڵەمەند بووم و لەهیچ شتێکدا درێخیم نەدەکرد بۆ ماڵ و منداڵم، لەبەر ئەوە شەهاب هەموو پێداویستیەکی بە زیادەوە لەبەردەستدا بوو، کە زۆربەی خەڵکی تر ئەوەیان نەبوو، بۆ نموونە تەلەفزیۆنی شاشە ٩٩ و سەتەلایت و شتی تریش.. بەڵام وەڵامی هاوڕێکەی سەیر بوو، لە بەردەم شەهابی کوڕمدا شانازی کردبوو کە ئەوان لە ماڵەوە سوننەتی پێغەمبەریان هەیە و شەونوێژ دەکەن و دووشەمە و پێنجشەممانیش بەڕۆژ و دەبێ.. ئەوەش موفاجەئات بوو بۆ شەهاب کە نەیتوانی بوو وەڵام بداتەوە و بە توڕەییەوە گەڕابوویەوەو لە منی پرسی بۆچی ئێمە وەك هاوڕێکەم لە قوتابخانە ئەوەمان لە ماڵەوە نیە؟ دراوسێکەم نوێژ ناکات... ئایا من بەرپرسم؟ لەوەتەی لەدایك بووم من موسڵمانم و نوێژ دەکەم و ڕۆژوو دەگرم و حەجیش دەکەم، و دەوڵەمەندیەکەم و سەروەت و سامانەکەم ڕێگای لێ نەگرتووم، ئەو خواپەرستیانە ئەنجام نەدەم، هەرگیز ڕەمەزانم بەسەردا تێنەپەڕیوە کە ئیعتیکاف ﴿واتە مانەوە لەمزگەوتا بۆ خوا پەرستی﴾م نەکردبێت و دە ڕۆژی سەرەتای (ذي الحجة) بەڕۆژوو بووم، و هەروەها شەوانی جەژنی قوربانیش لەبەردەم ئەو شوققەدا کە خۆم و خێزانم نیشتەجێ بووین تیایدا کە من خاوەنی بووم لەگەڵ کۆمەڵێ شوققەی تردا، بە بڕێکی زۆر گۆشت دابەشکراوە بەسەر هەژاراندا، لەگەڵ ئەوانەشدا بەڕاستی من هەستم بە غوربەت کرد لەبەردەم ئەو پرسیارەی شەهابدا کە سەبارەت بە سوننەتی پێغەمبەر (د.خ) و سەبارەت بە شەونوێژ پرسیارم لێدەکات.. بەڵام هەر بەوەندە وازی نەهێنا، بەڵکو پرسیاری ﴿کەمال﴾ی دراوسێمانی کرد، کە نوێژی نەدەکرد، و من چۆن هەوڵم نەداوە تەنانەت بۆ یەك جاریش بێت تا وای لێ بکەم نوێژ بکات یان ڕازی بکەم لەگەڵمدا بێت بۆ نوێژ، کە زیاتر لە ٢٠ ساڵە دراوسێمانە.. ئایا من بەرپرسیارم لەوە؟ و قسەکانی

شەهاب بردمی بەرەو پرسیارێ کە نەمدەزانی وەڵامی بەمەوە، ئەویش ئەوە بوو: ئەگەر من موسڵمانم لەو ساتەوەی کە لەدایك بووم، ئەی باشە ماوەی ئەو ٤٠ ساڵە چیم پێشکەش کردووە بە ئیسلام؟ من گوێم نەدەدایە ئایا دراوسێکەم نوێژ دەکات یان نا، بەردەوام بووم لە ڕامانەکانم و ئۆتۆمبیلم لێ دەخوڕی و نەمدەزانی بۆ کوێ دەچم، نەمدەزانی ئایا من ئۆتۆمبێلەکە لێدەخوڕم یان ئۆتۆمبێلەکە من دەبات بەرەو شوێنێ کە نازانم!! کاتێ کە من بەو شێوەیە بووم، بە بانگی مەغریب بەئاگا هاتمەوە و ڕۆیشتم بۆ نزیکترین مزگەوت و موفاجەئات لەوەدا بوو دوای نوێژەکە وانەیەك هەبوو، سەرەتای وانەکە بەم پرسیارە دەستی پێکرد: ئایا تۆ ئیسلامت خۆش دەوێ؟ و ئەگەر تۆ ئیسلامت خۆش دەوێ ئەی چیت پێشکەش کردووە بەم ئیسلامە؟ وام هەست دەکرد قسەکردنەکە بە ئاراستەی منە. وانەکە درێژەی کێشا تا نوێژی عیشا، دوای نوێژ گەڕامەوە بۆ لای ئۆتۆمبیلەکەم و دەنگی مۆبایل هات لە گیرفانمەوە، ئاوازەکەی بریتی بوو لە ئاوازی یەکێ لە گۆرانیە بەناوبانگەکانی گۆرانیبێژێك، هەرچەندە لەوەتەی مۆبایل داهاتووە من خاوەنی مۆبایلم، وە من ڕۆژانە دەیان جار گوێ لەو ئاوازە دەگرم، بەڵام ئەمجارەیان هەستم بە توڕە بوون کرد، و پرسیم: بۆچی ئاوازەکە بۆ نموونە دەنگی بانگەواز نەبێت، یان ووشەی الله اکبر، وەك چۆن هەندێ سەعاتی دیوار ئەو ئاوازەیان لەسەرە، بۆ یەکەمین جار بیرم کردەوە کە دەنگی ئاوازەکە بگۆڕم بۆ دەنگی بانگدان. کاتێ باوکم ئیسلامی خۆشویست ئەسانسێرەکەی گۆڕی. لە خۆمم دەپرسی: چۆن وا بکەم کە هەموو خەڵکی ئەم شوقە و عەمارەیە نوێژ بکەن، چونکە پەیوەندی نێوانمان ساتیی بوو، ڕێگایەك نەبوو تا پێکەوە قسە بکەین؟! لەبەر ئەوە بیرم کردەوە کە ئاهەنگێکی گەورە و فراوان لە شوقەکەمدا ساز بکەم و هەموان بانگ بکەم، خێزانیشم شەکەت نەکرد بە خواردن دروستکردنەوە بەو برە زۆرە، بۆیە ڕێکەوتم لەگەڵ چێشتخانەیەك تا هەستێ بەو کارە.. هەستام بە لێدانی کاسێتێکی ڤیدیۆیی یەکێ لە بانگخوازە بەناوبانگەکان.. بابەتەکەش بریتی بوو لە ﴿چۆن ئیسلاممان خۆش بوێت؟﴾ تەلەفزیۆنە شاشە ﴿٩٩﴾کە ڕۆڵێکی مەزنی هەبوو بۆ جوان نیشاندانی کاسێتەکە و کاریگەریەکەی. شوێنێکیشم لە شوقەکەدا تەرخان کرد بۆ نوێژ کردن.. بەڕاستی دراوسێکانم زۆر دڵخۆش بوون بەو بانگهێشتە، هەندێکیان

داوایان لێکردم کە مانگانە ئەو کارە ئەنجام بدرێت.. هەندێکیشیان بە شۆخیەوە داوایان دەکرد کە ڕۆژانە بێت.. بۆ یەکەمجار هەموو دانیشتووی عەمارەکە ژن و پیاو پێکەوە نوێژیان کرد. چەند جارێ ئەو بانگهێشتەم دووبارە دەکردەوە، بەڕاستی زۆربەی خەڵکی عەمارەکەم دەبینی دوای ئەوە بە ڕێکو پێکی لە مزگەوت نوێژ دەکەن، بۆیە حەماسەتم بۆ کارەکە زیادی کرد، لەبەرئەوە بیرم دەکردەوە چۆن ئەو کاریگەریە لە خەڵکی عەمارەکەوە بڵاوبکەمەوە بە خەڵکی گەڕەکەکەدا و بەهەموو ناوچەکەدا.. خێزانم بەو هەڵسوکەوتانەم زۆر بەختەوەر بوو، وە هەروەها منداڵەکانیشم، بەتایبەتی کاتێك ئاوازی مۆبایلەکەم گۆڕی بۆ ئاوازی بانگدان.. و هەروەها ئاوازی سەعاتی دیوارەکەش.. و هەستام بە پەیوەستکردنی بازنەی ئەلیکترۆنی بە ئەسانسێرەکانی عەمارەکانەوە هەمویان، بەشێوەیەك لە کاتی جوڵانیدا دوعای سواربوون بخوێنێت و لەبەرئەوە زۆر دڵخۆش بووم کاتێ شەهابم بینی بابەتێکی لە ڕاپۆرتەکەیدا نوسی بە ناونیشانی ﴿کاتێ باوکم ئیسلامی خۆش ویست ئەسانسێرەکەی گۆڕی﴾ خەندەیەکم کرد و لە دڵی خۆمدا بە ئەسپایی ووتم: بەڵێ، کاتێ ئیسلامم خۆشویست ئەسانسێرەکەم گۆڕی، بەڵام هێشتا ڕێگای زۆرم لەبەردەمدایە تا پێشکەشی بکەم بەم ئیسلامە، ئەگەر بەڕاستی من ئیسلامم خۆشدەوێت..

پرسیاری کوڕەکەم بردمی بەرەو خۆشویستنی ئیسلام، لەبەرئەوە ئەم چیرۆك و بەسەرهاتەم بۆ ناردن، تا هەواڵتان پێ بدەم کاتێ بەڕاستی من ئیسلامم خۆش ویست ئەسانسێرەکەم گۆڕی، تا سوننەتی پێغەمبە (د.خ) بهێنمەوە یادی خەڵکی، ئایا تۆش ئیسلامت خۆش دەوێ؟ ئەی چیت کرد کاتێ خۆشت ویست؟

## ٤٨- ﴿ئافرەتێکی تورکی.. گریا و گریاندمی﴾

لە ناو حەرەمی مەککەدا بووم، یەکێك کێشای بە شانمدا!!! بە زمانێکی بیانی.. حاجی... کە لام کردەوە ئافرەتێکی تەمەن مامناوەند بوو، وا گومانم برد کە تورکە.. سڵاوی لێکردم.. یەکسەر خۆشەویستی چووە دڵمەوە.. سبحان الله ڕۆحەکان سەربازانی گوێڕایەڵن.. دەیەویست شتێك بڵێت.. دەیەویست وتەکانی کۆبکاتەوە.. ئاماژەی بەو قورئانەدا  کە من هەڵمگرتبوو، بە عەرەبیەکی ناتەواو بەڵام لێی تێدەگەشتم ووتی ﴿تۆ قورئان دەخوێنیتەوە؟﴾ووتم: بەڵێ! ئافرەتەکە... دەموچاوی سور هەڵگەڕا... چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك، نزیك بوومەوە لێی، ئەو دیمەنەی زۆر کاری تێکردم و دەستم کرد بە گریان!! بەخوا بەشێوەیەك دەگریا وەك ئەوەی توشی مەینەتیەك بووبێت. پێم ووت: چیتە؟؟ بەدەنگێکی خنکاوەوە وامزانی ئێستا گیانی دەردەچێت و بەسەرسامیەوە تەماشای دەکردم... وەك ئەوەی شەرم بیگرێت!!! ووتی: من نازانم قورئان بخوێنمەوە!!! پێم ووت: بۆچی؟؟ ووتی: ناتوانم... لە گەڵ کۆتایی هاتنی پیتی ﴿م﴾ دا.. دەستی کردەوە بەگریان، دەستم خستە سەرشانی و هێورم کردەوە و ووتم: تۆ ئێستا لەماڵی خوادایت، داوای لێبکە کە فێرت بکات.. داوای لێبکە دامەزراوت بکات لەسەر خوێندنەوەی قورئان، چۆڕ چۆڕ فرمێسك بە چاویدا دەهاتە خوارەوە لە دیمەنێکدا کە هەتا لە ژیاندا مابم بیرم ناچێتەوە، ئافرەتەکە دەستەکانی بەرز کردەوە و لە خوای گەورە پاڕایەوە: ﴿خوایەگیان بیر و هۆشم بکەرەوە.. خوایە گیان بیر و هۆشم بکەرەوە تا قورئان بخوێنمەوە.. خوایەگیان بیر و هۆشم بکەرەوە تا قورئان بخوێنمەوە.. ووتی پێم: من دەمرم و ناتوانم قورئان بخوێنم.. ووتم پێی: نا.. پشت بەخوا بەتەواوەتی دەیخوێنیتەوە و چەند جارێ خەتمی دەکەیت و پێش ئەوەی بمریت. لێم پرسی: ئایا فاتیحە دەزانیت بخوێنیت؟ ووتی: بەڵێ.. خوێندیەوە و چەند سورەتێکی کورتیشی خوێندەوە.. من زۆر سەرسام بووم بە خوێندنەوە جوانەکەی.. و نهێنی لەوەدا بوو وەك خۆی پێی ووتم کە ئاشنا بووە بە هەندێ خوشکی عەرەبی نیشتەجێ کە نزیکن لێیەوە، زانیم کەچەند هەوڵێکی داوە تا خوێندنەوەی قورئان فێر ببێت، بەڵام زۆر زۆر ناڕەحەت بووە بۆی. پێی ووتم: کەواتە من دەمرم و ناتوانم قورئان بخوێنمەوە.. کەواتە دەچمە ئاگرەوە!! وە ووتیشی:

من هەمیشە گوێ لە کاسێت دەگرم.. بەڵام پێویستە بیخوێنمەوە، ئەوە وتەی خوایە.. وتەی خوای مەزن.. نەمتوانی خۆم بگرم و دەستم کرد بە گریان! ئافرەتێکی بیانی.. لە وڵاتێکی عەلمانیدا.. دەترسێت بە دیداری خوای گەورە بگات و کتێبەکەی نەخوێندبێتەوە.. یەکەمین ئاواتی لە ژیاندا ئەوەیە کە قورئان خەتم بکات، بەهۆی ئەوەوە زەوی تەسك بۆتەوە لەبەرچاوی و هەناسەی سوار بوو ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْكُمْ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ﴾ چونکە ناتوانێ کتێبی خوای گەورە بخوێنێتەوە..

ئەی ئێمە ئەبێ چۆن بین؟؟! ئێمە ئەبێ چۆن بین کە پشت گوێمان خستووە؟ ئێمە دەبێ چۆن بین کە بۆ ئێمە هاتوەوە و لەبیرمان کردووە؟ ئەبێ چۆن بین لەکاتێکدا هۆکارەکان ئاسان کراوە و دەستەبەر کراوە بۆ لەبەرکردن و خوێندنەوەی و تێگەشتنی.. کەچی ئەو شتەی کە بەهادار و خێردارە گۆڕیومانەتەوە بەو شتەی کەبێ ئەرزش و نزمە..

## ٤٩- ﴿پێی وتم ئەی (بەدر) هەستە و خۆت ئامادە بکە﴾

﴿ئەبو خالید﴾ بەسەرهاتێکی واقیعیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە دەرەوەی شار لە کێڵگەکەمدا بووم لە کوخێکی بچوکدا، دوور لە چاودێری خەڵکی بە تایبەتی ﴿دایکی خالید﴾ کە بێتاقەت بوو بووم لە خۆی و لە ئامۆژگاریە هەراسانکەرەکانی، چونکە من هێشتا گەنجم، سەرقاڵ بووم لەسەر ئامێری کۆمپیوتەرەکە و گوێم بە هیچ شتێ نەدەدا.. و هەستم بە ڕۆشتنی کات نەدەکرد، چونکە بێ بەهاترین شت بوو لەلای من.. لەکاتێکدا من لەو حاڵەتەدا بووم، سەعات لە دەوروبەری دووی شەودا بوو، کەش و هەوای دەوروبەرم لە هێمنیەکی زۆر سەیردا بوو گوێم لە هیچەوە نەبوو تەنها دەنگی دوگمەکانی کیبۆردەکە نەبێت کە پەنجەم پیایاندا دەنا و نامەی خۆشەویستیم دەنوسی بۆ هەموو شوێنێ... لەو کاتەدا و بەبێ پێشەکی، تەقە لە دەرگا درا بەشێوەیەك تەنها هەورەگرمەی دەهێنایەوە یادت... بەخوا بەو شێوازە.. خوێن لە دەمارەکانمدا بەستی... لەسەر کورسیەکە کەوتم و چاکەش ڕژا بەسەر کیبۆردەکەدا و کوژاندیەوە، لە شڵەژاویدا خەریك بوو کۆمپیوتەرەکە بخەمە خوار... تەماشای دەرگاکەم کرد بەهۆی تەقەلێدانەوە ئەلەریەوە... کێ لە دەرگا دەدات..و لەم کاتەشدا..و بەو توندیەش... بەهۆی لێدانێکی زۆر توندتر لەوانەی پێشوتر.. بیروهۆشم پچڕا... وەك ئەوەی بڵێت دەرگاکە بکەرەوە، ئەگەر نا دەیشکێنم.. ترس و تۆقینەکەم زیادی کرد، چونکە ئەو کەسەی کە تەقەی دەیا لە دەرگاکە قسەی نەدەکرد، ئەگەر قسەی بکردایە هێور دەبوومەوە... تۆ بڵێی دەرگای کێڵگەکەم دانەخستبێت؟ ئەی.. زۆر بە باشی دامخست و هەفتەی پێشو قفڵێکی نوێم بۆ هێنا.. ئەوە کێ بێت؟؟ چۆن هاتووەتە ژوورەوە؟؟ ئەی لە کوێوە هاتوەتە ژوورەوە؟؟ هیچ شتێ لە بیرکردنەوە نەیدەپچڕاندم تەنها دەنگی دەرگاکە نەبێت کە زۆر بەتوندی تەقەی لێدەدا.. نزیك بوومەوە لە دەرگاکە، لاشەشم لە تۆقیندا دەلەرزی و پێکانم توانایان نەبوو هەڵمبگرن، ئەبێ کێ بێ لەپشت ئەو دەرگاوە چاوەڕوانی منە... ئایا دەرگاکە بکەمەوە؟ چۆن بیکەمەوە لەکاتێکدا کە نازانم کێیە.... لەوانەیە دز بێت؟؟ بەڵام ئایا دز تەقە لە دەرگا دەدات؟ لەوانەیە.... کێ؟ پەنا بەخوا... هەر دەیکەمەوە، چی دەبێت با ببێت.... دەستە لەرزیوەکانم برد بۆ ئەڵقە ڕێزەکە و بەرزم کردەوە و

دەرگاکەم کردەوە. ڕوخساری لە غەریب دەچوو، پێشتر نەمبینی بوو... پیایا دیاربوو کە لە دەرەوەی شار هاتبوو، نەخێر دەشتەکی بوو، بەڵێ دەشتەکی بوو، قسەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد، بە زمانێکی ڕێزمانانەوە وتی: بۆچی دەرگاکەت نەکردەوە؟؟ سەیرە، بەو شێوەیە... بەبێ پێشەکی.. تۆ منت ترساند.. خەریك بوو لە تۆقیندا بمرم.. قسەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد.. تفی ناو دەمم قوت دایەوە و پێم ووت: تۆ کێیت. ووتی: چ گرنگیەکی هەیە بۆ تۆ کە من کێ بم؟؟؟ بێمە ژوورەوە...؟ چاوەڕوانی وەڵامی منی نەکرد.. لەسەر کورسیەکە دانیشت.. تەماشای ژوورەکەی دەکرد... وەك ئەوەی پێشتر منی ناسیبێت و ئاشنا بێت بە شوێنەکە... تکایە پەرداخێ ئاو... بەهۆی ئەدەبیەوە کەمێك هێور بوومەوە. ڕۆیشتم بۆ مەتبەخ... ئاوەکەی خواردەوە... بە تێڕوانینێکی ترسنکانەوە تەماشای دەکردم... پێی ووتم: ئەی ﴿بەدر﴾ هەستەو خۆت ئامادە بکە؟؟!! چۆن ناوی منی زانی؟؟ پاشان خۆم بۆچی ئامادە بکەم؟؟ تۆ کێیت هەتا فەرمانم پیادا بدەیت کە خۆم ئامادە بکەم؟؟ بەشێوەیەك هاواری کرد بەسەرمدا دۆڵەکە هاتە لەرزین.. بەخوا لەهەموو ژیانمدا هاواری بەو شێوەم نەبیستبوو. پێی ووتم: بەدر، هەستەو جلەکانت لەبەرکە، دەبێ لەگەڵمدا بێیت.. غیرەتم هێنایە بە خۆم و ووتم: بۆ کوێ؟؟ ووتی: بۆ کوێ!! بەگاڵتە پێکردنەوە ووتی: هەستە و پاشان دەبینیت بۆ کوێ... ڕوخساری بێزار دیار بوو.. برۆکانی گەورە بوون... تیژی تێڕوانینی کەسانی جوامێریشی دەترساند... ئیتر من چۆن نەترسم... کە ترسنۆکترین کەسم... جلەکانم لەبەرکرد و شڵەژاویم پێوە دیاربوو، بەشێوەیەك جلەکانم لەبەر دەکرد لە منداڵێکی بچوك دەچووم  کە پێویستی بە دایکی بێت جلەکانی لەبەر بکات.. خوایەگیان.. ئەم پیاوە کێیەو چی دەوێ لەمن.. خەریك بوو تێك دەچووم.. ئەی چۆن منی ناسی؟ ئای خوایە، خۆزگە پێش ئەم ڕووداوە من بردمایە و کەسێك نەبوومایە و لە خەیاڵی کەسدا نەبوومایە.. ﴿فَالَتْ يَالَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَنْسِيًّا(٢٣)﴾مریم.. لەبەردەمیدا وەستام و سەرم شۆڕکردبوویەوە، وەك تاوانبارێك لەبەردەم دادوەردا کە خەریکە حوکم دەدرێت بەسەریدا.. وەك شێر هەستایەوە و وتی: دوامکەوە... لە دەرگاکە ڕۆشتە دەرەوە و منیش دوای کەوتم.. تەماشای دەوروبەرم دەکرد، وەك سەرگەردان وابووم کە بەدوای شتێکدا بگەڕێ، تەماشای دەرگای کێڵگەکەم کرد،

بەڵکو شکاندبێتی؟ بەڵام هەموو شتێکم بینی کە ئاساییە؟؟؟ ئەی چۆن هاتە ژوورەوە؟؟ سەرم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، ئەستێرەکان ئاسمانیان تەنی بوو.. خوایەگیان ئایا من خەو دەبینم... پەروەردگارا لێم ببورە.. تەماشای نەدەکردم، دڵنیابوو کە من دودڵ نیم لە شوێنکەوتنی، چونکە من لەوە ترسنۆکترم.. بە متمانە و شارەزاییانەوە دەڕۆشت بەڕێوە و شارەزای دەوروبەرمان بوو، وە من لەژیانمدا نەمبینی بوو، بەڕاستی سەرسام بووم... تەماشای دەوروبەرم کرد، بەڵکو کەسێك ببینم و هانای بۆ بەرم و ڕزگارم بکات لەم ناڕەحەتیە، بەڵام بێ سوود بوو... سەرکەوت بەسەر شاخەکەدا منیش لەتاو ماندوو بوون هەناسە برکێم پێ کەوتبوو، ئاواتم دەخواست کەمێك وچانم پێ بدات و بحەسێمەوە بەڵام کێ دەوێرێ داوای ئەوە بکات... کاتێ کە سەردەکەوتین بەسەر شاخەکەدا، هەستم بە گەرما دەکرد، بەڵکو گەرمیەك خەریك بوو لەشمی دەسوتاند، چەندە نزیك ببوینایەتەوە لە لوتکەی شاخەکە، گەرماکە زیاتردەبوو.. گەشتینە لوتکەی شاخەکە.. خەریك بوو لەتاو گەرما دەتوامەوە بانگی کردم: بەدر وەرە، نزیك بەرەوە.. منیش دەڕۆشتم و دەلەرزیم و تەماشام دەکرد، کاتێ وورد بوومەوە، شتێکم بینی لەژیانمدا نەمبینی بوو.. تاریکاییەکی مەزنم بینی هەتا چاو بڕ بکات، بەڵکو کۆتاییەکەیم نەدەبینی، لەو تاریکیەدا بڵێسەی ئاگرم بینی بە ئاسماندا بەرز دەبوویەوە، پاشان نزم دەبوویەوە، ئاگرم دەبینی لێیەوە دەردەچوو، سوێند دەخۆم هەر شتێ لەبەردەمیدا بوەستایە تێکی دەشکاند.. ئای کێ بەرگەی دەگرێت و کێ هەڵیگیرساندووە.. لەلای ڕاستی ئەو تاریکاییەوە، کۆمەڵێ مرۆڤم بینی نەمدەتوانی بیانژمێرم، ڕووت و قوت بوون، هیچیان لەبەردا نەبوو پیاو و ئافرەت، بەخوا تەنانەت ئافرەتەکان وەکو شەپۆلی دەریاکان بەهۆی زۆری و سەرسامیانەوە شەپۆلیان دەدا.. بە شێوەیە دەیانقیژاند، گوێکانی کەڕ دەکرد، لە کاتێکدا من سەرسام و ئەبڵەق بوو بووم بەو دیمەنە، ئەو پیاوەم بینی کە بانگی کردم: بەدر... تەماشام کرد.. خەریك بوو دەگریام.. پێی ووتم: دەی دابەزە.. ووتم: بۆ کوێ؟؟ ووتی: بۆلای ئەو خەڵکە... ووتم: بۆچی؟؟ من چیم کردووە تا لەگەڵ ئەواندا بم؟؟ ووتی: پێم وتیت دابەزە و قسە مەکە.. لێی پاڕامەوە، بەڵام ڕایکێشام هەتا لەشاخەکە دایبەزاندم.. پاشان فڕێی دامە ناویانەوە... بەخوا هەر تەماشاشیان نەکردم و هیچ

گرنگیەکیان پێ نەدام، هەریەکە سەرقاڵ بوو بەخۆیەوە!!.. هاوارم دەکرد و بانگم دەکرد.. هەر کاتێ یەکێکیانم بگرتایە ڕای دەکرد لەدەستم.. ویستم بزانم، من لەکوێم، ئەم مرۆڤانە کێن.. بیرم کردەوە کە بگەڕێمەوە بۆ سەر شاخەکە، کاتێ لەناو قەرەباڵغیەکەدا هاتمە دەروە.. پیاوانێکی توند و تیژم بینی.. لەشیان گەورە بوو، بێزاری بە ڕوخساریانەوە دیار بوو، چەکوشی وایان بەدەستەوە بوو بیان کێشایە بە شاخدا دەتوایەوە، ڕێگایان لە خەڵکەکە دەگرت تا نەیەنە دەرەوە.. تیا مابووم، تەماشای دەوروبەرم دەکرد.. دەمقیڕاند و دەمقیڕاند.. دەموت: خوایەگیان من لەکوێم، ئەی بۆچی من لێرەم و چیم کردووە؟؟ هەستم بە شتێك کرد کە لە دواوە بانگم دەکات.. لام کردەوە، تەماشام کرد، دایکمە، هاوارم کرد: دایکە، دایکە.. بەخوا لای نەکردەوە بەلامدا... بە قەرەباڵغیەکەدا دەڕۆشتم، پاڵم بەمەوە دەناو خۆم لەوی تر لادەدا، ئەمەوێ بگەم بە دایکم، کاتێ نەویمەوە بۆی و لای کردەوە بەلامدا و تەماشایەکی کردم کە پێشتر ڕانەهاتبووم بەو تەماشاکردنە.. دایکم زۆر بەسۆز بوو.. پێی دەوتم: ئەی بەدر، بەخوا تەمەنیشت ببێ بە پەنجا ساڵ، من هەر وەك منداڵێکی بچوك دەتبینم، یاری لەگەڵ دەکردم و نازی دەکێشام، وەك ئەوەی کوڕێکی سێ ساڵان بم.. ئای ئەوە چی ئەوی گۆڕیوە؟؟ گرتم و پێم ووت: دایکە، من بەدرم، ئایا نامناسیت؟؟ ووتی: ئەی بەدر، ئایا دەتوانیت سودم پێ بگەیەنیت بە شتێك؟؟ پێم ووت: دایکە ئەم پرسیارە سەیرە چیە؟؟ من بەدری کوڕتم، دایکە گیان چیت دەوێ داوایکە،دایکی ئازیزم.. ووتی: بەدر گیان، دەمەوێ لە چاکەکانی خۆتم بەیتێ، بەڕاستی من پێویستم پێیانە.. چاکە، چ چاکەیەك دایەگیان، ووتی: ئەوە چیە بەدر، ئایا تۆ شێتی؟ تۆ ئێستا لە گۆڕەپانی قیامەتدایت، ئەگەر دەتوانی خۆت ڕزگار بکە.. ئاه ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاستە، ئای داد و بێداد، ئاه چی بکەم من.. دایکم ڕای کرد و بەجێی هێشتم نە باوەشی پیاداکردم و نە بەزەیی پیامدا هاتەوە.. لەو کاتەدا منیش وەکو ئەوان هەستم کرد کە ئەمە ساتی لێپرسینەوەیە و قیامەتە... دەگریام و هاوارم دەکرد و لۆمەی خۆمم دەکرد.. ئاه چۆن تەمەنی خۆمم فەوتاند... بەدر ئێستا پاداشتی کردەوەکانت دەزانیت.. ئێستا ئەی بەدر بەرهەمی دەستی خۆت دەچنیتەوە. تاوانەکانی خۆمم بیرکەوتەوە کە لە دنیادا دەمکرد.. هەوڵمدەدا کە چاکەیەکی خۆمم

بێتەوە یاد و دڵم پێی خۆش بێت، بەڵام هەی هو.. ئاه، بیری ئەوەم کردەوە کە پێش کەمێك تەماشای سایتە بەدڕەوشتیەکانم دەکرد لە ئینتەرنێتدا.. ئاه.. خۆزگە نەمکردایە.. بەڵام بەخوا ئێستە پەشیمانی دادم نادات.. کاتێ من لە بیرکردنەوەدا بووم.. گوێم لە هاوارێکەوە بوو، هاواری کرد لە خەڵکەکە! ئەی خەڵکینە، ئەوە پێغەمبەری خوایە (محمد)، بڕۆن بۆ لای.. خەڵکەکە بە منیشەوە شەپۆلیاندا وەك چۆن کەسێکی نقوم بوو لە دەریادا شەپۆل پێدەدات بەدوای دەنگەکەدا دەڕۆشتن.. نەمدەتوانی هیچ ببینم.. خەڵکەکە وەك ڕانەمەڕێکی زۆر وابوون.. جارێك بەلای ڕاستدا دەچوون و جارێکیش بەلای چەپدا و جارێکیش بۆ پێشەوە، بەدوای پێغەمبەردا دەگەڕان.. کاتێ بەڕێگادا دەچوین، ئەو پیاوە توند و تیژانەم بینی، بە توندی پاڵیان بەخەڵکەکەوە دەناو خەڵکەکەش دەیانەویست ڕابکەن، بەڵام بێ سوود بوو، ئەوەی هەوڵی بدایە کە ڕابکات بەو چەکوشانە دەیانکێشا بە ڕوخساریدا، ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بوایە دەتوانەوە... خەڵکی لەو تاریکیە مەزنەدا پۆل پۆل دەکەوتن، هەندێکیانم دەبینی بە پێی خۆی دەڕۆشت و دەکەوتە ناویەوە، هەشبوو دەڕۆشت بەسەریدا؟ بەڵێ، بەخوا؟ دەڕۆشتن بەسەریدا، بەسەر پردێکدا کە دانرابوو لەسەری، بەخێراییەکی سەیر تێدەپەڕین.. نەمدەزانی بۆ کوێ دەچن. بەڵام من لەکۆتایی ئەو تاریکیەدا، لە دوورەوە ڕووناکیەکم دەبینی ئەوانەی بەسەر پردەکەدا دەپەڕینەوە دەگەشتنە ئەوێ.. لەپڕ خەڵکەکەم بینی دەیان ووت: ئەوە پێغەمبەری خوایە.. تەماشام کرد پیاوێکم بینی عەمامەیەکی سپی بەسەرەوە بوو، لەگەڵ عابایەکی سپیدا، ڕوخساری وەك مانگ وابوو.. تەماشای خەڵکەکەی دەکرد، دەیفەرموو ﴿اللهم سَلِّم سَلِّم﴾ خەڵکەکەش بە پاڵنان بەرەو ڕووی دەچوون، دوای ئەوە نەمتوانی بیبینمەوە.. من وورده وورده لەو تاریکیە نزیك دەبوومەوە و خەڵکەکەش هاواریان دەکرد، هەمویان نەیاندەویست بڕۆنە ناویەوە.. بۆم دەرکەوت کە ئەو شوێنە ئاگری دۆزەخە.. بەڵێ.. ئەدی ئەو ئاگری دۆزەخە بوو کە خوای گەورە لە کتێبەکەیدا هەواڵی پێداوین.. ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا ئاگاداری کردوینەتەوە لێی.. بەڵام ئێستا بزانم چ سودێکی هەیە بۆ من، ئەوەتا ڕامدەکێشن بەرەو ئەوێ.. پڕ بینم هاوارم کرد: ئاگر ئاگر ئاگر ئاگر..

بەدر بەدر بەدر، ئەوە چیت لێ بەسەر هاتووە؟؟ لەسەر جێگاکە بازمداو تەماشای دەورو بەرم دەکرد.. بەدر خۆشەویستم ئەوە چیتە؟؟ ﴿دایکی خالید﴾ کە خێزانم بوو، گرتمی و باوەشی پیادا کردم و ووتی: ئەوە چیتە.. ﴿بسم الله﴾ت لێ بێ.. هیچ نیە، هیچ نیە.. تۆ هاوارت دەکرد ﴿ ئەبو خالید﴾ دەتوت: ئاگر ئاگر، کابوست بینی ﴿بسم الله﴾ت لێ بێ.. لەتاو ئەو دیمەنەی کە بینیبوم عارەقم دەردەدا.. نوێنەکەم لادا و هەستامەوە و دەرگاکەم کردەوە و بە ژوورەکاندا دەگەڕام چووم بۆ ژووری خالید و براکانی، گڵۆپەکەم داگیرساند و تەماشام کرد هەموویان خەوتون.. ڕۆشتمە لایان و یەکە یەکە ماچم کردن.. دایکی خالید لەبەردەم دەرگاکەدا بوو، تەماشای دەکرد و سەرسام بوو بوو؟ ئەوە چیتە باوکی خالید؟؟ ئاماژەم بۆ کرد کە بێدەنگ بێت هەتا منداڵەکان هەڵنەستن.. ڕووناکیەکەم کوژاندەوە و بە ئەسپایی دەرگاکەم داخستەوە.. لە هۆڵەکەدا دانیشتم، پەرداخێ ئاوی بۆ هێنام.. ئاوەکەم خواردەوە، ساردی ئاوەکە سەختی ئەو گەرمایەی بیرخستمەوە کە لەخەومدا بینیبووم.. یادی خوام کردەوە و ئیستیغفارم کرد و داوای لێخۆشبوونم کرد..

– ئەی دایکی خالید

– ئازیزم ﴿بسم الله﴾ بکە.

– لەمڕۆ بەدواوە یارمەتیم دەدەیت کە خۆڕاگربم، من لەمڕۆ بەدواوە پشت بە خوا لەڕیزی چاکەکاران دەبم.

– الله... ئەو قسانە چەندە خۆشن.. سوپاس بۆ خوا چی وای لێکردیت بگەڕێیتەوە بۆ ڕیزی چاکەکاران.

– دایکی خالید چۆن دەبێ بێئاگابین لەخوا کە لێمان دەبورێ سوپاس بۆ خوا کە ڕێگای نیشاندام، خوای گەورە دامەزراومان دەکات لەسەر خێر و چاکە. ئایا پێش ئەوەی کار لەکار بترازێ لەوە پەند و ئامۆژگاری تر هەیە؟؟؟

## ٥٠- ﴿خوای گەورە ویستی توشی خێر بێت، بۆیە ڕێنمایی کرد بۆ تەوبەکردن﴾

کچێك لە تەمەنی بیستساڵیدا، خوای گەورە ویستی توشی خێر بێت بۆیە ڕێنمایی کرد بۆ تەوبە کردن و ڕێنمایی.. کچەکە دەڵێت: ژیانم وەك ژیانی نەزانین و جاهیلیەت وابوو، هەرچەندە من کچی خێزانێکی دیندار بووم.. و پابەند بوون بە بەها ئیسلامیەکانەوە.. من پارێزگاری کاتی نوێژەکانم نەدەکرد، تەنانەت نوێژی بەیانیم نەدەکرد، دوای سەعات دەی بەیانی دەمکرد.. خوشك و براکانم دەبینی شەوانی ڕەمەزانیان زیندوو دەکردەوە.. و قورئانیان دەخوێند.. منیش شەوم زیندوو دەکردەوە بەتەماشاکردنی کاسێتی ڤیدیۆ و تەماشاکردنی ئەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشە، شەوێکیان دوای ئەوەی ڕۆشتمە ناو جێگاکەم، وەك چۆن کەسێ خەو دەبینێ بینیم من لەگەڵ کۆمەڵێ هاوڕێی خراپی خۆمدا بووم، وەك پیشەی ئاساییمان یاریمان دەکرد، جەنازەیەك بە بەردەممدا تێپەڕی، منیش دانیشتم و تەماشام دەکرد، هەوڵمدا بگەم پێی، نەمدەتوانی، هەر ڕۆشتم و کەوتمە ڕێ تا گەشتم پێی، دوای ئەوەی ڕۆشتین بە ڕێگایەکی خوار و خێچدا، نەمتوانی بەردەوام بم لە ڕۆشتن، ژوورێکی بچوکی تاریکم بینی ڕۆشتمە ناویەوە وتم: ئەوە چیە؟ پێیان ووتم: ئەمە گۆڕی تۆیە و ئەمە چارەنوسی تۆیە، لەو کاتەدا ویستم پیاچونەوەیەکی تەمەنم بکەم. تا توانام هەبوو هاوارم کرد، قورئانم دەوێ.. دەمەوێ نوێژ بکەم.. دەمەوێ فرمێسك بڕێژم تا ڕزگارم بکات لەسزای ئازاراوی خوا.. دەنگێك لە دوامەوە هات و ووتی: تازە کار لەکار ترازاوە.. تۆ تەمەنت بەسەر برد و ڕۆچووبویت لە لەزەت و ئارەزواتەکانی دنیادا.. لەپڕ بەدەنگی مامۆستا لە نوێژی بەیانیدا خەبەرم بوویەوە کە ئەم ئایەتەی دەخوێند : {أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ } ﴿الحديد : ١٦﴾. واتە: {ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران کە دڵیان بترسێ بە یادی خوداو ئەو قورئانەی کە لە خواوە هاتۆتە خوارەوە؟}.

بەسەرهاتی ژیانم هاتە پێش چاوم، بەڕاستی نیعمەتی خوای گەورە منی گرتەوە پێش ئەوەی وەفات بکەم..

# ٥١- ﴿چی کرد کاتێ خۆشەویسترین منداڵی وەفاتی کرد؟﴾

ئەوەی کە لەبەردەمیدا وەستاوم شایەت بێت کەمن ڕاستیی دەڵێم...

ئافرەتێك مێردەکەی دەمرێت و ٥ کوڕ و ٣ کچ لەدوای خۆی بەجێ دێڵێ لە ڕووداوێکی دڵتەزێنی هاتوچۆدا وەفات دەکات، گەورەترین منداڵیشی هێشتا لە سەرەتاییدایە، بارودۆخی مادیشیان زۆر خراپ دەبێت، لە گوندێکی زۆر دوورە دەستدا دەژین، هیچ هۆکارێکی گواستنەوەی تێدا نەبوو، ئەو موچەی خانەنشینیەی کە ئەو بێوەژنە خەرجی دەکرد بۆ نۆ کەس زۆر کەم بوو. ئەو ئافرەتە بە پێ ماوەیەکی زۆری دەبڕی لەگەڵ منداڵەکانی تا لە شارەوە شتێکیان بۆ بێنێ.. زۆر کەس چوبوویە داوای.. بەڵام ڕازی نەبووبوو.. کاریگەر بوو بوو بە فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ) کە دەفەرموێ ﴿أَنَا وَكافِلُ اليَتِيم كَهَاتَين﴾ واتە: ﴿من و بەخێوکاری هەتیو وەك ئەوە واین– ئاماژەی بە پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاست دابوو کەمێك دوری خستبوونەوە لەیەك..﴾ ئافرەتێکی دیندار بوو، منداڵەکانی پەروەردە کردبوو لەسەر پەروەردەیەکی ئیسلامی.. منداڵەکانی ئارام دەکردەوە لەو ژیانە ناخۆشەی کە تیایدا بوون بە باسکردنی ڕۆژی دوای و ئەو ناز و نیعمەتەی کە خوای گەورە دایناوە بۆ ئارامگران، بۆیە خۆی و منداڵەکانی ئارامیان دەگرت بەو بەڵێنەی کە خوا دابووی پێیان.. ئەوەی کە ئێستا بەسەرهاتەکەتان بۆ دەگێڕێتەوە کوڕی چوارەمی ئەو دایکەیە: ﴿بەڵێ من زۆر شانازی دەکەم بە دایکمەوە.. بەهۆی ئارامگریەوە و بەرگەگرتنی سەختی ژیان.. جارێکیان یەکێك پێی وتم: بەخوای مەزن ئەگەر ئەوە دایکی من بوایە ناوی ئەوم دەکرد بە پاشگری ناوی خۆم و شانازیم پێوە دەکرد.. بەڕاستی ئەم دایکیش و باوکیش بوو بۆ ئێمە، ئەو هەڵدەستا بەهەموو کاروبارەکانیماڵەوە لە پاککردنەوە و چێشت لێنان و بەخشینی سۆزی دایکایەتی لەگەڵ ئەو هەموو سەختیەی ڕۆژگاردا؟ و پێداویستی ئێمەی لە بازاڕ دەکڕی و بە پێ هاتوچۆی دەکرد و زۆر شەکەت دەبوو.. بەخوا هەموو کاروبارەکانی ماڵەوەی ئەنجام دەدا؟ ئەو مامۆستا و ڕێ نیشاندەرمان بوو؟ ئەو هەموو کەسمان بوو دوای ئەوەی کە زۆربەی خزمەکانمان پشتیان

تێکردبووین تەنانەت تاکە براکەی باوکیشم ﴿مامم﴾ کە بە هیچ شێوەیە هەواڵی نەدەپرسین، کە دایکم ڕازی نەبووبوو شووی پێ بکات؟ خوای گەورە ماندووبوونی ئەو ئافرەتەی قەرەبوو کردەوە، من و خوشك و براکانم گەورە بووین، خوای گەورە منەتی بەخشی پێمان و دامەزراین.. هەمومان گواستمانەوە بۆ شاری ﴿ریاض﴾..

نامەوێ درێژەی بەمێ، بەخوا ئەگەر هەزار لاپەڕەش بنوسم و باسی مەینەتیەکانی دایکمی تیادا بکەم لە ژیانیدا، ئەوە هێشتا هەقی خۆیم پێنەداوە.. بەڵام یەکێ لە بەسەرهاتەکانیتان بۆ باس دەکەم، کاتێك ئەو کوڕەی کە ٣ساڵ لە من بچوکتر بوو وەفاتی کرد.. ئەم ڕووداوەش پێش دوو ساڵ ڕوویدا.. دەست پێدەکەم دەڵێم:...

براکەم چەند ڕۆژێ دیارنەما لەماڵمان، تەمەنیشی نزیکەی ٢٢ ساڵ بوو، خۆشەویسترینی منداڵەکان بوو لەلای دایکم؟ هەموو شوێنێ گەڕاین بەدوایدا، بەڵام نەمان دۆزیەوە، هەواڵماندا بە بنکەی پۆلیس.. دایکیشم هەر دوعای دەکرد و لەخوای گەورە دەپاڕایەوە.. ڕۆژێکیان گەڕامەوە بۆ ماڵەوە دوای ئەوەی کە لەسەر کار گەڕابوومەوە، براکەم لەبەردەرگا وەستا بوو، ووتی لە بنکەی پۆلیسەوە تەلەفۆنم بۆ کراوە کە خێرا لەوێ ئامادەبم.. بە خێرایی ڕۆشتین بۆ ئەو بەشە، نزیکەی دوو سەعات بەڕێوە بووین.. کاتێ گەشتین، ئۆتۆمبیلی براکەمم بینی، کە لە بەردەرگای بنکەی پۆلیسدا بەسەلامەتی ڕاگیراوە.. هیچ ڕوکانێکی پێوە نەبوو.. لەو کاتەدا من و براکەم لە خۆشیاندا پێکەنین و وامان زانی کە براکەمان لەوانەیە سەرپێچیەکی یاساکانی هاتوچۆی کردبێت و ئێستا دەستگیر کراوە؟... بەڵام وەك گەردەلول هەواڵەکەیان پێداین، کاتێ زانیمان کە براکەمان ئۆتۆمبیلەکەی لە قەراغ ڕێگاکەدا ڕاگرتوە و شەقامەکەی بڕیوە بۆ سایدەکەی تر و نازانین بۆچی؟ و لەکاتی گەڕانەوەیدا لە پڕ ئۆتۆمبێلێکی گەورەی بارهەڵگر ﴿ترێلە﴾ دەدات لێی و تایەکانی دەچێت بەسەریدا..

من و براکەم زۆر گریاین بەڵام بەهۆی هێورکردنەوەی پیاوانی ئاسایشەوە توانیمان بێتاقەتی خۆمان بشارینەوە و ئەوراقە یاساییەکان پڕبکەینەوە.. هەواڵیان پێداین کە تەرمەکەی لە نەخۆشخانەیەکی ترە، کە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، بە یەکتریمان دەوت چۆن ئەم هەواڵە بدەین بە دایکمان، ئەوە ﴿عەلی﴾ برامانە و ئێمە دەزانین کە بە چ ئەندازەیەك دایکم خۆشی دەوێت..؟ بەڵام براکەم ئاماژەی بۆ کردم کە بڕۆین و پورێکم

بهێنین بۆ ئێرە تا ئەگەر گریا یا بورایەوە بەدەمیەوە بێت.. بەڵێ ڕۆشتین پورممان هێنا و لە ئۆتۆمبێلەکەدا هەواڵەکەمان پێدا، دەستی کرد بە گریان، زۆرمان لێ کرد کە فرمێسکەکانی بشارێتەوە و نابێ ئەمیش لە بەردەمیدا بیکات بە شین و گریان چونکە خەفەتی ئەو زیاتر دەکات، بۆیە ڕازی بوو بەوە.. بەهۆی ترسی زۆرمەوە نەمدەویست دایکم لەو دیمەنەدا ببینم.. پورم دابەزی و منیش ڕۆشتم بۆ لای کوڕەکەی پورم لەماڵەوە.. چەند ساتێکی کەمی نەبرد مێردی پورم و پورم و براکەم و دایکیشمیان لەگەڵدا بوو.. مێردی پورم پرسیاری کرد، کە دایکم چۆنە، چۆن بەرگەی ئەو هەواڵەی گرت، ئایا حاڵی تێکنەچوو، ئایا.. منیش دەگریام؟؟؟ ووتی پێم: ئەوە چیە دایکتان لە ئێوە باشترە و ئارامگرە.. خوای گەورەی بیردەخستینەوە. ئەو زۆر لە تۆ باشترە ئەی پیاو؟ ڕۆشتم بۆ لای ئۆتۆمبێلەکە و بڕوام نەدەکرد.. دەرگاکەم کردەوە و بەدایکمم ووت: دایکە حاڵت چۆنە؟ دایکم خەندەیە گرتی و ڕازی بوو بە قەزا وقەدەری خوای گەورە.. وەك كێو خۆراگر بوو... وەك چۆن هەر لەمنداڵیەوە ناسیبووم، ئەوەندە متمانەی بە خوای گەورە هەبوو، هەرچی مەینەتیەکانی دنیایە سووك بوو بەلایەوە...؟ هێشتا ئەو خوای دەهێنایەوە بیرم و دەیوت: بەڕاستی ئەو ڕاسپاردە بوو، خوای گەورە ڕاسپاردەکەی خۆیی بردەوە..؟ ئەو هەمووەمانی هێور دەکردەوە.. بەخوا یەك فرمێسکم لە چاوانیدا نەبینی.. بەڵکو پێدەکەنی... سوپاسی خوای گەورەی دەکرد؟ ووتم: دایکە عەلی بووە بە ژێر ئۆتۆمبیلەوە... ئێوە بۆ کوێ ئەڕۆن، من ناتوانم وێنای ئەوە بکەم کە ئەو مردووە، ئیتر چۆن ئەتانەوێ من ببینم لەکاتێکدا لاشەی تێکشکاوە.. ووتی: کوڕی خۆم مەترسە، من لەگەڵتدا دەبم..؟؟؟ خوایەگیان، ئەم چۆن دایکێکە.. بەتەمای چ پاداشتێکە لەلایەن خواوە... ئەمە چ کێوێکە من خۆم داوەتە پەنای؟؟؟ ئێستا، تەنها ئێستا ئەم خاتونەم ناسی... بەخوا ئەو ئێمەی ئارام دەکردەوە و برا گەورەکەمی ئارام دەکردەوە؟؟؟ ئێستا فرمێسکەکانم سڕی و شەرمم کرد لە پەروەردگارم و لەخۆم.. تا ئێستا بەخوا هێشتا هیچم بۆ باس نەکردون، دە گوێ بگرن... من بەڕێگاوە بووم لەخۆمم دەپرسی... تۆ بڵێی دایکم بەرگەی ئەو دیمەنە بگرێت.. چی دەکات ئەگەر بە سەختی مەوقیفەکەی هاتە پێش چاو و ئێمە تەرمەکەمان لە سەلاجەی مردووەکاندا بینی؟ ڕۆشتینە نەخۆشخانەکەوە و ڕۆشتین

بەرەو لای سەلاجەی مردووەکان، مامم و خاڵم لەگەڵماندا بوون.. پێکەوە ڕۆشتین بۆ لای تەرمەکە و من لەترم دەبرد لە ڕۆشتنمدا و دایکیشم لە نزیکەوە وەك کێوی بەرز وابوو..؟ تەرمەکەیان دەرهێنا و لەسەر زەوی دایاننا، کارمەندەکە ووتی: لێرە بیکەنەوە و دڵنیابن لێی، بەخوا کەسمان نەمانوێرا نزیك بینەوە لێی و بیکەینەوە؟ دایکم لێی نزیك بوویەوە، وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی، ئیستیغفاری کرد و تەسبیحاتی کرد و داوای ڕەحمەت و بەزەیی بۆ کرد، براکەی پێی ووت: دەتەوێ چی بکەیت؟ ویستی دایکم بباتە دەرەوە، ووتی: تۆ بەرگەی ئەو دیمەنە ناگریت، دایکم وەڵامی نەیایەوە و هەر زیکری خوای گەورەی دەکرد، کفنەکەی کردەوە و هەموو شتەکانی سەری لابرد و بەڕاست و چەپدا هەڵی دەگێڕایەوە و دوعای بۆ دەکرد، بەخوا ئێمە هەمومان نەمانتوانی کەسمان وەك ئەو بیکەینەوە و ئەو پێشمان کەوت، تەنانەت کارمەندەکەی ئەوێ ووتی: ئەو ئافرەتە چی لێ هاتووە، هەواڵمان پێدا کە دایکیەتی، بڕوای نەدەکرد.. نێو چەوانی ماچ کرد و خواحافیزی لێ کرد و داپۆشیەوە و جلەکانی خستە کیسێکەوە و سوپاس و ستایشی خوای کرد، بەخوا لە چاوەکانیدا فرمێسکێکم نەبینی..؟ ڕۆشت بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە و لە شوێنی خۆیدا دانیشت و تەماشای جلەکانی دەکرد و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دوعای خێری بۆ دەکرد.. دوای چەند ڕۆژێ، خوا شایەتە لەسەر ئەو قسانەی کە من دەیکەم، گوێی لێوە بوو وەك ئەوەی کە کوڕەکەی بانگی بکات لەناو دڵیدا کە دانیشتبوو، بە ئاگا بوو، دەیوت: دایکە، بەڕاستی فریشتەکان پێشبڕکێ دەکەن بۆئەوەی بمبینن، و گوێم لێیانەوەیە دەڵێن: کوا کوڕی ئافرەتە ئارامگرەکە، کوا کوڕی ئەو ئافرەتەی بەتەمای پاداشتی خوایە، بەخوا دایە گیان ئەگەر من ئێستا لەلای تۆ بوومایە هەردوو پێتم ماچ دەکرد.

١

## ٥٢- ﴿دەنگێکی مەزن ئاسمانی مەککە دەبڕێت﴾

لەخۆشیا خەریك بوو شێت دەبوو، خەریك بوو دەفڕی، وەك دەڵێن جلەکانی نەیاندەگرتە خۆی، کاتێ کە بیستی وەرگیراوە بۆ ئەوەی لە فەرەنسە بخوێنێت.. وای هەست دەکرد کە هەموو دنیا هی ئەوە، بووبوو بە بنێشتە خۆشەی سەرزاری خزمانی، هەرکاتێ ساتی سەفەرەکەی نزیك ببوایەتەوە، وای هەست دەکرد کە پێشوازی لە دەروازەی سەردەمێکی نوێ دەکات و ئاسۆکانی بۆ دەکرێتەوە و بەرز دەبێتەوە. یەك شت بێتاقەتی دەکرد و هەراسانی دەکرد... چۆن مەککە جێ بێڵم، ساڵانێکی درێژە و دڵم وابەستەی بووە و لە کوچە و کۆڵانەکانیدا گەورە بووم. لە ئاوە سازگارەکەیم خواردۆتەوە، ئاوی زەمزەمی سازگار... کە ئێسکم و گۆشتمی پاراو کردووە! دایکم.... دایکی ئازیزم، کێ لەکاتی نەبونی مندا چاودێری بکات.. براکانم خۆشیان دەوێ.. بەڵام نەك وەك خۆشەویستی من.. کێ هەموو ڕۆژێ بیبات بۆ حەرەمی مەککە تا نوێژ بکات لەوێ. وەك پیشەی ئاسایی خۆی؟؟ پرسیار گەلێکی زۆر... وەڵامیان نەبوو. کاتی سەفەر هات و جانتاکانی پێچایەوە و پاسپۆرتەکەی گرت بە دەستەوە و خواحافیزی لە دایکی کردو دەستی و سەری ماچ کرد.. خواحافیزی لە خوشك و براکانی کرد.. فرمێسك بە ڕوومەتەکاندا دەهاتە خوارەوە و تێکەڵ بەیەکتر دەبوون.. خواحافیزی لە مەککەی پیرۆز و ﴿مسجد الحرام﴾ کرد.. سەفەری کرد و بێتاقەتی خەریك بوو دڵی دەپچڕاند. گەشتە فەرەنسە، وڵاتێك کە ڕانەهاتبوو پێی.. تاسا کاتێك ئافرەتانی دەبینی نیوە ڕووتن و بەبێ شەرم شەقامەکانیان تەنیوە.. هەستی بەبێ ئەرزشی ئافرەت کرد لە لایان، و بێ ڕێز کردنیان. بۆیە زۆر بەتاس و شەوقەوە بوو بۆ خاکی پیرۆز و پڕ لە ئیمان.. خاکی شەرم و حەیا.. دەستی کرد بە خوێندن.. کاتێ دەڕۆشتە هۆڵی وانە وتنەوە لەشەرم و حەیادا سەری لە نێو قاچەکانیدا بوو.. لە چەند مانگێکی کەمدا فێری زمانی فەرنسی بوو.. مانگەکانی بە سەختی تێدەپەڕاند.. کەوتە ناو تاون و گوناهەوە.. وازی لە نوێژ و خواپەرستی هێنا.. ساڵانێکی بە بێزاری بەسەر برد.. تەنانەت لەگەڵ کەسوکاریدا کە قسەی دەکرد.. ئەدەب و ڕۆحانیەت و ڕێزی تێدا نەبوو، کە ڕاهاتبوون پێی، خەریك بوو خوێندنەکەی تەواو دەبوو.. کاتی گەڕانەوە هاتە پێشەوە.. گەڕانەوە بۆ مەککە.. لە فڕۆکەخانەی ﴿جدە﴾ دابەزی.. بە پۆشاکێکەوە کەس و کاری ڕانەهاتبوون پێی، و دڵێك ڕەش کە هیچ چاکەیەکی نەدەزانی و خۆی لە هیچ خراپەیەك لانەدەدا.. بە ساردیەکی سەیرەوە باوەشی کرد بە دایکیدا... هاوکات لەگەڵ فرمێسکی دایکی و خۆشی خوشك و براکانی.. چونکە ئەو

له دۆڵێکه و ئەوانیش له دۆڵێکی ترن.. دوای گەڕانەوەی کەسێکی گۆشەگیر و بێتاقەت و دڵتەنگ بوو.. بە ئۆتۆمبێلەکەی بە تەنها دەچوویە دەرەوە و کەس نەیدەزانی بۆ کوێ دەچێت. کەسوکاری هەستیان پێ کرد کە هەرگیز ناچێ بۆ ﴿حەرەمی مەککە﴾ لەو ماوەیەدا کە گەڕابوویەوە.. و تێبینی ئەوەشیان کرد بوو کە نوێژەکانیشی ناکات.. بۆیە بە نەرم و نیانی پێیان ووت... ئەویش هەڵشاخا پیایاندا و ووتی: ﴿هەرکەسێ ئازادە لە هەڵسوکەوتی خۆی.. نوێژکردن بەزۆر نیە﴾ بەڵام دایکی فرمێسکەکانی دەشاردەوە لە خوشك و براکانی و لەویش و لە ژوورەکەی خۆیدا بە گۆشەگیری نوێژی دەکرد و دوعای بۆ دەکرد کە خوای گەورە ڕێنمایی بکات و دەگریا تا ئەو ئەندازەیەی لە پشت دەرگاکەوە گوێت لە گریانیەوە بوو!! ڕۆژێکیان.. دایکی ڕۆشت بۆلای.. و پێی ووت: هەستە و بە ئۆتۆمبێلەکەت بمگەیەنە..! ئەویش هیچ داواکاریەکی دایکی ڕەت نەدەکردەوە..! هەستا و کاتێ سواری ئۆتۆمبێلەکە بوون.. بە دایکی ووت: بۆ کوێ؟ دایکی ووتی: بۆ ﴿مسجد الحرام﴾ تا نوێژی عیشا لەوێ بکەم.. ویستی ڕۆژش بهێنێتەوە.. پاشان بردی بۆ ئەوێ.. کاتێ گەیشتن. بە زمانێکی زبر دایکی پێی ووت: تۆش دابەزە و نوێژ بکە.. ووتی: من لێرە چاوەڕوانیت دەکەم! دایکی ئازیزیش تکای لێ دەکرد و فرمێسکیش بە ڕوومەتیدا دەهاتە خوارەوە: ﴿کوڕی خۆم.. دابەزە لەگەڵم.. و یادی خوا بکە.. بەڵکو خوای گەورە هیدایەتت بدات و بتگەڕێنەتەوە سەر دینەکەت.. کوڕی خۆم.. چەند ساتێکی کەمە و پاداشتت بۆ دەنوسرێ﴾ بەڵام بێ سوود بوو، بە سەرسەختیەکی سەیرەوە سووووربوو لەسەر هەڵوێستی خۆی، دایکی دابەزی..و دەگریا.. ئەویش لە ئۆتۆمبێلەکەدا مایەوە.. شوشەی دەرگاکانی داخست، کاسێتێکی گۆرانی ﴿فەرەنسی﴾ خستە سەر.. دەنگەکەی هێواش کردەوە.. لای کردەوە بۆ دواوە گوێ بگرێت.. ووتی: دەنگێکی مەزن بەهۆشی هێنامەوە کە ئاسمانی مەککەی دەبڕی و شاخەکانیش بۆیان دەسەندەوە.. بەڵێ دەنگی خۆشی بانگ بوو.. بە دەنگی مامۆستا: عەلی مەلا.. ﴿الله اکبر.. الله اکبر.. اشهد ان لا إله إلا الله..﴾ ترس دایگرتم.. تەسجیلەکەم کوژاندەوە و ترسام...و گوێم لە بانگەکە گرت.. بەڕاستی دواهەمین کات کە گوێم لێوە بوو پێش چەند ساڵێك بوو.. بەخوا بەبێ ویست و ئیرادەی خۆم فرمێسك بە ڕوومەتمدا هاتە خوار... بە کوڵ دەستم کرد بە گریان.. سەرنجی هەموو ئەوانەم ڕاکێشابوو کە بە پاڵمدا بەرەو ﴿حەرەم﴾ دەچوون، لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیم، بە خێرایی ڕۆشتم بەرەو تەوالێت.. پۆشاکەکانم داکەند و خۆم شۆرد.. ڕۆشتمە ناو ﴿حەرەم﴾ەوە دوای دووری

حەوت ساڵ لێی! کاتێ کەعبەم بینی کەوتم بە ئەژنۆمدا لەتاو کاریگەری ئەو دیمەنە.. و لە مەزنی ئەو خەڵکە زۆرە ملکەچە کە ﴿مسجد الحرام﴾ یان پڕ کردبوو.. وە لە ترسناکی ئەو هەڵوێستە.. گەشتم بە ئیمامدا و نوێژم دابەست، بەگریانەکەم خەڵکانی دەورووبەرم بێزارکرد.. دوای نوێژ.. لاوێك لە تەنیشتمەوە خوای دەهێنایەوە یادم و هێوری دەکردمەوە کە بێگومان خوای گەورە لەهەموو گوناهەکان خۆش دەبێت و لەو کەسەش خۆش دەبێت کە تەوبە دەکات... سوپاسم کرد و بە دەنگێکی خنکاوەوە دوعام بۆ کرد... لە حەرەم هاتمە دەرەوە و پێکانم بە ئەستەم منیان هەڵگرتبوو.. گەڕامەوە بۆ لای ئۆتۆمبیلەکەم، دایکی ئازیزم بینی، چاوەڕوانی منی دەکرد و بەرماڵەکەشی لە تەنیشتیەوە بوو.. باوەشم کرد بە پێکانیداو ماچم کرد و دەگریام.. ئەویش دەگریاو بە دەستە بەسۆزەکانی بە ئەسپایی دەستی دەهێنا بەسەرمدا... دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و گوێم لێیەوە بوو دەیوت: ﴿پەروەردگارا.. سوپاس بۆ تۆ. پەروەردگارا.. سوپاس بۆ تۆ.. پەروەردگارا.. بێئومێدت نەکردم لە نزاو پارانەوەکانم و لە دوعا کردنەکانم.. سوپاس بۆ خوا.. سوپاس بۆ خوا..﴾ دەرگاکەم بۆ کردەوە و سواری ئۆتۆمبێلەکەم کرد و گەڕاینەوە بۆ ماڵ.. بەهۆی گریانی زۆرەوە نەمدەتوانی قسەی لەگەڵدا بکەم..بەڵام گوێم لێیەوە بوو دەیوت: ئەی کوڕم... بەخوا تەنها لەبەرئەوە هاتم بۆ حەرەم هەتا دوعات بۆ بکەم، ئەی کوڕم.. بەخوا هیچ شەوێك نەبوو دوعات بۆ نەکەم! من کە دایکتم وازم لە نوێژکردن نەهێناوە تا دوعام بۆ نەکردبێت کە خوای گەورە سەرکەوتوت بکات لە ژیانتداو ڕەحمت پێ بکات.. تەماشایەکیم کرد و هەوڵمدا وەڵامی بدەمەوە، بەڵام نەمتوانی و ئۆتۆمبێلەکەم لە قەراغ ڕێگاکەدا وەستاند.. دەستم خستە سەر ڕوخسارم و بەدەنگی بەرز دەستم کرد بە گریان، ئەویش هێوری دەکردمەوە و دڵخۆشی دەدامەوە.. هەتا هەستم کرد کە هەرچی خەم و ناڕەحەتی هەیە لەدڵمدا دەرمکرد.. دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ ماڵەوە هەرچی کتێب و گۆڤار و دیاری و وێنەی بێ کەڵك هەیە سوتاندم.. و هەموو ئەو شتانەم لەناو برد کە ئەو ڕۆژە ڕەشانەی دەهێنایەوە یادم.. خوای گەورە یارمەتی دام و گەنجێکی دڵسۆزی خوا پەرستی بۆ ناردم و بوو بە هاودەمم، لەگەڵمدا بوو هەتا سی جزء قورئانم لەبەرکرد لە ماوەیەکی کەمدا، شەو و ڕۆژ لەگەڵمدا بوو.. ئەو شتەی کە زۆر منی هۆگری ئەو کردبوو ئەدەب و ڕەوشتە مەزنەکەی بوو.. خوای گەورە پاداشتی بداتەوە.. خوایە گیان لێم وەرگرە کە تەوبەم کردووە و گەڕاومەتەوە بۆلات و لە کتێبەکەتدا فەرمووتە ﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ

سَلَفَ﴾الأنفال/٣٨..واته: { بڵێ بە کافرەکان : ئەگەر واز لە کوفر بهێنن و مسوڵمان بن و پەیڕەویی پێغەمبەرﷺ بکەن ئەوا خودا لە هەموو گوناهی لەوەو پێشیان ئەبووریْ}.
خوایەگیان تەواو وازم لە گوناه هێنا و لەگوناهەکانی ڕابردووم خۆش ببە.. و ووتم {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ} ﴿الزمر : ٥٣﴾. واتة: { تۆ، ئەی موحەممەد! بڵێ بەو بەندانەم کە زیادەڕۆییان کردووە لەسەر نەفسی خۆیان لە گوناه کردن و بێ فەرمانیی خوادا: نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، خوا لە هەموو گوناهێ خۆش ئەبێ بۆ هەرکەسێ کە باوەڕی هەبێ کە خوا گوناه بەخش و میهرەبانە }.
وە من ئەی پەروەردگارم بەڕاستی گوناهی زۆر زۆرم بەسەر خۆمدا هێنا... و کەس لە گوناه خۆش نابێ بێجگە لە تۆ، دەی تۆش پەروەردگار بە لێبوردەیی خۆت لێم ببورە و ڕەحمم پێ بکە، بەڕاستی تۆ لێبوردە و میهرەبانیت.. لە عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە گوێی لە پێغەمبەرەوە بوو (د.خ) فەرموی: ﴿إن قلوب بني ادم كلها بين اصبعين، من أصابع الرحمان كقلب واحد، يصرفه حيث يشاء﴾.. واتە: ﴿﴾..... وە لە دوعاکانی پێغەمبەر –ص– بریتی بوو لە: ﴿ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ﴾ رواه الترمذي، و قال حديث حسن.. واتە: { ئەی گۆڕەری دڵەکان دڵم جێگیرکە لەسەر ئاینەکەت﴾.. (ئامین)...

## ٥٣- ﴿چیرۆکێکی زۆر کاریگەر و گریاناوی﴾

یەکێ لە بانگخوازان ووتی، هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە و ووتی: ڕۆشتم بۆ یەکێ لە وڵاتە عەرەبیەکان بۆ کارێك کە یەك ڕۆژی خایاند و دوای ئەوەی لە کارەکەم بوومەوە گەڕامەوە بۆ فرۆکەخانەوە و خۆم ئامادەکردبوو زۆر شەکەت و ماندوو بووم کە نەمتوانی بوو بخەوم، بێجگە لە خەوەنوچکە.. بەلای ڕاست و چەپدا سەیرم کرد و بۆ مزگەوتێك گەڕام کە نوێژی تێدا بکەم.. لە فرۆکەخانە شوێنێکم بینی بۆ نوێژکردن دروست کرا بوو.. ڕۆشتم بۆ ئەوێ و خەوێکی قوڵم کرد.. پێش نیوەڕۆ خەبەرم بوویەوە بە گریانی لاوێك کە نوێژی دەکرد و بە کوڵ دەگریا.. ووتی: خەوتمەوە، چونکە زۆر شەکەت و ماندوو بووم.. پاشان ئەو لاوە نزیك بوویەوە لێم و هەڵی ساندم بۆ نوێژ، پاشان ووتی: ئایا دەتوانیت بخەویت؟ منیش ووتم: بەڵێ، لاوەکەش ووتی: بەڵام من ناتوانم بخەوم، و ناتوانم چێژ لە خەو ببینم.. ووتم پێی: با نوێژەکەمان بکەین و پاش نوێژ کردن، پشت بەخوا خوای گەورە کۆمەکمان دەبێت.. پاشان دوای نوێژ کردنەکە ڕۆشتم بۆلای، ووتم: بەسەرهاتی تۆ چیە؟ لاوەکە ووتی: من خەڵکی شاری ﴿ریاض﴾م و لە خێزانێکی دەوڵەمەندم، هەرشتێ بمانەوێ ئامادەیە بۆمان لە پارە و پۆشاك و ئۆتۆمبێل.. بەڵام بێزاربووم لە ڕۆتین و ژیان.. بۆیە ویستم سەفەر بکەم بۆ دەرەوەی وڵات، پاشان تەماشام کرد ئایا سەفەر بکەم بۆ وڵاتێ کە خەڵکی سەفەر دەکەن بۆی، بۆیە لە نێو چەندین وڵاتدا، ئەم وڵاتەم هەڵبژارد کە ئێستە من و تۆ لە فرۆکەخانەکەیداین، هەتا کەس نەمناسێت.. و بیرم لە فاحیشەکاری نەکردۆتەوە بەڵام حەزم لە یاری و کات فەوتاندن و گەڕان بوو.. کاتێ ئەو گەنجە بەهۆی هاوڕێی خراپەوە سنورەکانی بەزاند.. بۆیە بەردەوام لەم خراپە دەیان بردە سەر ئەو خراپەکاری، و لە بێهودەییەوە بۆ بێهودەییەکی تر، هەتا هەنگاوی پێ دەنێن بەرەو زینا لەگەڵ کەنیزە و ئافرەتانی خراپەکار و بەدرەوشتدا.. لەگەڵیدا بوون هەتا لەگەڵ یەکێ لە ئافرەتەکاندا تێکەڵ دەبێت و ئەو کارە دەکات.. کاتێ کارەکە ئەنجام دەدات و هەرچی حەزی خۆیەتی فڕێی دەدات، دەست دەکات بە گریان و هاوار دەکات: بۆ یەکەمجار زینام کرد.. چۆن بەمە ئەو دنیام لەدەستدا و ئەو فاحیشەیەم ئەنجامدا... بەڕاستی من بێ بەش دەبم لە ﴿حۆری﴾یەکانی بەهەشت.. بۆیە توشی حاڵەتێکی سەیر و نائاسایی دەبێت و لە دەرگا بەگریانەوە دەڕواتە دەرەوە.. لە دەرەوە کەسێکی خراپەکار پێی دەگات و پێی دەڵێ: ئەوە چیتە بۆ دەگریت؟ لاوەکەش ووتی: چۆن ناگریم زینام کرد.. ئەویش پێی ووت: کارەکە زۆر ئاسانە، پێکێك عارەق بخۆ و هەموو

شتێکت لەبیر دەچێتەوە. لاوەکەش ووتی: ئایا بەس نیە کەمن زینام کردووە، دەتەوێ بێبەشم بکەی لە عارەقی بەهەشت.. ئەویش ووتی: بەڕاستی خوای گەورە لێبووردە و میهرەبانە ئەو کەسە بێهودە بیری چوو بوو کە خوای گەورە سزادەرێکی توندە. ئاگری بڵێسەداری داناوە بۆ تاوانباران.... پاشان لاوەکە لە سەختی تاوانەکەیدا بە کوڵ گریا.. بە هاوڕێکەی ووت لە فرۆکەخانە: خۆزگە پارەکەمیان ببردایە.. بەرەو زیناکردن بردمیان.. فەسادیان کردم و دین و ئیمانیان شکاند.. هاوڕێکەمان ووتی: ئێستا ئایەتێکی پیرۆزی پەروەردگارت بەسەردا دەخوێنمەوە.. گوێی لێ بگرە.. خوای گەورە دەفەرموێ: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ} ﴿الزمر : ٥٣﴾. واتە: { تۆ، ئەی موحەممەد! بڵێ بەو بەندانەم کە زیادەڕۆییان کردووە لەسەر نەفسی خۆیان لە گوناه کردن و بێ فەرمانیی خوادا: نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، خوا لە هەموو گوناهێ خۆش ئەبێ بۆ هەرکەسێ کە باوەڕی هەبێ کە خوا گوناه بەخش و میهرەبانە }.

ئەو تۆبەکارە کە لێ خۆش بوون لێی ئەستەم بوو بەلایەوە ووتی: خوای گەورە لە هەمووکەس خۆش دەبێ بێجگە لە من.. ئایا نازانیت من زینام کرد.. پاشان لاوەکە لە هاوڕێکەی پرسی: ئایا زینات کردووە؟ ووتی: نە بەخوا، هەرگیز.. ووتی: کە واتە تۆ گەرمایی و بڵێسەی ئەو تاوانە نازانیت کە منی تێدام.. ووتی: چەند ساتێکی نەخایاند بە بڵندگۆ ئاگاداریان کردین کە کاتی گەشتی ئێمە تەواو بووە کە لەگەڵیدا پشت بەخوا گەڕابوومەوە بۆ ﴿ریاض﴾ منیش ناونیشانم وەرگرت و پاشان خواحافیزیم لێ کرد و ڕۆشتم.. و دڵنیابوو پەشیمانیەکەی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژە و پاشان لەبیری دەچێتەوە کە چی کردووە... دوای چەند ڕۆژێ لە گەڕانەوەم پەیوەندی پێوە کردم.. منیش مەوعیدم بۆ داناو پاشان یەکترمان بینی، هەر کە منی بینی دایە پرمەی گریان و دەیوت: بەخوا لەو ساتەوەی لەتۆ جیابوومەتەوە و ئەو کارە قیزەوەنەم کردووە لەزەتم لە خەو نەبینیوە، تەنها خەوەنوچکە نەبێت، چی بڵێم لەبەردەم خوادا، ڕۆژێ کە لێم دەپرسێ و دەفەرموێ: بەندەکەم زینات کرد؟ دەڵێم: بەڵێ، زینام کرد و بەم قاچانەی خۆم ڕۆشتم بۆ زیناکردن، منیش ووتم: ئارامبەرەوە، بەڕاستی بەزەیی خوای گەورە فراوانە ﴿إِنَّ رَحْمَةَ اللهِ وَاسِعَةٌ﴾ ئەو لاوە بە هاوڕێکەمانی ووت: من نەهاتوم بۆ سەردانی تۆ.. بەڵکو هاتوم خواحافیزیت لێ بکەم و

بەو ئومێدەی لە بەهەشتا بتبینمەوە، ئەگەر بێت بە نسیبی من و تۆ.. ووتم: بۆ کوێ دەچیت؟ ووتی: خۆم دەدەم بەدەست دادگاوە و دان دەنێم بە تاوانەکەمدا هەتا سزای خۆم وەربگرم.. ووتم: ئەوە تۆ شێت بوویت، ئایا بیرت چوو کە تۆ هاوسەرداریت.. ئایا لەبیرت چووە کە سزای زیناکردن دیاریکراوە و بریتیە لە ڕەجم کردن بە بەرد هەتا مردن. ووتی: ئەوە ئاسان و هێورترە بۆ من تا بە زیناکەری بمێنمەوە و بە زیناکار بچمە بەردەم خواو بەو سزادانە پاك نەبووبمەوە، ووتم: ئایا لەخوا ناترسیت.. تاوانەکەت بشارەوە لە خۆت و خێزانت و کۆمەڵگاکەت.. لاوەکە ووتی: هەموو ئەوانە ناتوانن من ڕزگار بکەن لە ئاگر، من دەمەوێت ڕزگارم بێت لە سزای خوا.. هاوڕێکەمان ووتی: گرتم و پێم ووت: من یەك شتم لەتۆ دەوێ، تۆبەکارەکە ووتی: هەموو شتێ داواکە، بەڵام داوام لێ مەکە کە نەچم بۆ دادگا.. ووتی: من شتی ترم لە تۆ دەوێ. لاوەکە ووتی: مادام وایە، من ڕازیم.. ووتی: دەستت درێژکە و پەیمانم بەرێ کە ئارام بگریت و ئەوە بکەیت کە من دەیڵێم. لاوەکە ووتی: باشە، پەیمانت دەدەمێ. پێم ووت: دەتبەم بۆ لای گەورەترین و بە تەقواترین مامۆستا هەتا سەبارەت بەو کارەی تۆ پرسیاری لێ بکەین، ئەگەر ووتی: خۆت بدە بەدەستەوە ئەوە من خۆم دەتبەم بۆ دادگا، و ئەگەر ووتی: نەخێر، ئەوە دەبێ تۆش بەگوێی بکەیت. ووتی: باشە. لە مامۆستامان پرسی ووتی: نابێ خۆی بدات بەدەستەوە. بەڵام ئەو لاوە هێور نەدەبوویەوە و بەڵکو بەردەوام پەیوەندی دەکرد بە مامۆستاکەوە تا ڕازی بکات کە خۆی بدات بە دەستەوە و هەر موناقەشەی دەکرد و سووربوو لەسەر نیازەکەی خۆی. منیش کاتێك بینیم پێم ووت: بۆچی مامۆستات بێزار کردووە، بەو هەموو پەیوەندی کردنە، من مۆڵەتم پێ دایت یەکجار پەیوەندی پێوە بکەیت.. ووتی: هەوڵ دەدەم ڕازی بکەم، بەڵکو فەرمانم پێ بکات و ڕازی بێت کە خۆم بدەم بەدەست دادگاوە. لاوەکە بە مامۆستای ووتبوو: مامۆستاگیان لەخوا بترسە، بەخوا من لەڕۆژی قیامەتدا خۆم هەڵدەواسم بە گەردنی تۆدا و دەڵێم خوایەگیان من دەمەویست خۆم بدەم بەدەستەوە تا سزای خۆم وەرگرم لە دنیادا و بەڵام ئەم مامۆستا بەڕێزە نەیهێشت.. مامۆستاکەش ووتی: خوای گەورە دەستوری وا داوە و منیش لە زانیاری و زانستەوە فتوام بۆ داویت پاشان لاوە تۆبەکارەکە بە هاوڕێکەمان دەڵێ: من خوا حافیزیت لێ دەکەم..

ووتی: بۆ کوێ؟ ووتی: دەمەوێ حەج ئەنجام بدەم.. کاتی حەجکردن نزیك بوو بوویەوە، هاورێکەمان داوای لە لاوەکە کرد کە پێکەوە و لە گەڵ براکانی تریدا حەج بکەن.. ئەویش ووتی: نەخێر.. هاورێکەمان وا گومانی بردبوو کە لەگەڵ هاورێی خۆیدا حەج دەکات. ووتی: کاتێ حەجمان کرد و گەراینەوە بۆ –ریاض– بینیم و لێم پرسی، ووتی: من بەتەنها حەجم کرد، و بە تەنها مەشاعیرەکانم ئەنجام دەدا و بەپێ بەڵکو خوای گەورە تەماشام بکات کاتێ کە دەرۆم بۆ ﴿عەرەفە﴾ یان کاتێ دەرۆم بۆ ﴿موزدەلیفە﴾ یان کە دەرۆم بۆ رەجمی شەیتان، بەڵکو خوای گەورە تەماشام بکات و رەحمم پێ بکات.. ئەو تۆبەکارە لەکاتی حەجەکەیدا دەهات بە خەیاڵیدا و دەیوت: دەترسم خوای گەورە لەوانەی دەوروبەریشم خۆش نەبێت بەهۆی سەختی تاوانەکەمەوە، و یان دەیوت: بەڵکو خوای گەورە بەهۆی ئەم کۆمەڵە موبارەکەوە لەمنیش خۆش ببێت.. هاورێکەمان ووتی: پەیوەندی و هاتوچۆی نێوانمان بەردەوام بوو... دوای حەج کردنەکە کە ئەو لاوە هەموو قورئانی لەبەر کرد، رۆژی نا رۆژێك بەرۆژ و دەبوو.. هاورێکەمان ووتی: یەکێ لە زانایانم بینی و هەواڵی بەسەرهاتی ئەو تۆبەکارەم پێدا، کە چەندە شکاوەتەوە لە بەردەم خوادا و تەوبەی کردووەو شەو و رۆژ دەگرێ و شەونوێژ دەکات و قورئانی پیرۆزی لەبەرە.. زاناکە ووتی: لەوانەیە ئەو زینایەی هۆکار بوو بێت بۆ چونە بەهەشت، و لەوانەیە هەندێ ئایەت دەقاو دەق باس لەو بکات.. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا(٦٨)يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا(٦٩)إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا(٧٠)﴾الفرقان.. واتە: ﴿هەروەها ئەوانە لەگەڵ خوادا هاوار ناکەنە خوایەکی ترو خوای تر ناپەرستن و گیانی ئادەمیزاد ناکێشن کە خوا حەرامی کردووە گیانی بکێشرێ و بکوژرێ، مەگەر بە حەق وەك ئەوە کەیەکێکی کوشتبێ و داوێن پیسی ناکەن و هەرکەس ئەوانە بکا تووشی گوناه و تاوان ئەبێ(٦٨)سزای لە رۆژی قیامەتدا بۆ دووقات ئەکرێ و هەمیشە بەسووکی لە دۆزەخدا ئەمێنێتەوە(٦٩)مەگەر یەکێ کە تۆبەی کردبێ لە کافری و باوەری بەخوا هەبێ و ئیشی چاکەی کردبێ، ئەو جۆرە کەسانە هەرچی کاری خراپیان لەوەوپێش کردووە خوا بۆیان ئەگۆرێ بە چاکەو

**خوا گوناهبەخش و بەڕەحم و میهرەبانە(٧٠)﴾.**

**کاتێ گوێم لەو ئایەتەوە بوو سەرسام بووم و ووتم: چۆن من بێئاگا بووم لەو ئایەتە.. بۆیە خێرا ڕۆشتم بۆ ماڵی کوڕەکەی هاوڕێم کە لەماڵی باوکی بوو کە وەك کۆشك وابوو.. ڕۆشتم بۆ لای تا مژدەی بەمێ.. کەس و کارەکەی ووتیان: لە مزگەوتە.. منیش ڕۆشتم بۆ مزگەوت.. بینیم بە ملکەچی دانیشتوە و قورئان دەخوێنێتەوە.. دوای سڵاوکردن پێم ووت: مژدەم پێیە بۆ تۆ.. ووتی: چیە، منیش ئەم ئایەتەم بۆ خوێندەوە** ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ..﴾... **کاتێ گەشتمە ئەو وشەیە وەك ئەوە وا بوو کە خەنجەرێك بکەم بەدڵیدا، پاشان بەردەوام بووم** ﴿....وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا(٦٨)يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا(٦٩)إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا(٧٠)﴾.. **کاتێ ئایەتەکەم تەواو کرد بازیدا و باوەشی پیادا کردم و سەری ماچ کردم و ووتی: بەخوا من هەموو قورئانم لەبەرە و بەڵام ئەڵێی یەکەم جارە دەیبیستم.. پاشان بانگبێژ بانگی داو ئێمەش چاوەڕوانی هەستانەوەمان کرد بۆ نوێژ و ئەو ڕۆژە ئیمام لەوێ نەبوو، بانگبێژ هەستایەوە و هاوڕێی تەوبەکاریشمان بوو بە ئیمام. کاتێ نوێژی دابەست و فاتیحەی خوێند پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:** ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ...﴾**کاتێ گەشتە** ﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ﴾ **نەیتوانی تەواوی بکات.. چوو بەڕکوعدا و پاشان ڕاست بوویەوە و پاشان سوجدەی برد و پاشان ڕاست بوویەوە و پاشان سوجدەی بردەوە و پاشان هەستایەوە، لە ڕکاتی دووەمدا فاتیحەی خوێند و پاشان ویستی ئایەتەکە تەواو بکات کاتێ گەشتە** ﴿مَنْ تَابَ وَآمَنَ﴾ **نەیتوانی تەواوی بکات و چوو بە ڕکوعدا و نوێژەکەی بە گریانەوە تەواو کرد.. هاوڕێکەمان ووتی: بەو شێوەیە ماوەیەك تێپەڕی، تا ڕۆژێکیان کە ڕۆژی هەینی بوو، دوای نوێژی عیشا.. پیاوێك پەیوەندی پێوەکردم ووتی: من باوکی ئەحمەدم، کە هاوڕێی تۆیە.. کارێکی گرنگم پێتە، دەمەوێ بەخێرایی بێیت بۆلام. منیش بەخێرایی ڕۆشتم و لەڕاستیدا ترسام، کاتێ گەشتمە بەردەرگای کۆشکەکەی، باوکی لە بەردەرگادا وەستا بوو، پێم ووت: چی بووە؟ ووتی: ئەحمەدی هاوڕێت، داوات لێ دەکات لێی ببوریت و خواحافیزیت لێ دەکات بەرەو ڕۆژی دوایی، ئەمڕۆ دوای خۆر**

ئاوابوون سەفەری کرد و وەفاتی کرد.. پاشان باوکی دەستی کرد بە گریان..
هاوڕێکەمان هەر ناوی ئەحمەدە ووتی: من دڵخۆشیم دایەوە و دڵخۆشی خۆمم دایەوە کە ئەو ئازیزەم لەدەست چوو.. پاشان بردمی بۆ ژوورێك کە لاوەکەی تێدا بوو، کە داپۆشرا بوو، منیش ڕوخساریم دەرخست و تەماشام کرد نورێکە و دەدرەوشێتەوە..
تەماشای ڕوخسارێکم کرد کە گیانی تیانەمابوو.. بەڵام ڕووناکترو گەشاوەتر و درەوشاوەتر لەپێش مردنی.. ڕوخساری هەموی نوور بوو.. ڕوخسارێك کە دڵخۆشکەر بوو.. باوکی پێی ووتم: کوڕەکەم چی کردووە؟ لەوەتەی لەسەفەر گەڕاوەتەوە، ئەو بەوشێوەیە بووە؟ منیش ووتم: کوڕەکەت لەو کاتەوەی سەفەری کردووە ئازیزێکی لەو سەفەرەدا لەدەست داوە.. بەڵێ بەخوا... لەوساتەدا ئیمانێکی مەزنی لەدەست داوە..
(لەدەستی داوە لەساتی زیناکردندا) ئەی چی لەوە ئازیزترە بەلای مرۆڤەوە، ژنی ئەو تۆبەکارەش دەیوت: نوستنی تەنها خەوەنوچکە بوو، دوای گەڕانەوەی لەو سەفەرە خەوی لێ نەکەوتووە.. ئەوان ڕاستی بەسەرهاتەکەیان نەدەزانی.. هاوڕێکەمان ووتی:
سەبارەت بە وەفاتکردنی لەباوکیم پرسی؟ ئەویش ووتی: کاك ئەحمەد، کوڕەکەم وەك دەزانیت ڕۆژی ناڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو، ئەمڕۆ ڕۆژی هەینی، عەسر لەمزگەوت مایەوە بەدوای سەعاتی لێبوردندا دەگەڕا، و پێش مەغریب ڕۆشتم بۆلای و پێم ووت:
ئەحمەد گیان، وەرەوە و لەماڵەوە بەربانگ بکەرەوە.. کوڕی تۆبەکاریش ووتی: باوکە گیان هەست بە ئاسودەیی دەکەم، ئێستە وازم لێ بێنە.. شتێکم بۆ بنێرن بۆ مزگەوت تا بەربانگی پێ بکەمەوە، باوکیشی ووتی: چۆنت پێ باشە وابکە.. دوای نوێژ باوکی بە کوڕەکەی ووت: کوڕی خۆم وەرەوە بۆ ماڵەوە و نانی ئێوارە بخۆ.. کوڕەکەش ووتی: من ئێستا هەست بە حەوانەوەیەکی مەزن دەکەم و دەمەوێ لە مزگەت بمێنمەوە، دوای نوێژی عیشا دەگەڕێمەوە بۆلات.. باوکیشی ووتی: ئارەزووی خۆتە.
کاتێ باوکی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە هەست بەشتێك دەکات کە خوانەخواستە شتێ ڕوونەدات.. بۆیە باوکی دەڵێ: کوڕە بچوکەکەمم نارد و پێم ووت: بڕۆ بۆ مزگەوت و تەماشای براکەت بکە بزانە چی دەکات؟ کوڕەکە دەڕوات و پاشان بە هاوارەوە یەتەوە و دەڵێ: باوکە.. باوکە.. ئەحمەدی برام قسەم لەگەڵ ناکات.. باوکیشی دەڵێ: منیش بەخێرایی ڕۆشتم بۆ مزگەوت.. تەماشام کرد ئەحمەدی کوڕم ڕاکشاوە و لە

سەرەمەرگدایە.. لەسەر پاڵپشتیێ سەری نابوویەوە، و لە خەڵوەتی خۆیدا بوو لەگەڵ پەروەردگاریدا قورئانی دەخوێند و ئیستیغفاری دەکرد.. باوکی ووتی: منیش ژوور سەرەکەیم لابرد کە پاڵی پێوە دابوو، گرتم بە ئامێزی خۆمەوە.. تەماشام کرد، بینیم ناوی ئەحمەدی هاوڕێی دەبات کە بەسەرهاتی خۆیی بۆ باسکردبوو، وەك ئەوەی دەیەوێ پەیامێکی بۆ بنێرێ، پاشان ئەو تۆبەکارە لەساتی سەرەمەرگدا خەندەیە هاتە سەر ڕوخساری، باوکی دەڵێ: بەخوا لەو ڕۆژەوەی لەسەفەرەکەی گەڕاوەتەوە خەندەی وا نەهاتوەتە سەر ڕوخساری، پاشان لەو ساتەدا کە لەساتی گیانداندا بوو ساتی سەرەمەرگ.. ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُون وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا(٦٨)يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا(٦٩)إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾الفرقان/٦٨–٧٠.. ووتی: کاتیێ گەشتە ئەو وشەیە گیانی سپارد بە پەروەردگاری.. ئەو پەروەردگارەی کە سپاردە زایە ناکات..

وەرگیراوە لە کتێبی ﴿التائبون إلى الله﴾ بەدەستکاریەوە..

## ٥٤- ﴿موسڵمان بوونی قەشە (سیلی)﴾

با هاوڕێ بین و پێکەوە بڕۆین بەرەو ﴿جوهان سبرگ﴾ شاری کانی دەوڵەمەند بە ئاڵتون لە وڵاتانی باشوری ئەفریقیا.. من لەوێ بەڕێوەبەری نوسینگەی رابیتەی جیهانی ئیسلامی بووم.. ئەم ڕووداوە ساڵی ١٩٩٦ بوو، لە وەرزی زستاندا بووین، کە بەسەختی لەو وڵاتانەدا گوزەراندمان.. ڕۆژێکیان کە ئاسمان بە هەور تەنرابوو کە ئاگاداری دەکردینەوە لە گەردەلولێکی زستاناوی سەخت، لە کاتێکدا من چاوەڕوانی کەسێك بووم کە مەوعیدێکم بۆ دانابوو بۆ بینینی، خێزانیشم لەماڵەوە بوو خواردنی نیوەڕۆی ئامادە دەکرد.. ئەو کەسەش دەبوو بە میوانێکی بەڕێز لە ماڵمان. مەوعیدەکە لەگەڵ کەسایەتیەکدا بوو کە خزمایەتی هەبوو لەگەڵ سەرۆکی پێشووی باشوری ئەفریقیا ﴿نلسۆن ماندێلا﴾، کەسایەتیەك گرنگی دەدا بە مەسیحیەت و بانگەشەی بۆ دەکرد.. ئەو کەسایەتیەش قەشە ﴿سیلی﴾ بوو.. چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ ﴿سیلی﴾ بەهۆی سکرتێری نوسینگەی رابیتەوە ﴿عبدالخالق میتر﴾ بوو، کە هەواڵی پێدام، کە قەشەیەك دەیەوێ ئامادەبێت لە بنکەی رابیتە بۆ کارێکی گرنگ.. لە کاتی دیاریکراودا ﴿سیلی﴾ ئامادەبوو بە هاوڕێیەتی کەسێك کە ناوی ﴿سولەیمان﴾ بوو.. یاریزانی مشتەکۆڵە بوو.. وە ئەندام بوو لە رابیتەی مشتەکۆڵە دوای ئەوەی خوای گەورە ڕێزی لێ نابوو بە موسڵمان بوون دوای جەولەیەك کە یاریزانی موسڵمانی مشتە کۆڵە (محمد علی کلای) پێی هەستابوو.. لە نوسینگەکەم بینیمن و زۆر دڵخۆش بووم بە بینینیان.. ﴿سیلی﴾ کورتە بالایەك بوو، زۆر ڕەش پێست بوو، هەمیشە دەم بەخەندە بوو.. لەبەردەممدا دانیشت و زۆر بەڕێزەوە قسەی لەگەڵ دەکردم.. پێم ووت: برام.. سیلی.. ئایا دەتوانیت گوێ لە بەسەرهاتی چۆنیەتی موسڵمان بوونت بگرین؟ سیلیش خەندەیەکی کرد و ووتی: بەڵێ زۆر بە دڵنیاییەوە.. برا و خوشکانی بەڕێز ئێوەش گوێ بگرن و تەرکیز بخەنە سەر قسەکانی و پاشان خۆتان حوکم بدەن..

سیلی ووتی: من قەشەیەکی زۆر چالاك بووم.. زۆر بە لێبڕاوانەوە و بە چالاکانە خزمەتی کەنیسەم دەکرد، بەوە وازم نەدەهێنا، لەو کەڵە پیاوانە بووم کە خەڵکیان لە باشوری ئەفریقیا دەکرد بە مەسیحی.. بەهۆی چالاکی زۆرمەوە سەنتەری ڤاتیکان منی هەڵبژارد تا هەستم بە کاری بە مەسیحی کردن، بەهۆی کۆمەکی لەوانەوە، بۆیە

بۆ ئەو مەبەستە لە ڤاتیکانەوە پارەم بۆ دەهات.. منیش هەموو هۆکارێکم بەکار دەهێنا تا بگەم بە ئامانجی خۆم.. هەڵدەستام بەسەردانی بەردەوام و زۆر.. بۆ پەیمانگاکان و قوتابخانەکان و نەخۆشخانەکان و گوند و دارستانەکان.. ئەو پارانەم دەدا بە خەڵکیی لە شێوازی یارمەتیدان یان دیاری یان بەخشین یان خەڵات.. تا بگەم بە مەبەست و مەرامی خۆم و خەڵکی بێنمە سەر ئاینی مەسیحی.. کەنیسە چاوی تیٚ بریبووم.. دەوڵەمەند بوو بووم.. خانوو و ئۆتۆمبیل و موچەی باشم هەبوو.. لەگەڵ پلەو پایەیەکی باش لەناو قەشەکانی تردا.. ڕۆژێکیان ڕۆشتم تا هەندێ دیاری بکڕم لە سەنتەری بازرگانی شارەکەمان، کەچی لەوێ موفاجەئات ڕوویدا!! لە بازاڕ پیاوێکم بینی کە کڵاوێکی لەسەردا بوو، بازرگان بوو شتی دیاری دەفرۆشت، منیش پۆشاکی درێژی قەشەییم لەبەردا بوو، کە یەخەیەکی سپی هەیە کە جیامان دەکاتەوە لە خەڵکانی تر.. دەستم کرد بە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو پیاوەدا لەسەر نرخی دیاریەکان.. زانیم کە موسڵمانە، ئێمە لە باشوری ئەفریقیا بە ئاینی ئیسلاممان دەوت: ئاینی هیندیەکان.. نەمان دەوت ئاینی ئیسلام.. دوای ئەوەی چیم ویست لە دیاری کڕیم، بەڵکو بڵێ تەڵە و داو تا خەڵکانی نەشارەزا راکێشین بۆ خۆمان، و هەروەها ئەوانەی کە لە ڕووی دینی و ڕۆحیەوە دواکەوتوون، و هەروەها ئێمە حاڵەتەکانی هەژاریی زۆرێك لە موسڵمانانمان دەقۆزتەوە.. لەگەڵ دانیشتوانی باشوری ئەفریقیا تا بیانهێنینە سەر ئاینی مەسیحی.

بازرگانە موسڵمانەکە لێی پرسیم: تۆ قەشەیت.. ئایا وانیە؟

ووتم: بەڵێ.

لێی پرسیم: خوای تۆ کێیە؟

ووتم: مەسیح خوایە.

ووتی پێم: من تەحەدای تۆ دەکەم کە لە ئینجیلدا یەك ئایەت بێنیت کە لەسەر زاری مەسیح -علیه السلام- خۆی بەڵی: ﴿من خوام، یان من کوڕی خوام﴾ و ئێوە بم پەرستن بەڕاستی ووتەکانی ئەو پیاوە موسڵمانە وەك گەردەلول دای بەسەرمدا، نەمتوانی وەڵامی بەمەوە، ویستم بەو زیرەکیە باشەی خۆمەوە بگەڕێمەوە بۆ کتێبەکانی ئینجیل و نەصرانیەت، تا وەڵامێکی باشم دەست بکەوێت، کەچی دەستم

نەکەوت!! یەك ئایەت نیە لەسەر زمانی مەسیح هاتبێت و بڵێ: ﴿من خوام، یان من کوڕی خوام﴾. پیاوەکە تەواو نیحراجی کردم و سەرم شۆڕ کرد.. غەم دایگرتم و دڵم تەنگ بوو.. چۆن من بێئاگا بووم لەو جۆرە پرسیارانە؟ پیاوەکەم جێهێشت و سەرم شۆڕ کرد.. کاتێکم زانی ماوەیەکی زۆرم بڕیوە و بە ئاراستەیەکی نادیاردا دەڕۆم.. پاشان بڕیارمدا دەست بکەم بە گەڕان بەدوای ئەو ئایەتانەدا، بەڵام شکستم هێنا و نەمتوانی! ڕۆشتم بۆ ئەنجومەنی کەنیسە و داوامکرد ئەندامەکانی کۆبکەنەوە.. ئەوانیش ڕازی بوون.. لە کۆبوونەوەکەدا چیم بیستبوو پێم وتن، هەموویان هێرشیان کردە سەرم و دەیانوت پێم: ئەو هیندیە فێڵی لە تۆ کردووە.. ئەو ویستویەتی بە ئاینی هیندیەکان سەرگەردانت بکات، منیش پێم وتن: کەواتە وەڵامم بدەنەوە!!.. وەڵامی پرسیارەکانی بەنەوە، بەڵام کەسیان وەڵامیان نەیایەوە.. ڕۆژی یەکشەممە هاتە پێشەوە تا وتاری خۆم بدەم و وانەی خۆم پێشکەش بکەم لە کەنیسەدا.. لەبەردەم خەڵکەکەدا وەستام تا قسە بکەم.. نەمتوانی، خەڵکەکەش سەرسام بوون کە لەبەردەمیاندا وەستاوم و بێ ئەوەی قسە بکەم، بۆیە گەڕامەوە ناو کەنیسەو داوام لە هاوڕێیەکم کرد کە بڕواتە جێگاکەی من، پێم ووت من زۆر شەکەتم.. لەڕاستیدا لەڕووی دەرونیەوە داڕوخاو و تێکشکاو بووم.. گەڕامەوە بۆماڵەوە و لە حاڵەتێکی غەم و پەژارەیەکی زۆردا بووم، پاشان ڕۆشتم بۆ شوێنێکی بچوك لە ماڵەکەماندا دانیشتم و بەدەنگی بەرز دەگریام، پاشان چاوم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و دوعام دەکرد و دەپاڕامەوە، بەڵام لە کێ بپاڕێمەوە.. ڕوومکردە ئەو زاتەی کە لەو باوەڕەدا بووم ئەو خوا و بەدیهێنەرە.. لە دوعاکەمدا ووتم: ﴿پەروەردگارم.. بەدیهێنەرم هەموو دەرگاکان بە ڕوومدا داخراوە، بێجگە لە دەرگای تۆ، تۆش بێبەشم مەکە لە زانینی هەق، کوا هەق و کوا ڕاستەقینە؟ پەروەردگارا پەروەردگارا دەست بەردارم مەبە لەم سەرگەردانیەمدا، ڕێنمایم بکە بۆ ڕاستی و ڕێگای ڕاستەقینەم نیشان بدە﴾ پاشان خەوم لێ کەوت.. لە کاتی خەوەکەمدا.. لە خەونمدا بینیم: ئەوەتام لە هۆڵێکی زۆر گەورەدا، بێجگە لەمن کەسی تێدا نیە، لە سەروی هۆڵەکەوە پیاوێك دەرکەوت، بەهۆی ئەو نورەوە کە دەدرەوشایەوە لێی جوان ڕوخساریم نەدەبینی، وام گومان برد کە ئەوە خوایە، کە دوام لەگەڵیدا تا ڕێگای ڕاستم نیشان بدات.. بەڵام دڵنیا بووم کە پیاوێکی

نورانیە.. پیاوەکە ئاماژەی بۆ کردم و بانگی کرد: ئەی ئیبراهیم! تەماشای دەوروبەری خۆم کرد.. تەماشام کرد تا بزانم ئیبراهیم کێیە؟ بەڵام بێجگە لە خۆم کەسم لە هۆڵەکەدا نەبینی.. پیاوەکە پێی ووتم: تۆ ئیبراهیمیت.. ناوت ئیبراهیمە.. ئایا داوای زانین و حەقیقەت و ڕاستی لەخوا ناکەیت؟ ووتم: بەڵێ داوادەکەم.. ووتی: تەماشای لای ڕاستت بکە.. تەماشای لای ڕاستم کرد، کۆمەڵێ پیاوم بینی کەلوپەلەکانیان دابوو بە کۆڵیاندا، و پۆشاکی سپیان پۆشی بوو، لە گەڵ عەمامەی سپی، پیاوەکە ووتی: دوای ئەوانە بکەوە.. تا ڕاستی و حەقیقەتت بۆ دەرکەوێ!! لە خەوەکەم خەبەرم بوویەوە، و هەستم بە ئاسودەییەکی زۆر کرد کە سەراپای داگیرکردووم.. بەڵام کاتێ پرسیارم دەکرد بێتاقەت دەبووم.. ئایا لە کوێ ئەو کۆمەڵە کەسە ببینمەوە کە لە خەومدا بینیبومن؟ سوربووم لەسەر بەردەوام بوونم و گەڕانم، گەڕان بەدوای ڕاستەقینەدا وەك ئەو وەسفەی کە پیاوەکە لە خەونمدا نیشانی دام، دڵنیابووم کە هەموو ئەمانە بەدەسەڵاتی خوای گەورە بەڕێوە چووە.. داوای مۆڵەتم کرد لە کارەکەم.. پاشان دەستم کرد بە گەشتێکی درێژ، کە ناچاری دەکردم چەندین شار بگەڕێم و پرسیار بکەم لەو پیاوانەی کە پۆشاکی سپی دەپۆشن.. و عەمامەی سپی لەسەر دەکەن.. گەڕانەکەم مژدەی تێدا.. هەموو ئەوانەی کە من دەم بینین موسڵمان بوون و پانتۆڵیان لەپێدا بوو، گەڕانەکەم بردمی بەرەو شاری ﴿جوهانسبرنگ﴾ تەنانەت ڕۆشتمە نوسینگەی پێشوازی لیژنەی موسڵمانانی ئەفریقیا.. لەو بینایەدا.. سەبارەت بە کۆمەڵێکی وا پرسیارم لە کارمەندی پرسگەکە کرد، وای گومان برد کە من سواڵکەرم.. دەستی برد و ویستی پارەم بداتێ، ووتم: من بۆ ئەوە نەهاتوم.. ئایا شوێنی خواپەرستیتان نیە نزیك بێت لێرەوە..؟ مزگەوتێکی نزیکی نیشاندام منیش ڕۆشتم بۆ ئەوێ.. لەوێ موفاجەئات چاوەڕوانی من بوو، لە بەردەرگای مزگەوتەکەدا پیاوێك وەستابوو کە پۆشاکی سپی لەبەردا بوو، وە عەمامەیەکیشی بەسەرەوە بوو.. دڵم خۆش بوو.. ئەم لەو جۆرە پیاوانەیە کە من لە خەوەکەمدا بینیمن.. ڕاستەوخۆ ڕۆشتم بۆ لای و من بەو دیمەنە زۆر دڵخۆش بووم! پیاوەکەش پێش ئەوەی من قسەبکەم پێشکەوت و ووتی: مەرحەبا ئیبراهیم!! سەرسام بووم و بەو قسانەی و تووشی شۆك بووم..!! ئەو پیاوە پێش ئەوەی خۆمی پێ

بناسێنم ناوم دەزانیٚ.. پاشان پیاوەکە ووتی: لەخەونمدا بینیم تۆ بەدوای ئێمەدا دەگەڕایت و دەتەویست ڕاستی و حەقیقەت بزانیت.. ڕاستی و حەقیقەت لەو ئاینەدایە کە خوای گەورە دایناوە بۆ بەندەکانی کە ئیسلامە.. پێم ووت: بەڵێ. من بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێم.. و ئەو پیاوە نورانیەی لە خەوەکەمدا بینیم ڕێنمایی کردم کە دوای کۆمەڵێ بکەوم کە پۆشاکی وەك تۆیان لەبەردایە.. ئایا دەتوانیت پێم بڵێیت: ئەوە کێ بوو کە لە خەوندا بینیم؟ پیاوەکەش ووتی: ئەوە پێغەمبەری ئێمە بوو محمد(د.خ) پێغەمبەری ئیسلام و ئاینی حەق پێغەمبەری خوا!! بڕوام نەدەکرد بەو ڕووداوەی کە بەسەرمدا دێت، پاشان ڕۆشتم بۆ لای پیاوەکە و باوەشم پیادا دەکرد.. و پێم ووت: ئایا بەڕاستی ئەوە پێغەمبەری ئێوە بوو.. هاتبوو بۆلام تا ئاینی هەق و ڕاستیم نیشان بدات؟! پیاوەکە ووتی: بەڵێ.. پاشان پیاوەکە پیرۆزبایی لێ کردم کە خوای گەورە ڕێنمایی کردووم بۆ زانینی ڕاستی و حەقیقەت.. پاشان کاتی نوێژی نیوەڕۆ هاتە پێش، پیاوەکە لە دواوە لە مزگەوتدا داینیشاندم.. ڕۆشت تا لەگەڵ خەڵکەکەدا نوێژ بکات. موسڵمانانم بینی زۆربەیان جلوبەرگی وەك ئەو پیاوەیان لەبەردا بوو، دەمبینی رکوع و سوجدە دەبەن بۆ خوای گەورە.. لە دڵی خۆمدا ووتم: ﴿بەخوا ئەمە ئاینێکی هەقە، لە کتێبەکاندا خوێندومەتەوە کە پێغەمبەران تەوێڵیان دەخەنە سەر زەوی و سوجدە دەبەن بۆ خوا﴾ دوای نوێژەکە، دڵم ئارامی گرت بەهۆی ئەوەی کە بینیم و بیستم، و لەدڵی خۆمدا ووتم: ﴿بەخوا، خوای گەورە خۆی ڕێنمایی کردم بۆ ئاینی هەق و ڕاستی﴾ پیاوە موسڵمانەکە بانگی کردم تا موسڵمان بوونی خۆم ڕابگەیەنم.. منیش ووتەی شایەتومانم وتەوە، لە خۆشیاندا زۆر گریام بۆ ئەو منەتەی کە خوای گەورە پێی بەخشیم و ڕێنمایی کردم.

پاشان لەگەڵیاندا مامەوە تا فێری ئیسلامەتی ببم، پاشان لەگەڵیاندا ڕۆشتم لە گەشتێکی درێژی بانگخوازیدا، ئەوان بە سەرتاسەری وڵاتدا دەگەڕان و بانگەوازیان دەکرد بۆ ئیسلام، دڵخۆش بووم کە هاوڕێیەتیان دەکەم، لەگەڵیاندا فێری نوێژو ڕۆژوو و شەونوێژ و دوعاو ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێزی بووم، لێیانەوە فێربووم کە موسڵمانان نەتەوەیەکن خوای گەورە بەرپرسیارێتی گەیاندنی ئاینی خستۆتە ئەستۆیان.. و فێربووم چۆن ببم بە موسڵمانێکی بانگخواز بۆ ڕێگای خوا.. و لێیانەوە

فێری بانگەوازکردن بووم بە دانایی، و لێیانەوە فێری ئارامی و سۆزداری و قوربانیدانی و خاکی بوون بووم.
دوای چەند مانگێ گەرامەوە بۆ شارەکەم، کەسوکارم و هاوڕێکانم دەگەڕان بەدوامدا، کاتێ منیان بینی بە پۆشاکی ئیسلامیانەوە گەڕاومەتەوە بۆلایان، بڕوایان نەدەکرد، ئەنجومەنی کەنیسە داوایان لێ کردم کە دیدارێکی بەپەلە ئەنجام بدەم لەگەڵیاندا، لەو دیدارەدا سەرزەنشتیان دەکردم بۆ وازهێنانم لە ئاینی باوباپیران و هۆزەکەم، پێیان ووتم: هیندیەکان بە ئاینەکەیان فێڵیان لێ کردیت و سەرگەردانیان کردیت! منیش پێم ووتن: کەس فێڵی لێ نەکردووم و کەسیش سەرگەردانی نەکردوم. پێغەمبەری خوا (د.خ) هاتە خەوم و ڕێگای ڕاستی نیشاندام.. ئاینی ڕاست کە ئیسلامە... نەك ئاینی هیندیەکان کە ئێوە وای پێدەڵێن و منیش بانگتان دەکەم بۆ ئاینی هەق و ئیسلامەتی؟! پاشان لە دەروازەیەکی ترەوە هاتن بۆ لام.. شێوەی ئیغراکردن بە ماڵ و دەسەڵات و پۆستیان بەکاردەهێنا.. پێیان ووتم: ڤاتیکان داوای کردووە کە شەش مانگ لە لایان بمێنیتەوە.. لە کاروبارێکدا کە پێشەکی خەرجیەکەی دراوە، لەگەڵ کڕینی خانویەکی نوێ و ئۆتۆمبێلێکی نوێ بۆ تۆ.. و بڕێك پارەش بۆ باشترکردنی گوزەرانت.. و بەرزکردنەوەت بۆ پۆستێکی بەرزتر لە کەنیسەدا! هەموو ئەوانەم ڕەت کردەوە.. و پێم ووتن: ﴿ئایا دوای ئەوەی کە خوای گەورە ڕێنمایی کردووم دەتانەوێ سەرگەردانم بکەنەوە.. بەخوا شتی وا ناکەم، ئەگەر پارچە پارچەشم بکەن!! پاشان جارێکی تر ئامۆژگاریم کردن و بانگم کردن بۆ موسڵمان بوون، لە ئەنجامدا سوپاس بۆ خوا دوو قەشەی تر موسڵمان بوون.. کاتێ سوربوونی منیان بینی، هەموو پۆست و پلەکانیان لێ سەندمەوە.. پاشان هەستام و هەرچی پارە و بەڵێننامەیەك هەبوو پێم دانەوە و وازم لێ هێنان.. کۆتایی هات﴾ بەسەرهاتی موسڵمان بوونی ﴿ئیبراهیم سیلی﴾ کە خۆی بۆی گێڕامەوە لە نوسینگەکەم بە هاوەڵی ﴿عبدالخالق میتر﴾ سکرتێری نوسینگەی رابیتە لە باشوری ئەفریقیا.. و هەروەها بە ئامادەیی دوو کەسی تر.. قەشە ﴿سیلی﴾ بوو بە ﴿ئیبراهیم سیلی﴾ بانگخواز.. کە سەر بە هۆزەکانی ﴿کورا﴾ بوو لە باشوری ئەفریقیا.. قەشە ئیبراهیم ببورن بانگخواز ﴿ئیبراهیم سیلی﴾م داوەت کردبوو بۆ خوانی نیوەڕۆ لە ماڵی خۆمان و هەستام بەوەی

که ئاینەکەم پێی ڕاسپاردووم و زۆر ڕێزم لێ گرت.. پاشان ئیبراهیم سیلی خواحافیزی لێ کردم.. دوای ئەو دیدارە بەهۆی کارێکەوە ڕۆشتم بۆشاری مەککەی پیرۆز.. لەوێ خۆمان ئامادەدەکرد بۆ خولێکی (علوم شەرعی) کە یەکەم جار بوو ئەنجام بدرێ لەشاری ﴿کیپ تاوت﴾. پاشان گەڕامەوە بۆ باشوری ئەفریقیا تا بڕۆم بۆ شاری ﴿کیپ تاوت﴾ کاتێ لەو نوسینگە بوم کە ئامادەکرا بوو بۆمان لە پەیمانگای (ئەرقەم) بانگخواز ئیبراهیم سیلی هاتە ژوورەوە، ناسیمەوە و سلاّم لێ کرد، لێم پرسی: ئیبراهیم چی دەکەیت لێرە؟ ووتی پێم: من بە ناوچەکانی باشوری ئەفریقادا دەگەڕێم و بانگەواز دەکەم بۆ لای خوا، خەڵکانی لای خۆمان ڕزگار دەکەم لە ئاگر و لە تاریکایی دەریان دێنم بەرەو ڕوناکی بەهۆی موسڵمان بوونیانەوە، دوای ئەوەی ئیبراهیم بۆی باس کردین کە چۆن خەمی بانگەواز کردنە بۆ لای خوا، پاشان جێی هێشتین و بەرەو ئاسۆ کەوتە ڕێ.. بەرەو مەیدانەکانی بانگەواز و قوربانیدان لەپێناوی خوادا.. بینیم ڕوخساری گۆڕابوو.. پۆشاکەکانیشی گۆڕابوو، سەرسام بووم لێی، تەنانەت داوای یارمەتیشی نەکرد.. و دەستی درێژ نەکرد کە هاوکاری بکرێت. هەستم کرد کە فرمێسکێك کەوتە سەر ڕومەتم.. تا لەناخمدا هەستێکی سەیر بەئاگا بێنێتەوە.. ئەو هەستە وەك ئەوەیە کە پێم بڵێت: ئێوە کەسانێکن کە یاری دەکەن بە بانگەوازکردن.. ئایا ئەو موجاهیدانە نابینی کە لە پێناو خوادا تێدەکۆشن!! بەڵێ براکانم دڵمان ڕەق بووە... قورس بووین لەسەر زەوی.. ژیانی دنیا لەخشتەی بردووین.. و نمونەی بانگخوازی وەك ئیبراهیم سیلی و بانگخوازی ئیسپانی ئەحمەد و سەعید قوربانی دەدەن و تێدەکۆشن و هەوڵ دەدەن لەپێناوی گەیاندنی ئەم ئاینەدا!!!! خوایەگیان ڕەحم و بەزەییت.

لە مەقالەی د.عبد العزیز احمد سرحان، عەمیدی (کلیه المعلمین) لە مککەی پیرۆز، لە گەڵ هەندێ دەستکاری ﴿جریدة عکاظ﴾، سنة ٤١-ع/ ١٢٢٠٠، جمعة ١٥ شوال ١٤٢٠ك/ ٢١ نیایر ٢٠٠٠م.

## ٥٥- ﴿بەهۆی زۆری تاوانەکانیەوە وای پێ دەوترێ﴾

بەهۆی زۆری تاوانەکانیەوە وای پێدەوترێ و بووە بەنازناوی، کە تاوانەکانی لە سنورێکدا نەدەوەستا، بە نموونە دەیانهێنایەوە بۆ تاوان و تۆقاندن، هەموان لێی دەترسان و تۆقیبوون لێی.. خەڵکەکە دەیان ووت: ئەگەر هەموو تاوانباران و سەرپێچی کەران بگەڕێنەوە و باش بن، فلان کەس باش نابێت.. پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە دڵی بەندەکانی بەدەستەوەیە.. کێ بڕوای دەکرد مرۆڤێك کە ئەوە نازناوی بووبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو دڵە ڕەقەی نەرم دەبێت.. بەڵام ئەوە لە ئیرادەو توانای خوای گەورەدایە.. ﴿اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمْ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ(١٧)﴾الحديد.. واتە: { بزانن کە خوا دوای مردنی زەوی، زیندووی دەکاتەوە، بێگومان نیشانەی زۆرمان بۆ هێنانەوە، تا ژیر بن }.

دوای ئەوەی خوای گەورە ڕێنمایی کردم بەسەرهاتەکەی بەتەواوی بۆ گێڕامەوە.. شت و بەسەرهاتی وا گەورەی تێدا بوو مرۆڤی دەهێنایە لەرزین، و دڵی دەگوشی، منیش پێم باش بوو ئەوەندەی باس بکەم کە بۆ ئەم جێگایە بشێت، ووتی: خوا لە ئێمە و ئەویش خۆش ببێت، پێش ئەوەی نۆساڵی تەمەنم پڕ بکەمەوە باوکم وەفاتی کرد.. من منداڵی گەورەی بووم، دایکیشم ڕۆشتەوە بۆماڵی باوکی ﴿باپیرم لەسەری دایکمەوە﴾، بەڵام من لەلای مامەکانم بووم.. لە ماڵی باپیرم ﴿باوکی باوکم﴾ من لە نێویاندا وەك دۆزراوە وابووم.. ئەو کەسەی کە نەژادی خۆی نازانێت، یان وەك هەتیوێك، بەڵێ من بەوشێوەیە بووم، وەك ئەوەی ئەم ئایەتەی خوای گەورەیان نەبیستبێت ﴿فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلاَ تَقْهَرْ(٩)﴾الضحى.. واتە: ﴿جاکەواتە (تۆش ئەی موحەممەد) قەهر لە هەتیو مەکرە﴾

وە هەروەها پێشینان ووتویانە ﴿باشترین ماڵ لە نێو موسڵماناندا ماڵێکە هەتیوی تێدا بێت و چاك بن لەگەڵیدا، و خراپترین ماڵیش لە نێو موسڵماناندا ماڵێکە کە هەتیوی تێدا بێت و خراپ بن لەگەڵیدا﴾.

خۆزگایە کارەکە هەر بەوەندە بوەستایە، بەڵکو هەمیشە تاوانەکان ئاراستەی من دەکرا.. دزی.. خراپی...و شتی تریش، لەو کاتەدا کە من زۆر پێویستم بە سۆز و خۆشەویستی و دەستی میهرەبانی و کۆمەکی هەبوو، باوکانم دەبینی کە منداڵەکانیان

ماچ دەکەن و یاریان لەگەڵدا دەکەن، و شیرینی و یاری و پۆشاکی نوێیان بۆ دەکڕن.. بەڵام من... فرمێسك بە چاوانمدا دێتە خوارەوە و لەداخ و ئازار و حەسرەتا دڵم پارچە پارچە دەبوو.

وام لێهاتبوو ڕقم لە هەموو شتەکانی دەورووبەرم بوو... چاوەڕوانی کاتێکی گونجاوم دەکرد تا تۆڵە لەهەموان بکەمەوە... کاتێ گەشتمە تەمەنی پانزەساڵی.. سەرەڕۆیی دەستی پێ کرد.. لام دەکردەوە بەلای ڕاست و چەپدا هیچم نەدەبینی بێجگە لە هاوڕێی خراپ نەبێت.. لەگەڵیاندا ملی ڕێگام گرت.. لێیانەوە فێری جگەرە کێشان و شەونخونی تادرەنگانێ بووم.. مامم پێی زانیم کە جگەرە دەخۆم.. بەبێ ئەوەی تێم گەیەنێت لێی دام و لە ماڵێ دەری کردم.. وەك ئەوەی چاوەڕوانی ئەو ساتە بێت.. منیش ڕۆشتم بۆ ماڵی باپیرم ﴿باوکی دایکم﴾ دایکیشم لەوێ بوو.. دایکیشم لەگەڵ خوشك و براکانی تریدا لەماڵی باپیرم حاڵی لەمن باشتر نەبوو.. لەگەڵ ئەویشدا وەك کارەکەری ماڵەکە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد.. تەنها ئەو چێشتی لێدەنا و ماڵی پاك دەکردەوە و جلی دەشت...و.. بیرم ناچێ جارێکیان ڕۆشتمە ژورەوە بۆلای کە من لەوپەڕی سەرەڕۆیمدا بووم، ئەویش لە ئازاردا دەگریاو دەیوت: کوڕی خۆم.. عاقڵ بەو هۆشکەرەوە.. دەگەڕێم بەدوای وەزیفەیەکدا بۆت تا منیش لەم ژیانە ناخۆشە ڕزگار بکەیت. من هیچ گرنگیەکم بۆ دانەدەنا.. لەژێر زەبر و لێدان و هەڕەشەدا لەگەڵ خاڵەکانمدا فێری کشتیاری بووم، دنیا لەبەرچاوم تەسك بوو بوویەوە.. هەندێ پارەم لە دایکم قەرز کرد، ئۆتۆمبیلێکم پێ کڕی.. و لە یەکێ لە کۆمپانیاکاندا دامەزرام... ئاشنا بووم بە چەند هاوڕێیەکی نوێ، فێری ماددەی هۆشبەریان کردم لەگەڵ چەندین کاری تری نابەجێدا.. کاتێ دایکم بەوەی زانی توشی غەم و خەفەت و نەخۆشی بوو.. پەنای برد بۆ لای مامم و خاڵم بۆ ئامۆژگاری کردنم تا کار لەکار نەترازاوە.. ئەوانیش بە لێدان هێرشیان بۆ هێنام.. کە لەڕاستیدا ئەو شێوازە ئامۆژگاریکردن نیە.. منیش تەنها زیاتر دوور دەکەوتمەوە و خراپتر و سەرەڕۆتر دەبووم.. فێری ڕێگای ڕاکردن بووم لەماڵەوە.. هەموو کاتەکانم لەگەڵ هاوڕێی خراپدا بەسەر دەبرد.. جیاوازیم نەدەکرد لەنێوان حەڵاڵ و حەرامدا، بەڵام ئازاردان و دڵڕەقی لە مندا گەشتە ڕادەیەك کە سنوری نەبوو.. جارێکیان ڕۆشتم بۆ لای دایکم کە دەگریاو نەخۆش بوو،

روخساری تێکچووبوو، منیش قسەم پێ ووت و بە قسەی ناشرین بریندارم کرد و ڕۆشتمە دەرەوە. وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت... لە خوای گەورە دەخوازم بە فەزڵ و کەرەمی خۆی لێم خۆش بێت، خوا کۆمەکت بێت دایکی ئازیزم، گوناهت چی بوو؟ تۆ پەروەردەت کردم و خەرجیت کێشام.. و لەوانەیە ڕێنمایی من بەهۆی دوعای تۆوە بووبێت لە نیوەشەودا کە لە دڵە پاکەکەتەوە دەهاتە دەر ﴿قُتِلَ الإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ(١٧)﴾عبس واتە: ﴿ئادەمیزاد بەکوشتچێت چەندە ناسوپاس و سپڵەیە﴾.

ناوبانگم دەرکردبوو بە گۆرانی و عود ژەنین –دەنگم خۆش بوو– پاشان سەرقاڵ بوون بە شۆفێری لەگەڵ کارانی تردا کە شاراوە نیە لای زۆربەی کەس... کەس سوار نەدەبو لەگەڵمدا تەنها ئەو بەتەمەنانە نەبێت کە لەخۆیان نەدەترسان.. ئەوانی تر هەموویان رایان دەکرد.. چەندین جار خرامە بەندیخانەوە.. کاتێ ویستی خوای گەورە وابوو کە ڕێنمایی بکرێم، بۆ ئەوە هۆکارەکانی سازاند... هاوڕێیەکی ئازیزم هەبوو.. زۆر خۆشم دەویست.. روخسار جوان و شۆخ بوو.. ڕۆژێکیان هەواڵیم پرسی، وتیان پێم ئەوەتا لە نەخۆشخانەو لە بەشی چاودێری وردە... و بەهۆی ڕوداوێکی دڵتەزێنەوە لە بارێکی مەترسیداردایە.. بە خێرایی ڕۆشتم بۆ سەردانی.. کاتێ کە بینیم نەمناسیەوە.. جوانیەکەی نەمابوو، دیمەنی زۆر ترسناك بوو، من هەرکاتێ بیرم لەو دیمەنە بکردایەتەوە دەگریام بە هۆی کاریگەریەکەیەوە، چەند ڕۆژێك تێنەپەڕی، ووتیان مردووە.. لە ترسی مردن دوو ڕۆژی تەواو گریام.. ئەو ڕووداوە دەروازەیەکی خێربوو بۆ من.. من کاتێ دەستنوێژم دەگرت هەستم بە ئارامیەکی دەروونی مەزن دەکرد.. و بیری مردن و سەکەراتی و ناڕەحەتیەکانیم دەکردەوە.. و سووردەبووم لەسەر تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆلای خوا پێش ئەوەی گیانم بکێشرێت. خوای گەورە خستیە دڵمەوە کە ڕقم لە هەموو تاوانەکان ببێتەوە... و ئیمان و کردەوەی چاکی شیرین کرد لەلام.. بۆیە منیش هەرچی کاسێتی گۆرانی بێسود هەبوو کۆمکردەوە و ڕۆشتم بۆ نوسینگەی بانگەواز و گۆڕیمنەوە بە کاسێتی ئیسلامی بەسوود... گەڕامەوە بۆلای دایکم، زۆر بە ڕێزەوە بردم بۆلای خۆم.. داوای لێبوردن و گەردن ئازادیم لێ کرد... ئەویش لە خۆشیاندا دەستی کرد بەگریان، ئەویش سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر هیدایەت دانم.. هەرگیز گومانی ئەوەی نەدەبرد کە ڕۆژێ لە ڕۆژان

ئەوە ڕوودەدات.. بەڵام ئایا هاوڕێ خراپەکانم وازیان لێ هێنام؟ نەخێر.. بەڵکو سەردانیان دەکردم، و داوایان لێ دەکردم کە بگەڕێمەوە بۆ سەر ڕەفتاری جارانم، و پێیان دەوتم: وەسوەسە نەتگرێ، بگەڕێرەوە بۆ هونەر، کوا موزیکەکەت! کوا ناوبانگ؟ کوا... وایان لێ دەکردم و عود و گۆرانی و کاری ناشەرعیان دەهێنایەوە یادم کە ڕووم نایە باسی بکەم.. بەڵکو هەندێکیان -پەنا بەخوا- شەرمی نەدەکرد کە خۆی ببەخشێ پێم لەبەرامبەر گەڕانەوەدا!! ئەبێ چ گومراییەك لەو گومراییە مەزنتر بێت؟ چەند مانگێ تێپەڕی و یەکێ لە خراپەکارەکان بانگهێشتیان کردم بۆ دانیشتنێکی عود.. منیش عودم لێدا.. چونکە تازە پابەند بووبووم بە دینداریەوە.. وورده وورده لاوازتر دەبووم، هەتا وام لێهات گەڕامەوە بۆ گوێگرتن لە گۆرانی.. شەوێکیان لە خەونمدا بینیم کە فریشتەی مردن هێرشی بۆ هێنام، منیش دەمەویست یادی خوا بکەمەوە، دەمەویست شایەتومان بهێنم.. بۆیە سوێندم خوارد بەخوای گەورە ئەگەر بە زیندویی بمێنمەوە دەبێ بگەڕێمەوە و تەوبەیەکی یەکجاری بکەم ، کاتێ ڕۆژ بوویەوە هەستام بەشکاندنی هەموو کاسێتەکانی گۆرانی. وە سوربووم لەسەر پابەند بون بە تەواوی.. و ئێستا چوار ساڵ بەسەر ئەو حاڵەتەدا تێپەڕیوە و کە فەزڵ و منەتیشی تەنها دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە. و بارودۆخیشم دوای تەوبە کردنەکە زۆر باشە و هەست بە بەختیاریەك دەکەم کە کەس نازانێت بێجگە لەخوای گەورە، بە ڕاستی ڕوخسارم ڕووناك بوویەوە بە نوری پەرستش و ڕەشی و تاریکایەکەی نەما.. و ئەو کەسانەی کە لە ڕۆژی بێئاگایی و سەرگەردانیدا ڕوویان لێم بوو ئێستا خۆشیان دەوێم.. دایکی ئازیزیشم سوپاس بۆ خوای گەورە شیفای بۆ هات و ڕزگاری بوو لە هەموو نەخۆشیەك. و ئەوەی کە زیاتر دڵخۆشی کردم ئەوەیە کە پرسیارم لە یەکێ لە زانا بەڕێزەکان کرد سەبارەت بە گوناهەکانی ڕابردووم ووتی: بەڕاستی خوای گەورە بەڵێنی داوە کە گوناه و تاوانی تەوبەکاران بگۆڕێت بۆ چاکە.. سوپاس بۆخوای گەورە..

# ٥٦- ﴿زانایەکی کەنەدی لە زانکۆی پەترۆڵ باس لە قورئان دەکات﴾

دکتۆر ملێر ﴿Gary Miler﴾ کە یەکێکە لە ئەندامانی دەستەی وانە وتنەوە لە زانکۆی مەلیك فەهد بۆ پەترۆڵ و کانزاکان لە بەشی وەرزشی، کە بە ڕەگەز کەنەدیە و لاپەڕەکەی لەسەر سایتی زانکۆیە و هەروەها وێنەکەشی .http://kfupm. Edu Sa/math/٤٥. htm یەکێکە لە مەسیحیە زۆر چالاکەکان بۆ بانگەوازکردن بۆ نەصرانیەت، و هەروەها یەکێکە لەوانەی کە زانیاریەکی زۆری هەیە سەبارەت بە کتێبی پیرۆز.. ئەم پیاوە زۆر حەزی لە بیرکاری بوو.. لەبەرئەوەی حەزی لە لۆژیك و کاری لۆژیکانە بوو بۆ شتەکان.. ڕۆژێکیان ویستی قورئان بخوێنێتەوە بەمەبەستی ئەوەی هەندێ هەڵەی تێدا بدۆزێتەوە تا هەڵوێستی خۆیی پێ بەهێز بکات تا لەکاری بانگەوازکردنی موسڵمانان بۆ مەسیحیەتی سودی لێ ببینێت وای گومان دەبرد کە قورئان کتێبێکی کۆنە و پێش چواردە سەدە نوسراوەتەوە و باس لە بیابان و ئەو جۆرە شتانە دەکات... بەڵام زۆر سەرسام بوو بەو شتانەی کە لە قورئاندا بینی.. بەڵکو بۆی دەرکەوت کە ئەم کتێبە کۆمەڵێ شتی تێدایە کە لە هیچ کتێبێکی تری ئەم جیهانەدا نیە... پێشبینی دەکرد کە هەندێ ڕووداوی ناڕەحەت کە ڕەت بووە بەسەر پێغەمبەر (د.خ) وەکو وەفاتی خەدیجەی خێزانی (د.خ) یان وەفاتی کچەکانی و کوڕەکانی.. بەڵام هیچی لەو بارەیەوە نەدۆزییەوە.. بەڵکو ئەو شتەی کە زیاتر ئەمی سەرسام کرد ئەوە بوو کە یەك سورەتی بینی کە لە تەواوی قورئاندا کە ناونراوە سورەتی ﴿مەریەم﴾ کە ڕێزلێنانە لە مەریەم –علیها السلام– کە نمونەی ئەوە لە کتێبەکانی مەسیحیەکاندا نیە و لە ئینجیلەکانیاندا نیە!! و سورەتێکی نەبینیوە بەناوی ﴿عائیشە﴾ یان ﴿فاتمە﴾.. و هەروەها تەماشای کرد کە عیسا –علیه السلام– ٢٥ جار لەقورئاندا ناوی هاتووە لەکاتێکدا محمد–ص– تەنها پێنج جار ناوی هاتووە.... بۆیە ئەم پیاوە زیاتر سەرسام بوو.. بە وردەیەکی زیاترەوە دیراسەی قورئانی کرد... بەڵکو سەرسام نەبێت پێی و هەڵەیەکی تیا ببینێتەوە.. بەڵام ئەم جارەشیان زۆر زۆر سەرسام بوو کاتێ تەماشای ئایەتی ژمارە ٨٢ی کرد لە سورەتی

﴿النساء﴾ خوای گەورە دەفەرموێ ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا(٨٢)﴾ النساء...واتە: ﴿ بۆ لەم قورئانە ورد نابنەوە؟ بۆ باش بیری لێ ناکەنەوە تا بۆیان دەرکەوێ کەلامی خودایە و لە غەیبەوە هاتووە؟ ئەگەر قسەی خودا نەبوایە و هی یەکێکی تر بوایە جیاوازی و ناکۆکیەکی زۆریان تێدا ئەبینیەوە﴾.

دکتۆر میلەر سەبارەت بەم ئایەتە دەڵێ: لە بۆچونە زانستیە ناسراوەکان لەم سەردەمەدا بریتیە لە بۆچونی بوونی هەڵەکان یان روودانی هەڵەکان لەبیرودۆزەکاندا تا ڕاستێتیان دەسەلمێنرێ ﴿falsification fest﴾ و سەیر لەوەدایە کە قورئانی پیرۆز موسڵمانان و ناموسڵمانان بانگ دەکات تا هەڵەیە لە قورئاندا بدۆزنەوە و ئەوانیش نایدۆزەوە وە هەروەها سەبارەت بەم ئایەتە دەڵێ: ﴿هیچ نوسەرێ نیە لە جیهاندا کە بوێرێت و زاتی ئەوە بکات کتێبێك دانێت و پاشان لەو کتێبەدا بڵێت کە هیچ هەڵەیەکی تێدا نیە.. بەڵام قورئان زۆر بە پێچەوانەی ئەوەوەیە بە تەواوی.. پێت دەڵێ: هیچ هەڵەیەکی تێدا نیە، بەڵکو پێشنیارت بۆدەکات کە بەدوای هەڵەدا بگەڕێیت تیایدا و ناشی بینیتەوە..﴾ و هەروەها لەو ئایەتانەی کە میلەر هەڵوێستەیەکی درێژی تێدا کرد ئایەتی ٣٠ سورەتی ﴿الأنبياء﴾ بوو ﴿أَوَلَمْ يَرَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنْ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلاَ يُؤْمِنُونَ(٣٠)﴾ واتە: ﴿ ئایا کافرەکان نازانن کە ئاسمانەکان و زەوی پارچەیەکی پێکەوە لکاو بوون و لێکمان کردنەوەو هەموو شتێکی زیندوومان لە ئاو دروست کردووە؟ دەی ئایا هێشتا هەر ئیمان ناهێنن﴾.

دەڵێ: بەڕاستی ئەم ئایەتە بەتەواوی باس لەبابەتی توێژینەوەیەکی زانستی دەکات کە خەڵاتی نۆبڵی لەسەر وەرگیرا لەساڵی ١٩٧٣ کە باس لە تیۆری تەقینەوەی گەورە دەکات کە دەڵێت ئەم گەردوونە کە ئێستا هەیە لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی گەورەدا ئەم گەردوونە بە ئاسمانەکان و زەوی و هەسارەکانەوە دروست بوو، وشەی ﴿الرتق﴾ شتێکی پێکەوە بەستراو و گرێدراوە، لە کاتێکدا وشەی ﴿الفتق﴾ شتێکی لێك هەڵوەشاوە... سبحان الله... دێینە بەشی کۆتایی ئایەتەکە کە سەبارەت بە ئاوە کە سەرچاوەی ژیانە.. دکتۆر میلەر دەڵێ: ﴿ئەمە لە کارە سەیرەکانە.. بە شێوەیەك زانستی نوێ لەم دواییەدا سەلماندی کە خانەی زیندوو پێکهاتووە لە سایتۆپلازم کە

٨٠٪ی خانەی پێکهێناوە و سایتۆپلازمیش بە شێوەیەکی بنەڕەتی پێکهاتووە لە ئاو... ئیتر چۆن پیاوێکی نەخوێندەوار پێش ١٤٠٠ ساڵ هەموو ئەم شتانە دەزانێ... ئەگەر بە هۆی نیگاوە نەبێت لە ئاسمانەوە؟؟ سبحان الله.. ئەمەی کە من باسم کرد بەشێکی کەم بوو لە ژیانی ئەو پیاوە... دکتۆر میلەر لەساڵی ١٩٧٧ز هۆگری ئیسلام بوو.. دوای ئەوە لە سەرتاسەری جیهاندا موحازەراتی پێشکەش دەکرد... و هەروەها پەیڤینی زۆری ئەنجامداوە لەگەڵ پیاوە ئاینیە مەسیحیەکاندا.. کە خۆی یەکێك بوو لەوان!! لە یەکێ لە موحازەرەکانیدا دەڵێ کە قسەکانی ئاراستەی هەموو موسڵمانان دەکات و دەڵێ: ﴿ئەی موسڵمانان ئەگەر دەرکتان بەفەزڵی ئەو ئاینەی خۆتان بکردایە، لە گەڵ ئەو ئاینەی کە لەلای کەسانی تر هەیە ئەوە سوجدەی زۆرتان دەبرد بۆ خوای گەورە.. کە خوای گەورە بە موسڵمانی دروستی کردون و بە موسڵمانی گەورەی کردوون و منەتی ئەم ئاینەی پێداون.. ئەگەر تەماشای مەدلولی یەکتاپەرستی، پەیام، پێغەمبەرێتی، زیندوبوونەوە، لێپرسینەوە، بەهەشت، دۆزەخی لای خۆتان و لای کەسانی تر بکەن سوجدەی سوپاستان بۆ خوا دەبرد کە بە موسڵمانی خوڵقاندونی، چونکە ئەو چەمکانە لای خاوەن ئاینەکانی تر چەمکانێکە ئەقڵی ژیر و دروست و فیترەتی دروست و لۆژیکی دروست قبوڵی ناکات.. دکتۆر میلەر کتێبی زۆری هەیە سەبارەت بە ئیسلام.. بۆ نمونە کتێبی ﴿قورئانی سەرسوڕهێنەر﴾و کتێبی ﴿جیاوازی نێوان قورئان و کتێبی پیرۆز﴾ و کتێبی ﴿دیدێکی ئیسلامیانە سەبارەت بە شێوازی مژدەدەران﴾ و ژمارەیەکی زۆر لە کتێب کە بەزمانی ئینگلیزی لە ئینتەرنێتدا هەیە... ئەم پیاوە ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەسەر دەستی موسڵمان بوون لە سەرتاسەری جیهاندا.. دکتۆر میلەر شارەزایی زۆری هەیە لە بواری شێوازی بانگەوازدا... و زۆرێك لە بانگخوازان سودمەند بوون لە شارەزاییەکی بۆ نموونە شێخ ﴿ئەحمەد دیدات﴾ کە بانگی کرد بۆ شاری ئەفریقیا بۆ ئەنجامدانی چەند موحازەرەیەك و ئەنجامدانی چەند ﴿هەڤپەیڤینێك﴾... دکتۆر میلەر ئاواتەخوازە موحازەرە بدات سەبارەت بە ئیسلام بەڵام کەس بانگی ناکات بۆ ئەوە.. ئایا ئێوە ئەوە دەکەن...

## ٥٧- ﴿ئەو سەگە بێدەنگ بکەن﴾

لاوێکی زۆر شۆخ و شەنگ بە وەستانی دڵ گیانی لەدەستدا.. برا پابەندە دیندارەکەشی دادەبەزێتە گۆڕەکەی و ئەسپەردەی دەکات و فرمێسکیش بە رومەتیدا دێتە خوارەوە... ئای ئەو ساتە چەندە سەختە... تەماشای ڕوخساری براکەی دەکات، و لە پڕ فرمێسک لەچاویدا وشك دەبێت و هەست بە ترس و تۆقین دەکات.. ئەوە چی دەبینم؟؟ ئەستەمە ئەوە برای من بێت... بەپەلە دفنی دەکات و لە بەرێکردنی تەعزیەدا دەوەستێ، بەڵام بە دڵ و فیکر لەوێ نابێت... هەرچی ئافرەت هەیە دەگرین بۆ گەنجیەتیەکەی، تەنها یەك ئافرەت نەبێت کە ژنەکەیەتی.. زەنگی تەلەفۆن لێدەدرێ و پاشان یەکێ لە ئافرەتەکان داوا لە ژنەکەی دەکەن کە قسە لەگەڵ هێوەر ﴿برای مێرد﴾ەکەی بکات.

برا: خوا پاداشتان بداتەوە...

ژنەکەش بە ساردیەکەوە: اجمعین ﴿واتە ئێمەو ئێوەش﴾.

برا: ﴿دوای ئەوەی هەستی بەو ساردیە کرد﴾.. شتێکی سەیر لە گۆڕستانەکە ڕویداوە، دەمەوێ لەخۆتەوە بیبیستم و بۆم باس بکەیت..

ژن: چی ڕوویداوە؟

برا: کاتێ تەماشای ڕوخساری براکەمم کرد تەماشامکرد وەك ڕوخساری....... بێدەنگ بوو........

ژنەکە بەپەلە ووتی: ڕووخساری چی، پێم بڵێ؟؟!

برا: ڕوخساری لە ڕوخساری سەگی دەکرد، ئایا تۆ هیچ لێکدانەوەیەکت هەیە بۆ ئەوە؟؟

ژن: براکەت یەك ڕکات نوێژی بۆ خوای گەورە نەکرد، و هیچ ئامۆژگاریەکیشی لە من وەرنەدەگرت، بەڵکو ئەگەر ئامۆژگاریم بکردایە لێی دەیام، و گرنگتریش لەوە ئەوەبوو هەرکاتێ گوێی لە بانگەوە بوایە هاواری دەکرد و بە گاڵتە پێکردن و سوکایەتیەوە دەیوت: ئەو سەگە بێدەنگ بکەن!!

سبحان الله............سبحان الله..

# ٥٨- ﴿ موسڵمان بوونی پزیشکێکی ئەمریکی ﴾

ئەم بەسەرهاتە لە یەکێ لە نەخۆشخانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕوویداوە، لە ئەنجامدا یەکێ لە پزیشکەکانی موسڵمان دەبێت.. پزیشکێکی میسری کە زانستێکی زۆری دەبێت، کە بە هۆیەوە ئاشنا دەبێت بە ژمارەیەك لە پزیشکە ئەمریکیەکان... بۆیە بەتەواوی دەبێتە جێ سەرنجی ئەوان... و لە نێو هەموو ئەوانەدا، ئەو پزیشکە هاوڕێیەکی خۆشەویستی دەبێت.... هەمیشە بەیەکەوە دەبن، و لەبەشی منداڵبوونی ئەو نەخۆشخانە کاردەکەن.. شەوێکیان پزیشکی سەرپەرشیار لەوێ نابێت، و لە هەمان کاتیشدا دوو حاڵەتی منداڵبوون لەوکاتەدا دەبێت.. کاتێ دوو ئافرەتەکە منداڵیان دەبێت، دوو منداڵە ساواکە دەگۆڕێن، و کەسیان نازانن کامەیە منداڵەکەیان، شایانی باسە دوو منداڵەکە یەکێکیان کوڕ و ئەوی تریان کچ دەبێت... و هەمووی بەهۆی کەمتەرخەمی ئەو پەرستارەوە دەبێت کە پێویست بوو ناوی دایکەکە لە ئەڵقەیەك بنوسێت و بیکاتە دەستی منداڵەکەوە.... کاتێ هەردوو پزیشکەکە، میسریەکە و هاوڕێکەی زۆر سەرسام بوون و نەیاندەزانی چی بکەن، چۆن بزانن کامیان دایکی کوڕەکەیە و کامیان دایکی کچەکەیە، پزیشکە ئەمریکیەکە، بە پزیشکە میسریەکەی ووت: تۆ دەڵێیت قورئان هەموو شتێکی ڕوون کردۆتەوە، و تۆ دەڵێیت باسی هەموو شتێکی کردووە، هەرچۆنێك بێت... دەی نیشانم بدە چۆن دەتوانیت کە بزانیت دایکی ئەم منداڵانە کامەیە؟؟!! پزیشکە میسریەکەش ووتی: بەڵێ قورئان باسی هەموو شتێکی کردووە، و من ئەوەت بۆ دەسەلمێنم، بەڵام پەلەمەکە با دڵنیا ببم.. پاشان پزیشکەکە سەفەری کرد بۆ میسر و ڕۆشت بۆ لای یەکێ لە زانایانی ئەزهەر، و باسی ئەو وتووێژەی بۆ کرد کە ڕویدا لەنێوان خۆیی و هاوڕێکەیدا.. زاناکەش پێی ووت: من سەبارەت بەو مەسەلە پزیشکیەی باسی دەکەیت شارەزاییم نییە، بەڵام ئایەتێکت لە قورئاندا بۆ دەخوێنمەوە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە و پشت بە خوا چارەسەری تیادا دەبینیتەوە.. زاناکە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾النساء/١٠.. واتە: ﴿ نێرینە دوو هێندەی مێیینە لە میراتدا پشکی هەیە﴾. پزیشکە میسریەکە دەستی کرد بە بیرکردنەوە لە ئایەتەکە پاشان چارەسەرەکەی دۆزیەوە... ڕۆشت بۆ لای هاوڕێکەی و پێی ووت: قورئان

سەلماندویەتی کە هەر منداڵێکیان بۆ کێ دەگەڕێتەوە.. پزیشکە ئەمریکیەکەش ووتی: چۆن؟ پزیشکە میسریەکە وتی: با پشکنین بۆ شیری هەریەك لە ئافرەتەکان بکەین پاشان چارەسەر دەدۆزینەوە، بەڵێ ئەنجامەکە دەرکەوت، پزیشکە میسریەکە زۆر دڵنیا بوو لە وەڵامەکەی کە دایکی ڕاستەقینەی هەر منداڵێکیان کامەیە!! پزیشکە ئەمریکیەکەش سەرسام بوو، ووتی: چۆنت زانی؟ ئەو ئەنجامەی کە دەرکەوت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو بڕە شیرەی لە مەمکی دایکی کچەکەدایە، و ڕێژەی ئەو خوێ و ڤیتامینانەی لە شیری دایکی کوڕەکەدایە دوو ئەوەندەی ئەوی ترە، پاشان پزیشکە میسریەکە ئایەتەکەی خوێندەوە بۆ هاوڕێکەی کە بوو بە بەڵگە بۆی بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە کە تێی کەوتبوون.. بۆیە خێرا پزیشکە ئەمریکیەکە موسڵمان بوو... پاکو بێگەردی بۆ خوای جیهانیان!!

# ٥٩- ﴿ئەی خەڵکینە شایەتی بدەن کە من کچەکەی خۆم دا بەم کوڕە﴾

گێڕەرەوەی چیرۆکەکە دەڵێ: دوێنێ من لە موحازەرەیەکی ئاینیدا ئامادەبووم، لە ماڵی شێخ (حەمید النعیمی).. موحازەرەکە باسی هاوەڵی بەڕێز ﴿ابو الدرداء﴾ی دەکرد.. ئەوە یەکەم جار بوو دڵئارام ببێت بەو ئافرەتەی محازەرە دەدات، لەڕاستیدا شێوازەکەی سەرنج ڕاکێش و جوان بوو، خوای گەورە تەمەن درێژی بکات و ئەوانە بخاتە سەر ترازوی چاکەکانی.. بەهەرحاڵ چیرۆکێك سەرنجی ڕاکێشام کە غەمباری کردم بۆ بارودۆخمان و بارودۆخی گەنجانمان.. خوای گەورە ڕێنمایی ئێمە و ئەوانیش بکات..

درێژەی نادەمێ فەرمون لەگەڵ بەسەرهاتی چیرۆکە واقیعیەکەدا.. بەسەرهاتەکە لەشام ڕوویداوە لە دەوروبەری_شاری دیمەشق.. کچێکی هەرزەکار لە هەرەتی لاوێتیدا هەموو ڕۆژێ دەچوو بۆ زانکۆ تا فێری زانیاری ببێت و ئەدەبی زیاد ببێت، باوکیشی سەرۆکی بەش بوو لەو زانکۆیەدا. ڕۆژێکیان دنیا سارد بوو، ئاسمانیش بە هەور داپۆشرابوو.. هەر کە ئێوارە داهات بوو بە هەورەگرمەو باران دایکرد و پاشان تەرزەی گەورەگەورە کە خەریك بوو سەری خەڵکی دەشکاند کە ڕایان دەکرد لەژێر هەر شتێکدا بێت خۆیان حەشار بدەن.. کچەکە لە کۆلێژەکە هاتە دەرەوە و کەوتە ڕێ بەڵکو شوێنێك بدۆزێتەوە کە بیپارێزێ لەو گەردەلولە بەهێزە.. تەڕبووبوو.. هەڵدەلەرزی. نەیدەزانی بەرەو کوێ بڕوات.. کاتێ تەرزەکە زیادی کرد تەقەیدا لە دەرگایەك لە یەکێ لە کۆڵانە میللیەکاندا... لاوێك پێشوازی لێکرد و فەرموی لێکرد کە بێتە ژوورەوە تا تەرزەکە هێور دەبێتەوە.. و یەکتریان نەدەناسی تەنها ئەویش لە هەمان زانکۆ مامۆستا بوو، سەلت بوو بە تەنها لەژوورێکدا دەژیا.. لاوەکە داوای لێکرد لە ژورەکەدا بحەسێتەوە تا تەرزەکە خۆش دەکات، زۆپای بۆ بردە ژورەوە و داوای لێکرد بحەسێتەوە و دوای ماوەیەك زۆپاکە دەباتە دەرەوە.. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك، دانیشتبوو لەسەر نوێنەکە و هەڵدەلەرزی، باوێشك زۆری بۆ هێناو خۆیدا بەسەر نوێنەکەدا... لاوەکە هاتە ژوورەوە و تەماشایکرد وەك شاژن خەوی لێکەوتووە..

رۆپاکەی بردە دەرەوە.. بەڵام شەیتان هەر وەسوەسەی دەخستە دڵیەوە، وێنەی کچەکەی دەهێنایە پێش چاوی.... ئافرەتەکە بەئاگا هاتەوە خۆیی بینیەوە فڕێدراوە لەسەر نوێنەکە، نەیزانی چی ڕوویداوە. ڕۆشت بەرەو لای دەرگاکە لاوەکەی بینی لە دەرەوە فڕێ دراوە و لە هۆش خۆی چووە.. کچەکە ڕایکرد و لای نەدەکردەوە بۆ دواوە هەتا گەشتەوەماڵەوە، خۆی خستە ئامێزی باوکیەوە.. کە باوکی بە درێژایی ئەو شەوە هەموو شوێنێ گەڕابوو بەدوایدا... هەموو ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە کە هاتبوو بەسەریدا، و سوێندی بۆ خوارد کە نازانێ چی ڕوویداوە... باوکیشی هەر ئەوەندەی بۆ کرا ڕۆشت بۆ زانکۆ، و هەواڵی لاوە غائیبەکەی گەیاند بە ئیدارە... ئەو ڕۆژە دوو لاو نەهاتبوونەوە.. ڕوون بوویەوە کە یەکێکیان ڕۆشتووە بۆ دەرەوەی وڵات و دووەمیشیان لە نەخۆشخانەیە.

باوکەکە ڕۆشت تا ئەو لاوە ببینێت لە نەخۆشخانەیە تا ئاگاداری بەسەرهاتەکە ببێت و تۆڵەی خۆیی لێبکاتەوە.. لاوێکی بینی بینی هەردوو دەستی بە لەفافی سپی پێچراوە.. پرسیاری لە پزیشکەکە کرد کە چی ڕوویداوە.. پزیشکەکەش پێی ووت: ئەم نەخۆشە هاتووە و پەنجەکانی سوتاون.. بەڵێ پەنجەکانی سوتابوون... باوکەکە بە کوڕە گەنجەکەی ووت: سوێندت ئەیەم بەخوا بۆچی وات بەسەر هاتووە، بەبێ ئەوەی پێی بڵێ کە ئەم باوکی کچەکەیە... کوڕە گەنجەکەش ووتی: دوێنێ کچێك پەنای بۆ هێنام تا خۆی بپارێزێ لە تەرزەو باران، منیش بردمە ژوورەکەی خۆمەوە.. بەڵام شەیتان لەکۆڵم نەدەبوویەوە و دەیەویست توشی گوناه و تاوانم بکات.. منیش چومە ژورەوە تا زۆپاکە بێنمە دەرەوە، منیش هەرکاتێ دەروونم لاواز ببوایە یەکێ لەپەنجەکانی دەستم دەسوتاند تا ئاگری دۆزەخم بێتەوە یاد و سزای دۆزەخ، هەتا پەنجەکانی خۆمم سوتاند بۆیە لەهۆش خۆم چووم و ئاگام لەخۆم نەما، کاتێك نەبێت تەماشام کرد لە نەخۆشخانەم، باوکەکەش هاواری کردو ووتی: ئەی خەڵکینە ئێوە شایەت بن کچەکەی خۆمم دا بەم کوڕە!!

## ٦٠- ﴿سيد قوتب له لەدايك بوونەوە تا شەهيد بوون﴾

له گوندێك له كەنارەكانی صەعيدی ميسر، سەيد قوتب – رەحمەتی خوای لیٚ بێت– لەدايك بوو.. له خێزانێكی ديندار‌دا گەورە بوو، كه گوزەرانيان مامناوەند بوو... دايك و باوكی سوربوون له سەر ئەوەی قورئانی پيرۆزی پیٚ لەبەر بكە... كاتیٚ گەشتە تەمەنی ده ساڵی هەموو قورئانی لەبەر كرد... كاتیٚ گەشتە تەمەنی نۆز دەساڵی، بۆ ماوەيەك سەرگەردان بووبوو... وەك خۆی وەسفی دەكات ﴿ماوەيەكی بێباوەڕی بوو﴾... دەڵێت ماوەی يانزە ساڵ بێباوەڕ بووم، هەتا ڕێگای بەرەو خوای گەورەم دۆزيەوە... دڵنيايی ئيمانم دۆزيەوە.. له ساڵی ١٩٤٨ز سەيد قاهيرەی جێهێشت و ڕۆشت بەرە و ئەمريكا، له ڕێگای وەزارەتی مەعاريفەوە، لەو كاتەدا، ئەو گەشتەی سەرەتايەكی ڕێگايەكی نویٚ بوو كه خوای گەورە ڕێنمايی كردبوو... كه بووە هۆی ڕێنمايی بوونی.. گەشتەكەی له ڕێگای دەرياوە بوو به كەشتی به دەريای ناوەڕاست و زەريای ئەتڵەسيدا.. له ناو كەشتيەكەدا توشی چەند ڕووداویٚ هات كه كاريگەری هەبوو لەسەر ژيانی ئايندەی، و ڕێگای بۆ ڕووناك كردەوە... له بەر ئەوە هەر كه كەشتيەكەی جێهێشت و پێی نايە سەر خاكی ئەمريكا، ڕێگای خۆيی دۆزيەوە و پەيامەكەی خۆيی دياری كرد، و نەخشەی بۆ ژيانی نوێی كێشا.. وە ئێستا... با گویٚ له سەيد بگرين تا بزانين لەسەر كەشتيەكەدا چی ڕوويدا... ووتی: ﴿نزيكەی پانزە ساڵ پێش ئێستا، ئێمە پێنج كەس بووين كه موسڵمان بووين، لەسەر كەشتيەكی ميسری كه له ڕێگای زەريای ئەتڵەسيەوە دەيبردين بەرەو نيويۆرك.. له نێو سەد و بيست نەفەردا له ژن و پياو كه موسڵمانی تێدا نەبوو... هات به بيرماندا كه نوێژی جومعە لەو زەرياێدا ئەنجام بدەين لەسەر ڕووی كەشتيەكە! خوای گەورە ئاگادارە مەبەستمان ئەنجامدانی خودی نوێژەكە نەبوو به ئەندازەی ئەوەی كه حەماسەتێكی ئاينيمان تيادا دروست بوو.. دژ به مەسيحيەك كه سەرقاڵی كارەكانی خۆی بوو لەسەر كەشتيەكە دەيەويست هەوڵ بدات ئێمە بكات به مەسيحی! و بەرپرسی كەشتيەكە كه –پياوێكی ئينگليز بوو– ئاسانكاری بۆ كردين كه نوێژەكەمان ئەنجام بدەين و ڕێگای دا بەكەشتيەوان و چێشت لێنەرو كارگوزارەكان، كه هەموويان موسڵمان بوون، كه ئەوانيش نوێژ بكەن لەگەڵماندا كه له كاركردندا نين لەكاتی

نوێژەکەدا ئەوانیش زۆر دڵخۆش بوون بەوە، پاشان زانیمان کە خەڵکی یوگوسلافیایە و مەسیحیەو لە دۆزەخی «تیتۆ»ی شیوعی ڕایکردووە، کە زۆر بێتاقەت و کاریگەر بوو، چاوەکانی پربوون لە فرمێسك و خۆی پێرانەگیرا، بە توندی دەستمان دەگوشی و —بە ئینگلیزیەکی لاواز– دەستی ئێمەی گوشی، نەیتوانی خۆی ڕاگرێت بە هۆی کاریگەری زۆریەوە بە نوێژەکەمان، و لەو ملکەچیە بۆ خواو بەو سیستەم و ڕۆح و.... هتد. دوای هەموو ئەوانە، و لە سێبەری ئەو حاڵەتە ئیمانیەدا، سەید لە گەڵ خۆیدا دەدوێ و دەڵێ: «ئایا بڕۆم بۆ ئەمریکا تا وەکو کەسە نێردراو و سادەکان بژیم، ئەوانەی کە تەنها خەریکی خواردن و خەوتنن، یان پێویستە جیابم و سیفاتی دیاریکراوم هەبێ؟! و ئایا بێجگە لە ئیسلام و پابەندبوون بە ئادابەکانی و مەنهەجەکانی لە ژیاندا مرۆڤ ناکەوێتە هەموو هۆکارەکانی ئارەزوات و لەزەتی حەرام؟.. ووتی: وام بینی کە ببمە پیاوی دووەم، «موسڵمانی پابەند». و خوای گەورە ویستی تاقیم بکاتەوە ئایا من ڕاستگۆم لەوەدا کە دەمەوێ یان تەنها ڕازێکە و بەس؟! تاقیکردنەوەی خوای گەورە بۆ من دوای چەند خولەکێك بوو لە دوای ئەوە ڕێگای ئیسلامم هەڵبژارد، هەر کە چوومە ژوورەکەمەوە.. تەقە درا لە دەرگا... منیش دەرگام کردەوە... ئافرەتێکی شۆخ و شەنگی جوانم بینی، باڵا بەرز، نیمچە ڕووت، سەرتاپای لەشی جێگای سەرنج بوو.. بە ئینگلیزی ووتی: ئایا بەرێزتان ڕێگام پێدەدەن ئەمشەو ببمە میوانتان؟ منیش داوای لێبووردنم لێکرد کە ژوورەکە تەنها جێگای یەك کەسی تێدایە و یەك جێگای خەوتنیشی تێدایە... ئەویش ووتی: زۆرجار یەك جێگا، جێگای دوانی تێدا دەبێتەوە؟! لەبەردەم بێشەرمی و هەوڵدانی بۆ ئەوەی بە زۆر بێتە ژوورەوە پاڵمنا بە دەرگاکەوە بە ڕوویدا تا بیکەمە دەرەوە، گوێم لە تەقەی قاچەکانیەوە بوو کە لە مەمەڕەکەدا دەیکێشا بە زەویەکەدا... ووتم: سوپاس بۆ خوا.. ئەمە یەکەمین تاقیکردنەوە بوو.. هەستم بە سەربەرزی و خۆشی کرد، چونکە سەرکەوتم بەسەر دەروونمدا.. دەروونم دەستی کرد بە ڕۆشتن بەو ڕێگادا کە بۆم کێشابوو.. سەید دوای ئەوەی —ڕەحمەتی خوای لێبێت– توشی تاقیکردنەوە و نارەحەتی زۆر هات، بەڵام سەرکەوت بەسەریدا و سەرکەوت بەسەر نەفسی پڕ خراپەکاری!! کاتێ گەشتە ئەمریکا، باسمان بۆ دەکات کە چی بینی و دەڵێ: لە

کاتێکدا لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بووم بە چاوی خۆم راستی ئەم ئایەتەم بینی: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ﴾ سورة الأنعام/ ٤٤.. واتە:﴿ جا کە ئەو نارەحەتی‌و ناخۆشییەیان لە بیر چووەوە، هەر بۆ تاقی کردنەوە دەرگای هەموو خێر و خۆشییەکمان لێ کردنەوەو کەوتنە ئیستیراحەت‌و گەیشتە رادەیەك کە زۆر دڵخۆش‌و شادمان بوون بەو نازو نیعمەتە، کە چی غروور گرتنی‌و روویان نەکردە خودا، ئیتر لە پڕ گرتمانن‌و تووشی بەڵامان کردن، ئەوسا پەنجەی پەشیمانییان ئەگەست‌و خەفەتیان ئەخوارد﴾.. ئەو مەشهەدەی ئەم ئایەتە دەیکێشێت هەموو شتێ لە خێر و خۆشی و رۆزی بەبێ حساب زیادی کردووە، من سەرەڕۆیی ئەو گەلەم دەبینی بەهۆی ئەو خۆشگوزەرانیەی کە تیایدا بوون.. هەستکردنیان کە تەنها ئەوە مافی پیاوی سپی پێستە... و ڕێگای مامەڵەکردنیان لەگەڵ رەگەزەکانی تردا بەشێوەیەکی وەحشیانە و ناشرین... من هەموو ئەوانەم دەبینی و ئەو ئایەتەم دەهاتەوە یاد، سوننەتی خوام دەرك پێ دەکرد..

دوای دوو ساڵ کە سەید لە ئەمریکا بەسەری برد، گەڕایەوە بۆ میسر... بەڵام پیاوێکی تر گەڕایەوە.. پیاوێکی ئیماندار و پابەند و خاوەن پەیام و بانگەواز و ئامانج... بەڕاستی کوشتنەکەشی کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەر دەروونی ئەوانەی کە دەیانناسی و ئاگاداری راستگۆییەکەی بوون، لەوانەش دوو سەرباز کە راسپێردرابوون پاسەوانی بکەن و ئامادەی لەسێدارەدانی بن... یەکێکیان بەسەرهاتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: شتانێك هەن کە ئێمە وێنای ناکەین، کە بەڕاستی گۆڕانی تەواوی بەسەر ژیانماندا هێنا. لە بەندیخانەی جەنگیدا، ئێمە هەموو شەوێ چەند کەسێکمان بۆ دەهات یان چەند کۆمەڵێ لە پیران و گەنج و ئافرەتان.. پێیان دەوتین: ئەمانە ئەو ناپاکانەن کە هاوکاری جولەکەیان کردووە و پێویستە نهێنیەکانیان ئاشکرا بکرێت... تاکە ڕێگاش بۆ ئەوە بە سزادانی سەخت بوو... ئەوەش بەس بوو بۆ ئەوەی بە هەموو جۆرەکانی دارو قەمچی گۆشتەکانیان پارچە پارچە بکەین.. ئێمە ئەو کارەمان دەکرد و دڵنیابووین کە بەڕاستی بەپیرۆزیەوە ئەرکی خۆمان جێبەجێدەکەین... بەڵام زۆری نەبرد خۆمان بینیەوە لەبەردەم شتانێکدا کە نەماندەتوانی لێکی بدەینەوەو تەفسیری بکەین، ئەو کەسانەمان دەبینی ﴿ئەو

خیانەتکارانە﴾ پابەندبوون بە نوێژەکانیانەوە لە شەودا، زمانیان هەمیشە پاراو بوو بە زیکری خوای گەورە تەنانەت لەکاتی نارەحەتیشدا.. بەڵکو هەندێکیان لەژێر زەبری قامچیدا دەمردن.. یان لەکاتی هێرش بردنی سەگە هارەکان بۆیان، لە کاتێکدا بە زیکرو دوعا دەم بەخەندە بوون.. لێرەوە... شك و گومان کەوتە دڵمانەوە... عەقڵ نایبڕێ کە نموونەی ئەو جۆرە کەسە باوەڕدارانە خۆفرۆش بن و هاوکاری دوژمنانی خوای گەورە بکەن.. من و ئەو برایەم بە نهێنی رێکەوتین کە نابێ ئازاریان بدەین تا لە تواناماندا هەبێت... و چەندە لە تواناماندا هەبێت کۆمەکیان بکەین و یارمەتیان بدەین.. و فەزڵی خوای گەورە بەسەرمانەوە ئەوە بوو کە مانەوەمان لەو بەندیخانەدا درێژەی نەکێشا... و دواهەمین ئەرکێ کە پێمان سپێردرا پاسەوانی زیندانێك بوو کە یەکێکیان تیایدا بەند کرابوو، وە بۆیان باس کردبووین کە ئەمەیان لە هەموویان مەترسیدارترە، یان ئەوەیان سەرۆکی هەموویانە و رێکخەری کاروباریانە. کە بەڕاستی ئەوەندە ئەشکەنجە درابوو نەیدەتوانی هەستێتەوە، هەڵیان دەگرت و دەیانبرد بۆ ئەو داداگا سەربازیەی کە چاوەڕوانی دۆسیەکەی دەکرد.. شەوێکیان فەرمان دەرچوو کە ئامادەبکرێت بۆ لەسێدارەدان، یەکێ لە زاناکان ڕۆشت بۆلای!! تا ئامۆژگاری بکات!! بۆ بەرەبەیانی ڕۆژی داهاتوو، من و براکەم هەردوو باڵیمان گرت و بردمان بەرەو ئەو ئۆتۆمبێلە داخراوەی کە پێشتر چەند تاوانبارێکی ترمان بۆ بردبوو.. وە لەمیانی چەند ساتێکی کەمدا بردینیان بۆ شوێنی لەسێدارەدان.. لە دواشمانەوە چەند ئۆتۆمبێلێکی سەربازی هەبوو، کە کۆمەڵێ سەربازیان بەسەرەوە بوو بە چەکەوە بۆ پارێزگاری کردنیان.. لەچاو تروکانێکدا هەر سەربازێك چووە شوێنی دیاریکراوی خۆی تفەنگەکەیی گرت بەدەستەوە، وە بەرپرسەکان لەوێ هەموو شتێکیان ئامادەکردبوو... بەئەندازەی حوکم دراوەکان پەتی لەسێدارەدانیان ئامادە کردبوو.. هەریەکەیان بران بۆ پەتی دیاری کراوی خۆی، پاشان پەتەکانیان خستە گەردنیانەوە، و لەپاڵ هەریەکەیاندا (کەسێك) وەستابوو کە چاوەڕوانی ئاماژەیەکی دەکرد بۆ لابردنی ئەو مێزەی کە لە ژێر پێی حوکمدراوەکەدا بوو.. وە لە ژێر هەر بەیداخێکی رەشدا سەربازێك وەستابوو کە راسپێررابوو بە بەرز کردنەوەی لە ساتی ڕاپەڕاندنی کارەکەدا. ئەوەی کە زۆر هەیبەتدار بوو ئەو ووتانە بوو کە هەموو ئەوانە

که ئامادەکرابوون بۆ مردن لەگەڵ براکانیاندا دەیان وتەوە، مژدەیان بەیەکتری دەدا کە لەبەهەشتی نەبڕاوەدا بەیەك دەگەن. لەگەڵ پێغەمبەر و یارانی، هەموو وتەکانیان بەم هاوارە کاریگەرە کۆتایی دەهات: ﴿ الله اکبر والله الحمد ﴾. لەو ساتە تۆقێنەرە ترسناکەدا گوێمان لە دەنگی ئۆتۆمبیلێکەوە بوو کە نزیك دەبوویەوە، پاشان وەستاو هیچ دەنگێك نەما، دەرگاکەی کرایەوە، و پاشان ئەفسەرێکی پلەدار دابەزی و هاواری کرد لە جەلادەکان: مەجوڵێن لە شوێنی خۆتاندا بن! پاشان هاتە پێشەوە بۆ لای ئەو بەند کراوەی کە لای ئێمە بوو، دوای ئەوەی ئەفسەرەکە فەرمانیدا چاوی بکەنەوە، و پەتەکەی ملیشی لابەرن، بە دەنگێکی هەڵبڕسکاوەوە پێی ووت: براکەم... سەید... من هاتووم و دیاریەکم لە لایەن سەرۆکی بەخشندەمانەوە بۆ هێناویت، یەك ووشە دەڵێیت و واژۆی دەکەیت، پاشان چیت دەوێ داوای بکە بۆ خۆت و بۆ ئەو برایانەت. وە چاوەڕوانی وەڵامی نەکرد، ئەو فایلەی کردەوە کە بەدەستیەوە بوو، ووتی: برام تەنها ئەم ووتەیە بنوسە ﴿من هەڵە بووم و داوای لێبوردن دەکەم....﴾ سەید چاوە ڕوونەکانی بەرز کردەوە، و ڕوخساری سەرەپا خەندەیەك دایگرت کەناتوانین وەسفی بکەین... بە هێمنیەکی سەیرەوە بە ئەفسەرەکەی ووت: ﴿ هەرگیز.... ژیانی تەواو بوو ناکرم بەدرۆیەك کە نابڕێتەوە!﴾ ئەفسەرەکەش بە زمانێك کە پڕبوو لە ماتەمینی.... ووتی: بەڵام سەید ئەوە مردنە. سەیدیش ووتی: ﴿بەخێربێت مردن لە پێناوی خوادا﴾، الله اکبر!! عیززەتی ئیمانیی بەوشێوەیە، بوار نەما بۆ بەردەوام بوون لە پەیڤینەکە.. ئەفسەرەکە فەرمانیدا بە راسپێردراوەکە کە کارەکەی ڕاپەڕێنێت.. ئەوەندەی نەبرد جەستەی سەید -ڕەحمەتی خوای لێبێت- و براکانی لە هەوادا ئەملاولایان دەکرد... و زمانی هەموویان ئەو وشەیان دەوتەوە کەهەرگیز ناتوانین لەبیری بکەین، ﴿ لا إله إلا الله، محمد رسول الله﴾ بەڕاستی ئەو دیمەنە هۆکار بوو بۆ هیدایەتدانمان و جێگیریمان، لە خوای گەورە داواکارین کە جێگیرمانکات ..

لە کتێبی ﴿العائدون إلى الله﴾ محمد المنجد..

## ٦١- ﴿ناصر العمر... هۆكاری هیدایەتدانم بوو﴾

هاوڕێی ئەمجارەمان یەكێكە لە بێناگاكان... لە ئەمریكا دەیخوێند و بەدڵێكی تاریكەوە گەڕایەوە، ڕەشەبای هەواو ئارەزوو شەهەوات هەڵی تەكاندبوو، چرای ئیمانی لەدڵیدا كوژاندبوویەوە... نوكێ خێرو چاكەو ڕێنمایی تیانەهێشتبوو، تا ئەوساتەهات كە تۆوێكی چاك نێژراتیایداو پاشان بەویستی خوا بوو بە ڕووەكێكی باش و بەردار.. ئەو تۆبەكارە دەڵێ: تاقەتی نوێژكردنم نەبوو، كاتێ گوێم لەبانگەوە بوایە و بیوتایە حی علی الصلاه، حی علی الفلاح، بەئۆتۆمبێلەكەم دەردەچوم وەك سەرلێشێواو نەمدەزانی بۆكوێ دەچم هەتا كاتی نوێژكردن تەواو دەبوو پاشان دەگەڕامەوە بۆماڵەوە.. بەتەواوی وەك شەیتان، كاتێ گوێی لەبانگە بۆنوێژ دەرواو ، وەك لەفەرمودەی پیرۆزدا هاتووە... ڕۆژێكیان وەك پیشەی هەمیشەیم وەك سەرگەردان ڕۆشتمە دەرەوە، لەیەكێ لەترافیك لایتەكانی هاتوچۆدا لاوێك لەتەنیشتمەوە وەستا كە ڕوخسار جوان بوو... وە دەنگی مۆسیقای بەرزیش بەشێوەیەكی سەرنج ڕاكێش لەئۆتۆمبێلەكەمەوە بەرز دەبوویەوە.. بەخەندەوە تەماشایەكی كردم و پاشان ووتی: ئەو گۆرانیە چەند خۆشە، ئایا دەتوانم ئەو كاسێتە بخوازم؟... سەرسامبووم بەداواكاریەكەی... بەڵام بەهۆی سەرسام بوونی بەو مۆسیقایەی كەگوێم لێگرتبوو، كاسێتەكەم دەرهێناو هەڵمدا بۆی.. لەوكاتەدا ئەویش كاسێتێكی بۆهەڵدام... لەبری ئەو كاسێتە...و ووتی: گوێ لەم كاسێتە بگرە. كاسێتەكە هی شێخ ناصر العمر بوو، بەناونیشانی ﴿بەختەوەری لەنێوان وەهم و ڕاستەقینەدا﴾. پێشتر ناوی ئەو مەلایەم نەبیستبوو.. بەخۆمم ووت: لەوانەیە هونەرمەندێكی بەناوبانگ بێت، خەریك بوو كاسێتەكە لەجامەكەوە فرێدەمە دەرەوە.. بەڵام، لەبەرئەوەی بێتاقەت بووبووم لە گوێگرتن لەو كاسێتانەی كەلەئۆتۆمبێلەكەمدا بوو، ووتم: باگوێ لەم كاسێتە بگرم، بەڵكو سەرسام ببم پێی.. مامۆستاكە دەستی كرد بەقسەكردن.. سوپاس و ستایشی خوای گەورەی كرد... پاشان سڵاواتی دا لە پێغەمبەرەكەی (د.خ) كەمێك بێدەنگ بوو، پاشان مامۆستاكە باسی چەند كەسانێكی كرد كەمن لەو باوەڕەدا بووم كەلەوپەڕی بەختەوەریدان، بەڵام ئەو بە بەڵگەوە دەیسەلماند كەلەوپەڕی ناخۆشی و پەژارەدان.. من زۆر هۆگر بوم بۆ گوێگرتن لەو

چیرۆکە... نیوەی کاسێتەکە تەواو بوو، پرسیارێك هات بەمێشکمدا، کەوەلاَمیم نەدەزانی: کەواتە ڕێگای ڕاستەقینە بۆ بەختەوەری کامەیە!!. بەلاَم وەلاَمەکە لەبەشەکەی تری کاسێتەکەدا بەڕوونی دیاربووە ناتوانم ئەوەی کەمامۆستاکە باسی کرد –خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە– کورتی بکەمەوە، دەتوانن خۆتان ڕاستەوخۆ گوێچ لە کاسێتەکە بگرن.. لەو ڕۆژەوە دەستم کرد بەگەڕان بەدوای کاسێتەکانی ناصر العمر، شایانی باسە کەلەو هەفتەیەدا گوێم لە دە وانەو موحازەرەکانی ئەو مامۆستا بەڕێزە گرت.. وەلەکاتی سەردانمدا بۆ تۆمارگا ئیسلامیەکان، ئاگاداری کۆمەڵێ زۆرێك لەزانانو بانگخواز و مامۆستایان بووم – کەسوپاس بۆخوا زۆر زۆر بوون کەناتوانم بیانژمێرم– منیش بەردەوام دەگەڕام بەدوای ووتاری نوێی زۆربەیان، وە سووربووم لەسەر ئامادەبوون لە موحازەرەو وانەکانیان... هەموو ئەمانە هێشتا بەڕاستەقینەیی زۆر پابەند نەبووم... وەدوای نزیکەی چوار مانگ لەموتابەعەی لێبڕاوانە بۆ ئەو کاسێتانە، خوای گەورە ڕێنمایی کردم.

## ٦٢- ﴿حەجاج و تاوسی کوڕی کیسان﴾

(تاوسی کوڕی کیسان) کە یەکێ بوو لە قوتابیە بەڕێزەکانی ﴿إبن عباس﴾ کە یەکێکە لە ڕاویەکانی بوخاری و موسلیم، دەڵێ: چومە (بیت الله الحرام) تا عەمرە بکەم، ووتی: کاتێ عەمرەم دەکرد لە ﴿المقام﴾ دوای ئەوەی کە دوو ڕکات نوێژم کرد، لامکردەوە بەلای خەڵکەکەو بەلای ﴿البیت﴾دا، کۆمەڵێ خەڵکم بینی بە چەك و شمشێر و قەڵغانەوە، لامکردەوە حەجاجی کوڕی یوسفم بینی... ئەمیری خوێنڕێژ!! تاوس دەڵێ: ڕم بەدەسەکانم بینی منیش لەشوێنی خۆم دانیشتم، کاتێ کە دانیشتبووم، پیاوێکم بینی کە خەڵکی یەمەن بوو، هەژار و خواناس بوو، هات و تەوافی کرد و پاشان نزیك بوویەوە تا دوو ڕکات نوێژ بکات، پۆشاکەکەی پێچرا لە ڕمێك لە ڕمەکانی سەربازەکانی حەجاج، حەربەکە کێشای بە حەجاجدا، حەجاجیش وەستانی و ووتی: تۆ کێیت؟

ووتی: موسلیم.

ووتی: لەکوێوە هاتویت؟

ووتی: لەیەمەنەوە.

ووتی: حاڵی براکەم چۆنە؟ ﴿مەبەستی برا زاڵمەکەی بوو وەك خۆی: کەناوی محمدی کوڕی یوسف بوو﴾

پیاوەکە ووتی: کە هاتم و بەجێم هێشت قەڵە و و ورگ زل بوو!

حەجاجیش ووتی: من سەبارەت بە تەندروستی ئەو پرسیارم نەکرد، بەڵکو سەبارەت بە دادپەروەریەکەی پرسیارم کرد؟

پیاوەکە ووتی: کە بەجێم هێشت زاڵم و ستەمکار بوو!

حەجاج ووتی: ئایا نازانی ئەو برای منە!

پیاوەکە ووتی: ئەی تۆ کێیت؟

حەجاج ووتی: من حەجاجی کوڕی یوسفم..

پیاوەکە ووتی: ئایا وا گومان دەبەیت ئەو شانازی بە تۆوە دەکات زیاتر لە شانازی کردنی من بەخوای گەورە؟!؟!

تاوس ووتی: هەرچی موی سەرم هەبوو هەموی ڕێك ڕاوەستان!

ووتی: حەجاج وازی لێهێناو ڕۆشت!!!!

بۆچی؟ چونکە ئەو پیاوە تەنها و تەنها پشتی بە خوای گەورە بەستبوو. ﴿فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ(٦٤)﴾یوسف..{خوا باشترینی پارێزگارانە و هەر ئەو زاتەش بەبەزەیترینی بەبەزەییانە}.

## ٦٣- ﴿بەراوردی سەخت؟﴾

لەوەتەی مانای ژیانی زانیوە، بێجگە لەو کەس ناناسێ، ئەویش مێردەکەیەتی کە خۆشەویستە لەلای و پێش هەموو شتێ ئامۆزاشیەتی... ئەوە هەڵبژاردنی کاس و کاری و هەروەها خۆیشی بوو.. بەبێ دوو دڵی رازی بوو پێی.. ڕازی بوو لە کاتێکدا کە هێشتا خوێندکارە و خەرجی لە باوکیەوە وەردەگرێ.. هاوسەرگیریان کرد، و چاوەڕوانی نەکرد و بردی بۆ ئەمریکا بۆ وڵاتی سەربەستی و خەونەکان، وەك چۆن واگومانی دەبرد، تا خوێندن تەواو بکات لەوێ... ورده ورده خێزانی وازی لە بالاپۆشی هێنا، هەوا یاری بەقژی دەکرد، مێردەکەشی ڕێگای لێ نەگرت... بەڵکو بۆچی ڕێگای لێبگرێت؟! چونکە رازی نابێت لە وڵاتێکی ئاوا پێشکەوتوودا پێی بوترێت تۆ کۆنەپەرستیت.. ئەحمەد بوو بە خاوەنی منداڵی یەکەم، پارسەنگی ژیانی گۆڕین، کە خۆشیی یەکەمیان بوو، هەمووکاتی ژنەکەی گرتبوو... وورده وورده هەستی بە بێتاقەتی دەکرد کاتێ کە باوکی ئەحمەد سەرقاڵی خوێندنەکەیەتی.. کاروباری زۆر گۆڕا، کاتێ ئاشنابوو بە دایکی عەلی.. ئافرەتێکی بالاپۆشی خاوەن رەوشت و ئاین بوو.. رۆژگاری غەریبی کۆیکردبوونەوە، غەمە بچوکەکانی هاوبەش بوون، مێرد و منداڵ، دایکی عومەریش منداڵێکی هەبوو... ﴿باوکی ئەحمەد﴾ دڵنیا بوو لەو پەیوەندیەی کە وورده وورده گەشەی دەکرد لەنێوان ژنەکەی و ژنی هاوڕێ خۆشەویستەکەیدا... ئەو دوو ژنە پێکەوە دەچونە دەریشەوە بۆ بازاڕ... دایکی ئەحمەد لە سەرەتادا گوێی نەدەدایە کە لەکاتی چونەدەرەوەدا چی لەبەر دەکات، وورده وورده هەستی دەکرد کە دایکی عومەر چەندە گرنگی بە بالا پۆشیەکەی خۆی دەدات و مامەڵەی لەگەڵ فرۆشیارەکان لە سنورێکی تەسکدا بوو... ئەوە وایکردبوو کە زیاتر رێزی لێ بگرێت، هەستی بە جیاوازی نێوانیان کرد، وورده وورده بە چاوێکی تر تەماشای دایکی عومەری دەکرد..

– دەی، دایکی عومەر، دواکەوتین...

لە ژوورەکەیەوە هاواری دەکرد..

– چەند ساتێکی کەم و ئەوە تەواو.

لەکۆتاییدا دایکی ئەحمەد دەرکەوت، ئێستا ئەو ئامادەیە بۆ رۆشتن بۆ نان خواردنی

ئێوارە، باوکی ئەحمەد بە وردی تەماشای کرد...

- بۆ وا تەماشام دەکەیت؟! دەڵێی بۆ یەکەم جارە دەمبینی!.
- بە دڵنیاییەوە تۆ دایکی ﴿ئەحمەد﴾یت.
- نەء ،دایکی سوڵتان!!!!!

کەمێك پێکەنی.

- ئەم مۆدێلە نوێیە چییە؟!
- مۆدێل!! ئەمە حیجابی منە و مۆدێل نیە.
- ئایا دایکی عومەر هیچی پێ وتویت؟! ئایا رەخنەی لە پۆشاکەکانت گرت.. لە رواڵەتت؟!
- نەخێر.. نەخێر هەرگیز شتی وا نەبووە، رۆژێ لەرۆژان شتی وای پێ نەوتوم، بەڵکو ئەو خاوەنی ئەدەب و ئەخلاقێکی زۆر بەرزە..

بەسەرسامیەوە وەڵامی دایەوە...

- دەی کەواتە مەسەلە چیە؟! ﴿پاشان ووتی﴾ من تورە نابم کاتێ کە لای بەریت، کۆتا وشەی تەواو نەکرد فرمێسك بە رووومەتەکانیدا هاتە خوارەوە، لوتی سووربوویەوە، ئەمە یەکەمجارە فرمێسکی ژنەکەی ببینێت لەو کاتەوەی بووە بە هاوسەری، هەوڵیدا تەدارەکی هەڵوێستەکە بکات و، پێی ووت:
- ئازیزم... بۆچی گریان؟! ئایا بێزارم کردیت؟! بە وشەکانم بێتاقەتم کردیت؟!

بە نەخێر سەری راوەشاند...

- دەی کەواتە ئەو فرمێسکانە بۆچی؟!

بۆ یەکەمین جار بوو باوکی ئەحمەد هەستی کرد کە مریەمی خێزانی بچوکە، ئەو هێشتا ١٨ ساڵی تێنەپەڕاندبوو، گریانی ئەحمەد بیرکردنەوەکەی پچڕاند، مریەم فرمێسکەکانی سڕی و کوڕەکەی لە باوەش کرد و هەوڵی دەدا ژێری بکاتەوە... دوای هێور بوونەوەی ئەحمەد.. پێی ووت:

- ئایا ئێستا دەتوانم بزانم هۆکاری ئەو فرمێسکانەت چی بوو؟

ژنەکەی سەری بەرزنەکردەوە، بە هێواشی و لەسەرخۆ ووتی...

+ ئەوە هۆکاری تووڕە نەبوونتە.

مێردەکەی سەرسام بوو ووتی...

- سبحان الله! دەگریت بەهۆی تورە نەبوونمەوە!.

ساتێك بێدەنگی تێپەڕی و پاشان بە سوعبەتەوە هەوڵیدا کەش و هەواکە خۆش بکات و ووتی...

- چیت دەکرد ئەگەر تورە ببومایە؟!

وەڵامی نەدامەوە.

- مریەم. بە ڕاشکاوانە پێم بڵێ... چیتە؟!

- کارەکە تەنها ئەوەیە کە من لە پڕ ئاگادار بوومەوە لەوەی کە زۆر بێئاگام لەشتێك لەو کاتەوەی هاتوینەتە ئێرە.

- بێئاگا!! بێئاگا لەچی!! مریەم تۆ منت فەرامۆش نەکردووە تا ئەو قسانە بکەیت... هەستم بە کەمتەرخەمی تۆ نەکردووە... تۆ بەباشترین شێوە هەڵدەستی بە ئەرکەکانی خۆت..

- ئازیزم... مەبەستم ئەوە نیە.

- دەی کەواتە مەبەستت چیە؟! دەمەوێ تێبگەم.

- عەلی، ئایا قورئانی پیرۆزمان لە گەڵ خۆماندا هێنا؟!

بە ڕاڕاییەوە ووتی: پێموایە، بەڵێ.

- ئەی کوا؟!

- لە یادم نیە، لەوانەیە لە دۆڵابەکە یان کتێبخانەکە.. یان لەناو جانتادا بێت..

نزیکەی یەك سەعاتی تەواو لە شوقەکەدا دەگەڕان بەدوای قورئانەکەدا تا عەلی دۆزیەوە..

- ئەوەتا.. بینیمەوە..

کاتێ نزیك بوویەوە لێی تا دەستی لێ بدات.. ژنەکەی هاواری کرد:

- بوەستە، دەستی لێ نەیەیت.

- بۆچی؟!

- ئایا دەستنوێژت هەیە؟!

- کاتێ گوێی لە پرسیارەکەیەوە بوو، دەستی دوور خستەوە لێی، بەڵام

خێزانی هەڵی گرت، و تەپوتۆزەکەی سەری سڕی و ووتی: مەترسە من دەستنوێژم هەیە.

پاشان ووتی:

- لەساتی گەیشتنمانەوە بۆ ئێرە، من هەست دەکەم کە مرۆڤێکی ترم، نەك ئەو مریەمەی کە ناسیبووم، لە گەڵ ئاسودەییم لەگەڵتدا، بەڵام هەستم بە بۆشاییەك دەکرد کە ڕۆحمی داگیر کردبوو، تەنانەت دوای لەدایك بوونی ئەحمەدیش، ئەو هەستە لێم نەدەبووەوە.. بەڵام کاتێ ئاشنابووم بە ﴿دایکی عومەر﴾ دەرکم بە نهێنی ئەو بۆشاییە و ئەو بێتاقەتە رۆحیە کرد کە سەراپای داگیرکردبووم.. کە بەراستی ئەوەش بریتی بوو لە ﴿دووری لەخوای گەورە﴾...

مێردەکەی واقی ورما بوو، بڕوای نەدەکرد کە ئەو کەسەی کە ئەو قسانە دەکات ژنەکەی بێت.. وشەکانی ئەمی تاساندبوو، بە تەواوی گوێی بۆ شل کردبوو..

- عەلی لەو کاتەوەی هاتوین بۆ ئێرە، گرنگی بە نوێژ نادەین، قورئانمان فەرامۆش کردووە، عاباکەشم فڕێ داوە.. ئەم شتانە بە نیسبەت من و تۆوە شتێکی ئاساییە، ئەو ئافرەتە هیچ رۆژێ ئاوانەبووە.. جارێکیان دایکی عومەر بردمی بۆلای یەکێ لە خوشکە ئەمریکیە موسڵمانەکان نازانیت عەلی کەچەندە هەستم بەشەرم و تەریق بونەوە کرد لە بەردەمیدا!! بەڕاستی جیاوازی نێوانمان زۆر بوو، کە بوار نیە لە بەردەممان‌دا بەراوردی بکەین، عەلی تەماشایەکی کرد، بەڵام ئەمجارەیان تەماشاکردنەکەی جیاواز بوو... هەستایەوە، مریەم لێی پرسی.

- بۆ کوێ؟!

- دەستنوێژ دەگرم تا نوێژ بکەم، بەڵکو خوای گەورە لەو ساڵانەم خۆش ببێت کە بەبێ هودە لەم غەریبییەدا بەسەرم بردووە..

فرمێسکێکی گەرم کەوتە خوارەوە و حیجابە نوێیەکەی تەڕ کرد، و هەر دەیوت – سوپاس بۆ خوا... سوپاس بۆ خوا... ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ(٤٠)﴾ إبراهيم.. واتە: ﴿) ئەی پەروەردگارەکەم! خۆم و منداڵەکانم لە

نوێژخوێنان دابنێ ، ئەی پەروەردگارم! هاوارو دوعاکەم قەبووڵ بکە﴾.

﴿رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ(٨)﴾آل عمران. واتە: ﴿ئەی پەروەردگارمان دڵمان لامەدە (لە ڕێی ڕاست) دوای ئەوەی کە ڕێنموونیت کردین، وە پێمان ببەخشە لە لای خۆتەوە میهرەبانییەك، بە ڕاستی هەر تۆیت بەخشندەی﴾.

## ٦٤- ﴿ئەم پیاوە زۆر سەیرە﴾

لە کۆلێژی سەربازی هاوڕێم بوو... لە هەموو شتێکدا لە ناو هاوەڵەکانیدا یەکەم بوو، لە خواپەرستیدا، لە ڕەوشت جوانیدا، لە خوێندنەکەیدا... لە مامەڵەکردنیدا... شەوانە هەڵدەستا و پارێزگاری نوێژەکانی بەیانی و نوێژەکانی تری دەکرد، و خەڵکی خۆشدەویست.. دوای ئەوەی خوێندنی تەواو کرد، دڵخۆش بوو وەك چۆن خوێندکار دڵخۆش دەبێت بە دەرچوون.. توشی نەخۆشی ﴿ئەنفلۆنزا﴾بوو، نەخۆشیەکەی تەشەنەی سەند هەتا کاریکردە سەر بڕبڕەی پشتی، توشی ئیفلیجیەکی تەواو بوو، نەیدەتوانی جوڵە بکات.. تەنانەت پزیشکەکەی کە چارەسەری دەکرد پێی ووتم: بە پێی پێشبینیەکانی ئومێد نیە لە چاکبوونەوەیدا... و ئەگەری گەڕانەوەی بۆ باری پێشووی و سودی چارەسەرەکان لەگەڵیدا ١٠٪ تێپەڕ ناکات.. منیش ووتم: سوپاس بۆخوا لەسەرهەموو بارودۆخێك، داوام لە خوای گەورە کرد کە شیفای بۆ بنێرێ، چونکە ئەو بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا.. پاشان سەردانیم کرد لە نەخۆشخانە، کە لەسەر جێگایەکی سپی ڕاکشابوو، من ویستم دڵخۆشی بدەمەوە و خوای گەورە بینمەوە یادی و دوعای بۆ بکەم، بەڵام ئەو باسی یادی خوای بۆ دەکردم!! و دڵخۆشی دەدامەوە... بینیم روخساری پڕبوو لەڕووناکی! و گەشانەوەی ئیمان.

من وام دەبینی، هەر خوای گەورە خۆی ئاگادارە، پێم ووت: سوپاس بۆ خوا، خوای گەورە شیفات بدات، و لەخوای گەورە داواکارم شیفای پاك و خێرات بۆ بنێرێ پشت بەخوا... ئەویش بە سوپاس و دوعا وەڵامی دامەوە پاشان وشەیەکی سەیری ووت لەو حاڵەتە ناخۆشەدا، بەڵێ وشەیەکی سەیر بوو!! ناشوکر نەبوو، بێزار نەبوو!! نەیوت: ئەوەتا دەبینی خالید چیم بەسەر هاتووە!! بەڵکو ئەو وشەیەی ووت کە دای لە گوێم و کاریکردە سەر دڵم، کە تائێستاش لەبەرم کردووە... دەزاری دەم بەخەندەوە ﴿خوای گەورە بیپارێزێ﴾ ووتی: {لەوانەیە خوای گەورە ئاگاداری کەمتەرخەمی من بوو بێت لە لەبەرکردنی قورئاندا، لەبەرئەوە منی بێتوانا کرد، تا بمپەرژێت و یەکلا ببمەوەو قورئان لەبەربکەم..}.

ئەمەش نیعمەتێکە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە!! سبحان الله.. ئەو قسانە چین؟! ئەو وشانە لەکوێوە هاتوون.. چۆن مەینەتی گۆڕا بۆ نیعمەت و ڕۆزیی.. بەڕاستی ئەوە

باوەڕ و ئیمانە کە موعجیزە دەسازێنێ دوای فەزڵ و یارمەتی خوای گەورە... و خوای گەورە راستی فەرمووە لە پاداشتی ئەو کەسەی کە ئارام دەگرێ و دەڵێ ﴿إنا لله وإنا إليه راجعون﴾ سێ خەڵاتی هەیە.. خوای گەورە فەرمویەتی ﴿أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ(١٥٧)﴾ البقرە/١٥٧. واتە: ﴿ئەوانە درووددو بەخششی خوای خۆیانیان لەسەرە، وە هەر ئەوانن ڕێ نمونیی کەر﴾.

بەڵێ ئەوە ڕەحمەتە لە خواوە و ستایشە لە وادە و ڕینمونیە بۆ ڕێگای راست و جێگیر بوون لەسەر بەرنامە بەهێزەکەی پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: (( عَجَباً لأمْرِ المُؤمنِ إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ لَهُ خيرٌ ولَيسَ ذلِكَ لأحَدٍ إلاَّ للمُؤمِن : إنْ أصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكانَ خيراً لَــهُ ، وإنْ أصَابَتْهُ ضرَاءُ صَبَرَ فَكانَ خَيْراً لَهُ )) رواه مسلم .

. واتە: ﴿ سەیرە کاری موسڵمان، بە راستی هەموو کارەکانی خێر و چاکەیە بۆی، و ئەوە بۆ هیچ کەسی تر نیە بێجگە لە ئیماندار: ئەگەر توشی خۆشی بوو، سوپاسگوزار بوو، ئەوە خێر و چاکەیە بۆی، و ئەگەر توشی ناخۆشی بوو، ئارامی گرت، ئەوە خێر و چاکەیە بۆی ﴾.

ئەو وتانەی کە وتی چەندە جوان بوون.. بەخوا ئەو وشانە یەکسانن بە دەیان ووتەی تیۆری و سەرزارەکی... چونکە هەڵوێستە ئیمانیەکان مرۆڤ پەروەردە دەکات و فێری شتی زۆری دەکات... بەڵێ سەرسام بووم لەو هەڵوێستە ئیمانیەیی و ئارامگرتنی و جێگیریەکەی، هەرچەندە نەخۆشیەکی مەترسیدار و ئیفلیجیەکی تەواوی هەبوو.. هەرچەندە شەش مانگ تێنەپەڕیبوو بەسەر دەرچوونی لە زانکۆ، و ڕۆژێ لە ڕۆژان دڵی خۆش نەبوو بە پلەوپایە و موچە و کاری نوێ... تەنها خەمی ئیمانی هەبوو.. سوپاسی خوای گەورەم کرد کە لەناو ئەم نەتەوەیەدا نموونەی ئەو جۆرە پیاوانەی تێدایە.. سوپاس بۆ خوا نەتەوەی محمد (د.خ) خێردارە... پاشان پاش ماوەیەك سەردانم کرد و هەندێ لە هاوڕێکانی لەوێ بوون، سڵاوم لێکرد و دوعای خێرم بۆکرد.. پاشان شتێکی سەیرم بینی... وتانێکم بیست لێی کە جارێکی تر سەرسامیان کردم... لە هەر سەردانێکیدا بەهۆی هەڵوێستە سەیرە ئیمانیەکەیەوە ئیمان و باوەڕ بتەوتر دەبوون و زیادی دەکرد... ووتی: {من شەرم دەکەم لەخوای گەورە کە پەلە بکەم لەشیفاو چاك بوونەوە، ئەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت

و شیفای نوسیبێت بۆم ئەوە سوپاسی خوا دەکەم، و ئەگەر واش نەبێت ئەوە هەر سوپاسی خوای گەورە دەکەم.. خوا زاناترە کە چیی خێری تێدایە بۆ من... لەوانەیە چاك بوونەوەم، عاقیبەتێکی خراپی هەبێت... و لەوانەیە بەم پێیانەم بەرەو کاری حەرام هەنگاو بنێم.. بەڵام داواکارم لەخوای گەورە خێرم بۆ بنوسێت، هەر ئەو زاناو دانایە...}، وە ئەم قسە ئیمانیانەی هیچ لێدوانێ هەڵناگرێ بێجگە لە خێر و چاکە خوای گەورە کە دەفەرموێ ﴿وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ(٢١٦)﴾ البقرة. واتە: ﴿ئەگونجێ شتێکتان پێ ناخۆش بێ‌و باش بێ بۆ تان، و ئەگونجێ شتێکتان پێ خۆش بێ‌و خراپ بێ بۆتان، وە خوا (چاکیی‌و خراپیی ئێوە) ئەزانێ‌و ئێوە نایزانن﴾....

پزیشکەکە بەردەوام بوو ووتی: سەفەرم کرد بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا، پاشان دوای سێ مانگ گەڕامەوە، من وام چاوەڕوان دەکرد کە لەماڵەوەیە و هیچ ئومێدێك نیە بۆ چاك بوونەوەی، و لەماڵەکەیدا هەر لەسەر جێگا دەمێنێتەوە،و هەڵی دەگرن لەم شوێن بۆ ئەو شوێن.. لە هاوڕێکانم پرسی لە نەخۆشخانە ئایا ئەو نەخۆشە دەرچووە؟! و باری تەندروستی چۆنە؟! ووتیان: ئەو پیاوە زۆر سەیرە.. بە ڕاستی ئیرادەو توانایەکی مەزنی هەیە و هەمیشە دەم بەخەندەیە و ڕازیە بە بەشی خوای گەورە.... باری تەندروستی کەمێك باش بووە.. بۆیە گوازراوەتەوە بۆ ڕاهێنانەوەی چارەسەری سروشتی... منیش ڕۆشتم بۆ سەنتەری ڕاهێنانەوە بینیم لەسەر کورسی کەمئەندامان دانیشتووە، دڵخۆش بووم بە بینینی و ووتم: سوپاس بۆ خوا... بۆ چاك بوونەوە سوپاس بۆخوا ئێستە دەتوانی لە پێشتر باشتر بیت و زیاتر بجوڵێیت... پێی بڕیم و ووتی: سوپاسی خوا دەکەم... مژدەبێت کە بەتەواوی هەموو قورئانم لەبەر کرد!! منیش ووتم: سبحان الله!! ئەم پیاوە چەند سەیرە... سەردانێکم نەکردوو تا سودێکی ئیمانیم دەست نەکەوێت.. دوعای خێرم بۆ کرد.. جارێکی تر سەفەرم کردەوە نزیکەی ٤ مانگم پێ چوو... کاتێ گەڕامەوە، شتێك ڕوویدا بوو کە هەرگیز بەبیر و هۆشی لاواز و هەژاری مندا نەدەهات، بەڵام ئەوکارە هەرگیز سەیر و نامۆ نیە لەبەردەم دەسەڵاتی خوای گەورەدا، کاتێك ئەو زاتە بەتوانایە ئێسکی ورد و خاش دەژێنێتەوە ﴿يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ(٧٨)﴾ یس... ئایا دەزانن چی ڕوویدا؟! من نوێژم

دەکرد لە مزگەتی نەخۆشخانەکەدا. پیاوێك بانگی کردم و ووتی: ئەی ﴿باوکی محمد﴾. ئایا دەزانن کێ بوو؟! هاوڕێکەمان بوو... بەڵێ بەخوا ئەو هاوڕێ ئازیزە بوو، کە بەتەواوی ئیفلیجی ناو جێگا بوو، بانگی کردم و بەپێی خۆی دەڕۆشت بەڕێوە، بە تەندروستیەکی زۆر باشەوە.. بەڵێ ئەوەیە دەسەڵات و توانای خوای گەورە.. پاشان ئیمان و باوەڕی موسڵمان موعجیزە دەسازێنێ.. خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ(١٩)﴾الجاثية. ﴿وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ(٦٨)﴾ آل عمران... واتە: ﴿ خوا دۆستی تەقواداران و باوەڕدارانە﴾، وە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا(٢)﴾الطلاق. واتە: ﴿ئەوەی لەخواترس بێت و تەقوای خوای هەبێت، خوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە بۆ ڕزگار بوون﴾ بەڵێ ئەوە ڕزگار بوون و چاك بونەوەیە لەلایەن خواوە بۆ باوەڕداران.. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ(٢٢)﴾یوسف. واتە: ﴿بەو شێوەیە چاکەکاران پاداشت دەکەین﴾.. بەڵێ.. بەپێی خۆی هات بۆلام.. سڵاوم لێکرد و نام بە سینگمەوە.. دەستم کرد بەگریان، بەڵێ دوو جار و بۆ دووشت گریام.. یەکەمیان: گریام بەهۆی دڵخۆشیمەوە کە خوای گەورە شیفای بۆ ناردووە.. خۆشیی سەراپای داگیر کرد بووم، تا ئەو ئەندازەیەی لە خۆشیاندا دەگریام.. دووەمیش: بۆ خود و دەروونی هەژار و لاوازی خۆم دەگریام... ئەبێ چەند کەس لە ئێمە لە خۆشی و ناز و نیعمەتدا بێت و سوپاسی خوای لەسەر ناکەین و هەوڵ نادەین بۆ قورئان خوێندن و لەبەرکردنی و ئەنجامدانی کردەوەی چاك، هەموومان کەمتەرخەمین و دوای دەخەین.. داواکارم لەخوای گەورە بمانبورێ و لەگوناه و تاوانەکانمان خۆش ببێت.. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو خوای گەورە چەندین دەرووی تری لێکردەوە.. لەوانە، ڕازیی بوونی بەرپرسان بۆ ناردنی بۆ خوێندن لە زانکۆی مەلیك سعود لەشاری ﴿ریاض﴾ بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا.. ئەو خوێندنەش بەسەرهاتێك بوو بۆ خۆی... چونکە هەر لە کاتی تەواوکردنی کۆلێژەوە ئەو داواکاریەی کردبوو، بەڵام ڕەزامەندی لەسەر نەدرابوو... وە پێش چەند ڕۆژێك...و دوای چاك بوونەوەی سوپاس بۆ خوا، ڕەزامەندی درا لەسەری، دوای ئەوەی کە خۆی لەبیری کردبوو، پاشان پێی ووتم: بەڕێز دکتۆر خالید، ئەمەی کە بەسەر مندا ڕوویدا، بەڵگەیە لەسەرم ئەگەر هەڵنەستم بە سوپاسی ئەو نیعمەتانە.. منیش ووتم: بەڵکو

بەڵگەیە بەسەر هەموومانەوە، چیرۆکەکە هێشتا کۆتایی نەهاتووە... پاش حەوت ساڵ سەردانی کردم، کاتێ باپیری نەخۆشی هێنابوو، کە نەخۆشی دڵی هەبوو... چیم بینی؟! لاوێکی نورانیم بینی کە خوای گەورە پلەوپایەی بەرزکردبوویەوە... تا گەشتبووە پلەی ﴿رائید﴾.. منیش داواکارم لە خوای گەورە کە بەڕاستی بیکاتە ﴿رائید﴾ پێشەنگ لە خەیرو سود و چاکسازیدا و [illegible]دمەندبێت بۆ هەموو موسڵمانان، بەڕاستی خوای گەورە بیسەرو وەڵامدەرەوەیە.

لەکتێبی ﴿قصص واقعیە﴾ د. ﴿خالد الجبیر﴾...

## ٦٥- ﴿تەوبەی شێخ أحمد القطان﴾

شێخ أحمد القطان لە بانگخوازە بەناوبانگەکان و وتاربێژە ناسراوەکانە... بەسەرهاتی تەوبەی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بەڕاستی لەژیاندا ئەزمون و پەند و وانەی زۆر هەیە... لە قۆناغی خوێندندا ڕەت بووم بە حاڵەتێکی دەروونی سەیردا، لە قوتابخانەکانی پەروەردەدا پەروەردەی ئیسلامیم خوێند بە درێژایی هەژدە ساڵ، بەڵام کەسێکی بێ دین دەرچووم... بە لای ڕاست و چەپدا لام دەکردەوە: کوا ڕێگاکە؟ ئایا بەم شێوەیە من دروستکراوم بۆ ژیانێکی بێهودە و بێمانا؟ هەستم بە بۆشایی و تاریکی و بێتاقەتی دەکرد لە دەروونمدا... بەدوای دەرویەکدا دەگەڕام، دەچوومە تاریکیەوە تا سوکناییم بۆ بێت، بەڵام بە دڵشکاوی دەگەڕامەوە.. پەیمانگای مامۆستایانم تەواوکرد لە ساڵی ١٩٦٩ز دا.. لەو ساڵەدا و لە ساڵی پێشوودا، لە ژیانمدا ڕووداوێکی سەیر ڕوویدا، کە تاریکی و تارمایی کەڵەکە بوون، ئەویش ئەوە بوو حیزبی شیوعی کاری تێکردم و شیعرەکانم لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانیاندا بڵاودەبوویەوە... و فوی تێدەکرا... وشە و دەستەواژەکانیان بە ڕازاوەیی ڕاڤە دەکرد، ئەوەندە فویان تێدەکرد، تا ئەو ئەندازەیەی وام گومان دەبرد کە منم پێشەوای چاوەڕوانکراو... هەر وشەیەکم دەوت دەیانڕازاندەوە و هانیان دەدام لەسەری.. کە ئەوەش فێڵێك بوو لە فێڵەکانیان.. ئەگەر بیانەوێ کەسێك رابکێشن و ببێتە نامانجیان، تەماشای ناسنامە و حەزەکانی دەکەن، ئایا حەزی لە چیە، پاشان لەو دەرگایەوە دەڕۆنە ناخیەوە.. منیان بینی حەزم لە شیعر و ئەدەبە، بۆیە بەڵێنیان پێدام دیوانەکەم چاپ بکەن و شیعرەکانیشم بڵاوبکەنەوە، و کۆڕ و لیدوانی ئەدەبی شەوانەیان بۆ دەبەستم... پاشان دەستیان دەکرد بە ژەهر پێدان... منیان دەبرد بۆ کتێبخانە تایبەتەکان و پاشان دەیانوت: چ کتێبێکت دەوێ هەڵی بژێرە بەبێ پارە، منیش کتێبی گرانبەهام هەڵدەگرت..و چاپی ڕازاوە و سەرنج ڕاکێش لە کتێبەکانی ﴿بنەماکانی فەلسەفەی مارکسی﴾ و ﴿بنەماکانی شیوعیەت﴾ بەو شێوەیە وردە وردە منیان دەبرد بۆ قاوەخانە میلیەکان، منیش دادەنیشتم لە سەر مێزێکی کۆنی لەرزۆك... چایم لە کوپی کۆندا دەخواردەوە و کریکارانیش بە دەورمەوە بوون... لەوکاتەدا پیاوێك ڕەت بوو بە ئۆتۆمبیلە ئەمریکیە کەشخەکەیەوە وتیان: تەماشاکە،

ئەو پیاوە سواری ئەو ئۆتۆمبێلە بووە لەسەر خوێنی باوباپیری تۆ... رۆژێکیش دێت کە تۆ لێی وەربگریتەوە بە شۆڕشێکی گەورە، کە دەستی پێکردووە و بەردەوامیش دەبێت... ئێمە ئێستە ئامادەباشی بۆ دەکەین و کاری بۆ دەکەین لە ﴿ظفار﴾، و ئامادەباشی بۆ دەکەین لە ﴿کوێت﴾و کاری بۆدەکەین، و تۆش دەبیتە سەرکردەیەك لە سەرکردەکانی، کاتێ من گوێم لەو قسانەوە دەبوو، هەستم دەکرد کە بۆشایی ناو دڵم تێکەڵ بەشتێ دەبێ، چونکە ئەگەر دڵت سەرقاڵ نەکەیت بە خواوە ئەوە شەیتان سەرقاڵی دەکات.. دڵ وەك ئاش وایە... دەسوڕێتەوە... ئەگەر گەنمێکی پاکی تێبکرێ ئەوە ئاردێکی پاکت بۆ دەردەکات، و ئەگەر بەردی تێبکەیت ئەوە بەردت بۆ دەردەکات.. قەدەری خوای گەورە وابوو –دوای سێ مانگ– کە چاومان بکەوێت بە سەرۆکی شانەکە، کە چووبوو بۆ میسر، مانگێك دیار نەمابوو، پاشان گەڕابوویەوە.. لەو شەوەدا، گاڵتەیان دەکرد بە بانگی بەیانی... دانیشتنەکە لە شەوەوە تا بەرەبەیانی خایاند، بە وشانێك قسەیان دەکرد لێی تێنەدەگەشتم، ﴿ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو﴾ ﴿سۆشیالیزم و شیوعیەت لە ڕەگەز و ماڵ و ساماندا﴾ پاشان وشانێکیان دەوت، منیش دەمبرد بەناو فیترەتی پاکمدا، کە ڕەت نەدەبوو پیایدا... دەمەویست موناقەشەی بکەم، بەڵام شەرم رێی لێ دەگرتم کە موناقەشەی بکەم.. منیان داناوە بە بیریار... ئەدیب... شاعیر... دانەر. چۆن بوێرم موناقەشەیان بکەم، بۆیە بێدەنگ دەبووم.. تا گەشتە ئەو ڕادەیەی کاتێ بانگی بەیانی درا.. کاتێ بانگبێژ ووتی ﴿الله اکبر﴾ دەستیان کرد بە نوکتە لەسەر خوا، کاتێ بانگبێژ ووتی ﴿اشهد ان محمداً رسول الله﴾ نوکتەیان دەکرد لەسەر پێغەمبەری خوا (د.خ) لەو کاتەدا پەرچەکرداری ناخم و بورکانی ئیمانی فیترەتم دەستی کرد بە کوڵان.. ئەگەر خوای گەورە چاکەی بوێت بۆ بەندەیەکی، دوای ئەوەی کە تاریکاییەکانی نیشانداوە ئەوە هۆکارەکانی بۆ دەسازێنێ و ئاسانی دەکات.. سەرۆکی شانەکە ووتی: بەڕاستی من شیوعیەتی ڕاستەقینەم بینی لە کاتێکدا کە ﴿الانبودی﴾م بینی شاعیری میللی لە میسر، تەنها ئەوم بینیوە بە تەواوەتی جێبەجێی بکات.. منیش ووتم: سەیرە.. نیشانەی ئەوە چیە؟!! ووتی: ئەگەر بەرەبەیان دەرچوینایە لە ماڵ، کاتێ ژنەکەی ماچی ئەوی دەکرد، ماچی منیشی دەکرد... ئەگەر لە ناو جێگادا بخەوتینایە، ژنەکەی لە نێوان من و

ئەودا دەخەوت.. ئەو قسانەی کرد.. کاتێ وای ووت، تاریکیەك دابەزیە سەر چاوم و دڵم گوشرا، لە دڵی خۆمدا ووتم: ئەمەیە فیکرەو بیروباوەڕ؟!! ئەمەیە ئازادی؟!! ئەمەیە شۆڕش؟!! سوێند بە زات و خاوەنی کەعبەی پیرۆز، بەڕاستی ئەم قسانە قسەی شەیتان و ئیبلیسن!! لەو کاتەدا یەکێ لە دانیشتوان، غیرەتی دایە بەر خۆی و ووتی: مامۆستا، مادام تۆ پێت وایە، بۆچی ناهێڵیت ژنەکەی تۆش بێتە لای ئێمە؟ ووتی: بە ڕاستی من هێشتا دەتلێمەوە بە پاشماوەکانی بۆرجوازیەت و پاشماوە کۆنەپەرستیەکانەوە... هەر ڕۆژێك دێت هەموومان ڕزگارمان ببێت لەو پاشماوانە... لەو ڕووداوەوە گۆڕانێکی گەورە لە ژیانمدا ڕوویدا.. چومە دەرەوە بە دوای هاوڕێیانێکدا دەگەڕام کە جیاواز بن لەمان، قەدەری خوای گەورە وابوو لە ﴿دیوانیە﴾ ئاشنابیم بە چەند برایەك، کە پارێزگاری نوێژەکانیان دەکرد... و دوای نوێژی عەسر دەچوون بۆ قەراغ دەریا، پاشان دەگەڕانەوە، گەورەترین گوناهێ کە دەیانکرد ئەوە بوو یاری ﴿وەرەق﴾یان دەکرد... قەدەری خوای گەورە وابوو کە یەکێکیان هات و پێی ووتم: کاك ئەحمەد، دەڵێن مامۆستایەك هەیە لە میسر ناوی ﴿حەسەن ئەیوب﴾ە هاتووە بۆ کوێت.. ستایشی بویری و وتارەکانی دەکەن، نایەیت لەگەڵم بچین بۆلای؟ ئەو لە ڕووی حەزکردن و بینینەوە ووتی... منیش ووتم: بابڕۆین.. ڕۆشتم لەگەڵیدا و دەستنوێژم گرت و ڕۆشتمە مزگەوتەوە و دانیشتم و نوێژی مەغریبم کرد، پاشان دەستی کرد بە وتاردان، بە پێوە وتاری دەدا، ڕازی نەبوو دانیشێ لەسەر کورسی، مامۆستایەکی بەتەمەن بوو، سەروڕیشی سپی بوو بوو، بەڵام هێزە ئیمانی و بورکانیەکەی لە میانی وشەکانیەوە دەتەقینەوە، چونکە ئەو بە گیانی تانکەکانەوە قسەی دەکرد، نەك بە شمشێرانێك لە تەختە، دوای ئەوەی لە وتارەکەی بویەوە، هەستم کرد من لە جیهانێکەوە ڕۆشتووم بۆ جیهانێکی تر... لە تاریکاییەکانەوە بۆ نور و ڕووناکی، بۆ یەکەمین جار ڕێگای ڕاستی خۆمم ناسی و ئامانجی خۆمم زانی لە ژیاندا و بۆچی من دروستکراوم؟! و چی داوا دەکرێ لەمن؟!! و ئاینده و چارەنوسم بۆ کوێیە؟ هەستم کرد کە ناتوانم هەنگاوێکی تر بنێم نە بۆ پێشەوە نە بۆ دواوە، هەتا باوەش نەکەم بەو مامۆستا بەڕێزەدا و سڵاوی لێنەکەم.. پاشان ئەو برایە گەڕایەوە و پرسیارێکی لێکردم کە ڕاوبۆچونی من چۆنە؟ وتم پێی: بێدەنگبە.. پاش چەند ڕۆژە

دەبینیت.. هەمان شەو گەڕامەوە، هەموو کاسێتەکانی ئەو مامۆستایەم کڕی، دەستم کرد بە گوێگرتن لێیان هەتا خۆر هەڵهاتن، دایکم نانی بەیانی بۆ دانام، منیش ڕەتم کردەوە، پاشان نانی نیوەڕۆی بۆ دانم.. من هەر گوێم دەگرت و بەتاس و شەوقەوە دەگریام، هەستم دەکرد کە تازە لەدایك دەبمەوە، و چومەتە جیهانێکی ترەوە و پێغەمبەر (د.خ) م خۆشدەویست، ئەو بووبوو بە نموونەی بەرزو پێشەنگی من.. وورده وورده شارەزا بوو لە بەسەرهات و ژیاننامەی، بەهۆی خوێندنەوە و گوێگرتنەوە، لە ساتی لەدایك بونیەوە هەتا وەفاتکردنی، بۆ یەکەمین جار لەژیانمادا هەستم کرد کە من مرۆڤم، وورده وورده هۆگری قورئانی پیرۆز بووم، وام دەبینی هەرچی ئایەتەکانیەتی دەڵێی لە گەڵ مندا دەدوێت، یان باسی من دەکات ﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا﴾الأنعام/١٢٢. واتە: ﴿ئایا کەسێ مردوو بوو بێ‌و زیندوومان کردبێتەوە واتە لە پێشدا گومڕاه بووبێ‌و لە پاشاندا ڕێگای ڕاستمان پیشان دابێت‌و دەلیل‌و ئایەت‌و هۆش‌و بیری تێفکرینمان پێ دابێ‌و بە سەلامەتی لەناو خەڵکدا بڕوات بەڕێوە، وەك ئەو کەسەیە کە لە ناو تاریکی‌و بەسەر تاریکیدا بڕوات‌و هەرگیز لێی دەرنەچێت﴾.

بەڕاستی من مردبووم، خوای گەورە زیندووی کردمەوە، فەزڵ و منەت هەر بۆ خوای گەورەیە، لەو کاتەدا جارێکی تر ڕۆشتمەوە بۆ لای هاوڕێ سەرگەردانەکان.. یەکەکە بانگم کردن و بانگەوازم دەکردن بۆ ڕێگای ڕاست.. بەڵام.. ﴿إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ(٥٦)﴾ القصص... واتە: ﴿بێگومان تۆ ناتوانی هیدایەتی هەرکەسێ بدەی کە حەزت لێبێ، هیدایەت وەرگرێ، ئەمە کاری خوا خۆیەتی و ئەو هیدایەتی هەر کەسێ ئەدا کە مەیلی لێبێ هیدایەتی بدات و ئەو خۆی باشتر ئەزانێ کێ ئامادەیە بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرێ﴾.

بەڵام یەکێکیان بە ویستی خوا گەورە تۆبەی کرد، پاشان ڕۆشت بۆ عەمرە، لە ئۆتۆمبیلەکەدا وەرگەڕا و وەفاتی کرد، بەڵام سەرۆکی شانەکە، بە خەندەیەکی زەردەوە قسەی لەگەڵدا کردم، منیش موناقەشەم لەگەڵدا دەکرد و پیم ووت: ئایا نکوڵی دەکەیت لە بوونی خوای گەورە؟! خەندەیەکی زەردی کرد و ووتی: مامۆستا ئەحمەد، من ئێرەیی بە تۆ دەبەم چونکە تۆ ئێستا ڕێگاکەت دۆزیەوە.. بەڵام بە

نیسبەت منەوە، وازم لێ بهێنە.. من بە ڕێگای خۆم و تۆش بە ڕێگای خۆت.. پاشان تەوقەی لەگەڵدا کردم و ڕۆشت، وەك خۆی مایەوە.. ئەوانی تریش هەیان بوو، بوو بە ئەکتەر و هونەرمەند، یان بە شاعیر، گۆرانی دەنوسی و شریتی ڤیدیۆیی هەبوو، شیعری دەوت بەسەر خۆشی... پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە زیندوو لەمردوو دەردەهێنێت.. لەوساتەوە دەستم کرد بە بانگەواز کردن بۆ لای خوای پەروەردگاری جیهانیان.

ئەم چیرۆکە مامۆستا باسی کردووە لە موحازەرەیەکدا بە ناونیشانی ﴿ئەزمونەکانم لەژیاندا﴾.

# ٦٦- ﴿ئافرەتێك لە دەروازەی گۆڕێكدا﴾

ئافرەتەكە ووتی: ئێمە ڕۆشتین پێش مەغریب بۆ سەردانی خێزانێ لە ناوچەی ﴿الوثبة﴾ بەرەو ئەو شوێنەی كە نیشتەجێ بووین تیایدا لە ﴿أبوظبي﴾.. مێردەكەم هەوڵیدا پەلەبكات تا ڕابگات بەنوێژی جەماعەتی مەغریبدا، لەبەر ئەوە لەڕێگا لەتەنیشت گۆڕستانێك لایدا لەو مزگەوتەی كە لەوێدا بوو نوێژ بكات، تەنها بەهۆی ئەوەوە كە بە ئۆتۆمبێلەكە چوینە ئەو ناوچەیە و بەو شەوە بێدەنگە تاریكە ترسناكە، هەستم كرد كە هەموو لەشم دەلەرزێ، لە تەوقی سەرمەوە تاكو پاژنەی پێم... هەستێكم بۆ هات كە ئەوە كۆتا زیارەتە وماڵئاواییە لە دنیا بە گشتی. لامكردەوە بۆ دوای خۆم تا تەماشای ڕووناكی ڕێگاكە بكەم، كە وورده وورده دوردەكەوتەوە.. دەیان خەیاڵ و ئەندێشە هات بە بیرمدا، سەبارەت بە ژیان و مردن، زیندووكان و مردووەكان، بەختیاری و نابەختەوەری، لەدایك بوون و مردن، ڕاستیەكان و ئەندێشەكان، دەیان كەس لەخزمان و هاوڕێیان ئەوانەی ئارامیان گرتبوو لەژێر خاكدا.. هات بەبیرمدا كە شریتێكی درێژ ڕەت دەبێ بە بەرچاومدا، و دەیان بەڵكو سەدان و هەزاران خاوەنەكانیان ئەسپەردەیان دەكەن.. كە دەرگای یەكەمی چاڵێكە لە خۆڵ، لەوێدا خۆیان دەبیننەوە لە جیهانێكی تردا، كە دنیا بە نیسبەت ئەو شوێنەوە تەنها وەك سكی دایك وایە بە نیسبەت هەموو دنیاوە!! بەڵام خاوەنی جەنازەكان، بە خێرایی خۆڵیان دەكرد بەسەر مردوەكەیاندا، خۆڵ و بەرد، پاشان دەگەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان و دەستیان دەكردەوە بەژیانی ئاسایی خۆیان، تەنها چەند ڕۆژێك بوو هەموو شتێكیان بیر دەچووەوە!! ئوتۆمبێلەكە لەبەرامبەر ڕێكی دەرگای گۆڕستانەكەدا وەستا، وە بۆ ئەوەی ئامادەبێت بۆ چونە ژوورەوە هەركاتێ كە دەرگا كرایەوە ئەوە زیاتر شپرزەی كردم، دنیا بەتەواوی تاریك بوو، ئەو كەش و هەوایە كاریگەریەكی دەروونی ترسناكی هەبوو لەسەر دڵم، تا ئەو ئەندازەیەی بە تەواوی زمانم گۆی نەدەكرد،و هەوڵمدەدا قسە بكەم و داوا لەمێردەكەم بكەم كە شوێنی ئۆتۆمبێلەكە بگۆڕێ.. بەڵام ئەو خێرا منی بەجێهێشت، تا بەرەو ڕووی قەدەری خۆم ببمەوە.. منیش لەگەڵ بیر و ئەندێشەكانمدا مامەوە كە پڕبوو لە ترس و موفاجەئات، كە لەپڕ دەدەكەوتن لەو دەرگایەوە یان لەسەر دیوارەكانەوە!! مردن.. مردن.. تۆ چوزانیت

مردن چیە.. پاشان تۆ چوزانیت مردن چیە؟!!! ئەو دێوەزمەی چۆکدادەدات بە گەورەو بچوك بە بێ وادەی پێشوەخت پاشان ئارامگای هەموان لێرەیە.. لە پشت ئەو دیوارانەوە: دەوڵەمەند و هەژار، و ڕەنجبەر و ئاغاو بەهێز و لاواز و زاڵم و زۆرلێکراوی لێیە، هەموان لەژێر گڵدان، هەریەکەیان بەپێی کردەوەکانیان لە چاکەو خراپە پاداشت دەدرێنەوە... خوایەگیان!! چیبکەم ئەگەر ئێستا لەپڕ دڵم بوەستێ، لە جیاتی ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای منداڵەکانم کە بەتاسەوەن بۆ گەڕانەوەم، ئەو کاتە دەبرێم بەرەو چاڵێکی تاریکی تەسك لەناو زەویدا... کەسم لەگەڵدا نیە، و هیچ ئازیزێك و خزمێك نزیکم نیە، هاواردەکەم تا فریام بکەون.. من بەتەنهام لەگەڵ تاریکی سزا و لێپرسینەوەدا، سەرلەنوێ لەرز دایگرتم.. هەستم بە موچرکە دەکرد لەناو هەموو خانەیەکی لەشمدا، دەستم کرد بە گریان، بە ترسەوە جامەکانی ئۆتۆمبێلەکەم داخست و بە ترسەوە تەماشای دیواری گۆڕستانەکە و دەرگاوانەکەیم دەکرد ، و دڵم بەپەلە لێیدەدا، و زمانم نازانم چۆن هاتە گۆو دەپاڕایەوە لە خوا و تەسبیحاتی دەکرد و داوای لێخۆشبوونی دەکرد بە گریانەوە.. داوای مۆڵەتی دەکرد لە پێناو تەوبەکردنێکی ڕاستگۆیانەدا، بەڵام قاچەکانم هەرگیز هەستم پێنەدەکردن.. دەستەکانیشم دەلەرزین، و عاباکەمیان بە تنی پێچابوو لە جەستەمەوە.. ئەوە یەکەمین جاربوو لە ژیانمدا کە گۆڕستان ببینم.. وەك ئەوەی بە ئاشکرایی مردن ببینم بە چاوی خۆم.. هات بە بیرمدا کە مێردەکەم بە ئەنقەست منی هێناوە بۆ ئێرە، تا ئەو ژەمە ڕۆحیە یان وانە ڕۆحیەم پێ بدات کە گەشتبووە سەر ئێسکم.. ئای مێردەکەم چەندە ئامۆژگاری دەکردم.. قسەی بۆ دەکردم و پەند و وانەی پێ دەوتم، بەڵام هەموو ئەوانە منی ڕانەدەچڵەکاند، بە لوتبەرزی خۆم مابوومەوە، وامدەزانی مەبەستی من نیە، بەڕاستی زۆر ئارامگر بوو.. بێزار نەدەبووم لەچەندبارە کردنەوەی ئامۆژگاریەکانی بەسۆز و خۆشەویستیەوە و هەروەها سوربوونەوە.. ئێستا هەستم کرد کە بڵێسەیەك ڕژا تا ئەو کاریگەریە سەیرە دروست بکات لەگەڵ ئەو ئامۆژگاریانەدا.. ئێستا هەستم کرد کە ئاگر حەشاردرابوو لە ژێر خۆڵەمێشکەدا.. تەنها ئێستا بە تەواوی دڵنیابووم کە قسەی خێر هەرگیز بەزایە ناچێت، و ئامۆژگاری تایبەت، لەگەڵ بەسەرچونی ڕۆژگاریشدا هەر دەمێنێ... لەو ساتەدا شریتێکی درێژ

له ئامۆژگاریەکانی و هەڵوێستەکانی بە بەرچاومدا ڕەت دەبوو، شتانێك ووردە ووردە سواری کۆڵم بوون.. بەڵێ خەیاڵێکی خراپ هات بە مێشکمدا، ئەویش ئەوەبوو کە هێرشێکی شێتانەی بکەمە سەر کاتێك کە دەگەڕێتەوە.. بەڵام لەو خەیاڵە هاتمەدەرەوە و یادی مردن و مردووەکان و گۆڕستان و قەبرەکان و شەوی ترسناك و لێپرسینەوە و بەهەشت و دۆزەخم دەکردەوە... دەستم کرد بە لۆمەکردنی خۆم، بڕیارمدا سود لەو وانە ڕۆحیە وەربگرم.. ئەندێشەیەکی سەیر هات بە بیرمدا.. بۆچی ئەوەی ئەمشەو ڕوویدا خێریکی مەزن نەبێت لە لایەن خواوە بۆ من، پێویستە منیش سودی لێ ببینم.. لەبەرئەوە هەموو تەرکیزم خستە سەر ئەو وەسیەت و ئامۆژگاریانە کە بەبێ هەژمار دەیکرد بە گوێمدا، منیش بە شێوەیەکی سەیر ئەو شریتەم دەهێنایەوە بەرچاوی خۆم.. ئەو وەسیەت و هەڵوێستانە بە شێوەیەکی زیندوو و ورووژێنەر وەرم گرتن، و لەو ساتەدا دڵنیابووم هەموو ئەو کارانەی لەبەر خۆشەویستی من کردووە و سوربوون لەسەری و بەزەیی هاتنەوە پیامدا و ئیرادەی خێر و چاکە و زیندوکردنەوە تیامدا لە دنیاو لە قیامەتدا، دەرکم بەوە کرد کە من چەندە گەمژەم و من هەموو ئەوانەم فەرامۆش کردبوو، سواری سەرم بووبووم لەگەڵ ئارەزوەکانمدا و شەیتان و دەروونی خراپەکارمدا.. دەستم کرد بە گەشتکردن بە نێو بیروبۆچونە گەشاوە نوێکاندا، و خۆم دابڕاند لە هەموو شتەکانی دەوروبەرم و چوومە شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاوەوە... پێشوازیم لە نارەحەتیەکان کرد کە وەسف ناکرێت، و چاوەڕوانی فریشتەی خوام دەکرد بۆ پرسیار و لێپرسینەوە، لەو ساتەدا ترسام، بەڵکو گریام.. بە حەزەرەوە ڕوانیم، ئەو شنەبایەی هەڵی کردبوو، وام هەست دەکرد ڕۆحی مردووەکانی هەڵگرتووە بە چواردەورمدا!! لەگەڵ کەللەڕەقیمدا فرمێسکێکی زۆر بەچاومدا هات، ساتانێك بوو وەسف ناکرێت، و ناتوانرێت گوزارش لەو شەحنە ڕۆحیانە بکرێت. کە تیایدایە، و کەس دەرك بە ڕاستەقینەکەی ناکات تا نەکەوێتە ناو ئەو تاقیکردنەوە و چێژی سیحرەکەی نەکات.. ئەو شەوە من هەستم کرد کە لەو گۆڕستانەوە هاتومەتە دەرەوە بەدڵێکی ترەوە جیاواز لەو دڵەی کە پێی چوومە ژوورەوە، و لەو ساتەوە چەسپا لەدڵمدا کە دەبێ کەسێکی ژیربم، کە خۆم ئامادەبکەم بۆ دیداری ئەو شوێنە سامناکە، بۆیە بە دڵنیاییەوە سوربووم لەسەر ڕووکردنە خوای

گەورە بە چالاکی و شەوق و هیممەت بەرزیەوە.. لێرە و لەو شوێنەدا خۆشەویسترین کەس لە دڵتا بەجێت دەهێڵێ، دوای ئەوەی تۆش ئازیزترین شتی خۆت جێدێڵیت، خۆشەویستانت دەستیان تێکەڵ بە خاکی گۆڕەکەت دەبێ و دەستیان دەتەکێنن، تا پاشماوەیەك کە زۆر دەخایەنێ یان کەم دەخایەنێ لەبیرت بکەن و دەگەڕێنەوە بۆ ئەنجامدانی کاروباری ئاسایی ڕۆژانەیان، لەو ساتەدا بەرەو ڕووی شتێك دەبیتەوە کە مووی منداڵیش پیر دەکات، هەموو ئازیزان و خۆشەویستانت بەجێت دەهێڵن بەتەنها، تا بەرەو ڕووی ئایندەیەکی نادیار ببیتەوە.. ئەگەر پشکی باشت هەبوو لە خواپەرستی و خێر و چاکە و حەسەنات و زیکر، ئای چەند خۆشە، سەرکەوتوودەبیت و دڵخۆ دەبیت، ئای کە چەند خۆشە، ئەو ڕۆژە و چەندە مەزنیت.. بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بێت ئەوە تەنها لۆمەی خۆت بکە، چونکە ئەو کەسەی ئاگادارکرایەوە ئەوە ئیتر عوزر و بەهانەی نیە، و پێغەمبەری خوا (د.خ) ڕاستی فەرمووە، هەواڵمان دەداتێ کە ژیری ڕاستەقینە ئەوکەسەیە لێپرسینەوەی خۆی بکات و کاردەکات بۆ دوای مردن.. و کەسی بێتوانا و گەمژە ئەو کەسەیە دوای ئارەزووەکانی دەکەوێت لە هەموو بوارەکاندا پاشان بیری لەوە نەکردۆتەوە کە ژیانی ڕێکبخات بە پێی ویستی خوای گەورە، منیش لەسەر ئەو زیارەتە موفاجیئە بۆ سەرقەبران سوپاسی خوای گەورەم کرد، بە دەروونم دەروونم پاك کردەوە، و سوپاس و ستایش و منەت و فەزڵ تەنها هەر بۆ خوای گەورەیە، خوایەگیان ڕێنمایی گەلەکەم بکە، چونکە بەڕاستی ئەوانە نەزانن. ﴿اللهم اهد قومی فإنهم لایعلمون﴾..

## ٦٧- ﴿من بۆنی بەهەشت دەكەم﴾

ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی:﴿ : (( سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ : إِمَامٌ عَادِلٌ ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ الله ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ بِالْمَسَاجِدِ ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَا فِي اللهِ اجْتَمَعَا عَلَيهِ وتَفَرَّقَا عَلَيهِ ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ حُسْنٍ وَجَمَالٍ ، فَقَالَ : إنِّي أخَافُ الله ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ ، فَأخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خَالِياً فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ )) مُتَّفَقٌ عَلَيهِ .

. واتە:﴿حەوت تاقم و كۆمەڵ خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە كە لەو ڕۆژەدا بێجگە لەو سێبەرە سێبەری تر نیە، پێشەوایەكی دادپەروەر، و لاوێك بە خواپەرستی گەورە بووبێت و پیاوێك دڵی هەڵواسرابێت بە مزگەوتەكانەوە، و دوو پیاو لەبەر خوا یەكتریان خۆش بوێت و لەبەر خوا لەیەكتر جیاببنەوە، و پیاوێك ئافرەتێكی خاوەن ڕێز و جوانی بانگی بكات بۆ خراپەكاری و ئەمیش بڵێت من لە خوای گەورە دەترسم، و پیاوێك شتێك ببەخشێت و بیشارێتەوە بە ئەندازەیەك دەستی چەپی نەزانێت دەستی ڕاستی چی بەخشیوە، و پیاوێك بە پەنهانی زیكر و یادی خوای گەورە بكات و فرمێسك بە چاوانیدا بێتە خوارەوە﴾.

وە لە ئەنەسی كوڕی (نضر)ەوە ڕۆژی بەدر ووتی ﴿وانها لريح الجنة إني لأجد ريحها من وراء احد﴾واتە: {ئەوە بۆنی بەهەشتە بە ڕاستی من لەپشتی كێوی ئوحودەوە هەست بە بۆنی دەكەم} . دكتۆر پێی ووتم: لە نەخۆشخانەوە پەیوەندیان پێوەكردم كە حاڵەتێكی مەترسیدار هەیە بەپەلە گەیاندویانە... كاتێ گەیشتم، لاوێك بوو وەفاتی كردبوو -خوای گەورە ڕەحمی پێ بكات- بەڵام ئەبێ هۆكاری مردنەكەی چی بووبێت.. هەموو ڕۆژێ سەدان بەڵكو هەزاران كەس دەمردن... بەڵام وەفاتكردنیان چۆن چۆنیە؟!! و عاقیبەتیان چۆنە؟!! ئەو لاوە فیشەكێكی بە هەڵە بەركەوتبوو، بە پەلە باوك و دایكی خوا جەزایان بداتەوە گەیاندیانە نەخۆشخانەی سەربازی لە ﴿ریاض﴾ كاتێ لەڕێگا بوون، ئەو لاوە لایكردەوە بەلایاندا و قسەی كرد لەگەڵیاندا!! بەڵام!! چی ووت؟؟ ئایا هاواری دەكرد و دەیناڵاند؟! یان دەیوت بەخێرایی بمبەن بۆ نەخۆشخانە؟! یان بێزاربوو لەحاڵی خۆی؟! ئەی چی دەوت؟! باوك و دایكی ووتیان پێی ووتین: مەترسن!! من بێگومان دەمرم... دڵئارامبن.. بەڕاستی من بۆنی بەهەشت

دەکەم... نەك تەنها ئەوەندە، بەڵکو ئەو ووشە ئیمانیانەی دووبارە دەکردەوە لای پزیشکەکان لە ئیسعافەکەدا... ئەوان زۆر هەوڵیاندا فریای بکەون.. ئەمیش پێی دەوتن: براکانم، بەڕاستی من مردووم، خۆتان ماندوو مەکەن... بەڕاستی من بۆنی بەهەشت دەکەم... پاشان داوای لەدایك و باوکی کرد کە نزیك ببنەوە لێی، ئەمیش هەردوکیانی ماچ کردو، داوای گەردن ئازادی لیّ کردن.. و پاشان سڵاوی لە براکانی کرد و دواتر شایەتومانی هێنا!! {اشهد ان لا إله إلا الله و اشهد ان محمداً رسول الله}

شایەتی دەدەم کەپەرستراو نیە بێجگە لەخوا

وە شایەتی دەدەم کە محمد پێغەمبەری خوایە

پاشان ڕۆحی بەرزە فڕیوو بۆ لای پەروەردگاری.

الله أكبر

چی بڵێم... چۆن گوزارش بکەم.. هەست دەکەم وشەکان لە دەمدا قەتیس ماون...و پێنوسیش دەلەرزێت بە دەستمەوە.. هیچ شك نابەم ئەوە نەبێت کە دوبارەی بکەمەوە و یادی ئەم ئایەتە بکەمەوە: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ(٢٧)﴾ إبراهيم. واتە: ﴿جا ئەوانە کە باوەڕیان بەخواو بەگشت بڕیارەکانی خوا هێناوە، بەهۆی ئەم وشە جێگیرو نەگۆڕاوەی (لا إله إلا لله)وە خوا پێگەیان قایم و سابت ئەکا ، لەژیانی ئەم دونیاو لەژیانی ئەودونیا و ستەمکارانیش گومڕاو سەرلێشێواو دەکات﴾

وەهیچ لێدوانیّ هەڵناگریّ.

پاشان ووتی: هەڵیانگرت تا بیشۆن، برای بەڕێز لە پێغەمبەرەوە کە ﴿أن المؤمن يموت بعرق الجبين﴾ بەڕاستی ئیماندار بەعارەقی نێوچەوان دەمرێت.. مردوشۆری نەخۆشخانە شتی.. ئەویش شتی سەیری بینی!

یەکەم: تەوێڵی بینی عارەقی لێدەتکا، ووتم چەسپاوە کە عاقیبەت خێریە...

دووەم: ووتی دەستەکانی نەرم بوون، و لە جومگەکانیدا نەرمیەك هەبوو، وە لاشەی ئەوەندە گەرم بوو، وەك ئەوەی کە نەمردبێت، تا ئێستا مردووی وام نەبینیبوو...

سێیەم: دەستی ڕاستی وا هەستت دەکرد لە شایەتوماندایە، بە پەنجەی شایەتومان ئامارەی بۆ یەکتاپەرستی و شایەتیدان دەداو هەموو پەنجەکانی تری

نوشتانبوویەوە... سبحان الله.. ئەی کە چەندە کۆتاییەکی جوان بوو... عاقیبەت خێریی لە خوای گەورە دەخوازین... بەڕێزان... چیرۆکەکە هێشتا کۆتایی نەهاتووە!! برای بەڕێز ﴿ضیاء﴾ و برایەکی تریشی پرسیاریان لەباوکی کرد سەبارەت بە کوڕەکەی کە چۆن بووە؟! ئایا دەزانی وەڵامی چی بوو؟!

ئایا واگومان دەبەیت شەوی لە گەڕانی کۆڵان و شەقامەکاندا بەسەر دەبرد، یان شەونخونی دەکێشا بەدیار سەتەلایت و تەلەفزیۆن و شتانی ناشەرعی دەبینی.... یان دەچووە خەوی قوڵەوە تەنانەت لەکاتی نوێژەکانیشدا... یان هاوڕێی عارەق و مادەی هۆشبەر و دوکەڵ و ئەوجۆرە شتانە بوو؟! ئەبێ خەریکی چی بوو بێت؟! چۆن گەشتووەتە ئەو عاقیبەت خێریە، گومانی تێدا نیە خوێنەری بەڕێز تۆش ئاواتە خوازیت بەو پلەو پایە بگەیت.. کە کاتێ لە سەرەمەرگدایت بۆنی بەهەشت بکەیت.

باوکی ووتی: ئەو زۆربەی جار شەو هەڵدەستا.. چەندەی بتوانیایە نوێژی دەکرد.. و هەموو ئەندامانی خێزانەکەی هەڵدەستان تا نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکەن، و سووربوو لەسەر لەبەرکردنی قورئان.. و یەکێ بوو لە سەرکەوتوان لە قۆناغی ئامادەییدا...

ووتم: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ(١٣)﴾ الأحقاف.. واتە: ﴿ بەڕاستی ئەوانەی کە دەڵێن پەروەردگارمان (الله)یەو، پاشان پابەندی ئەو ئیمانە دەبن و ڕاست و ڕەوان پەیڕەوی دەکەن و لەسەری بەردەوامن، ئەوانە هیچ جۆرە ترس و بیمێکیان توش نایەت و هیچ غەم و پەژارەیەك نایەتە ڕێگەیان﴾.

WWW.altqwa.fzs.com

## ٦٨- ﴿مێژووی غەرناتە و طلیطلة... هۆکاری تەوبەکردنی من بوو﴾

ئەم تەوبەکارە دەڵێ: ژیانێکی زۆر ئاسودەم دەگوزەراند، لەوپەڕی چاودێری و گرنگیپێدانی دایك و باوکمدا بووم، دوای ئەوەی ژیانیان تەرخانکردبوو لەپێناو ئاسوودەکردنی مندا.. چونکە من تاکە منداڵی ئەوان بووم.. کاتێ بڕوانامەی زانکۆم بەدەست هێنا، باوکم ئۆتۆمبێلێکی پێشکەش کردم. و ئاگاداری کردم کە دەبێ خۆم ئامادە بکەم بۆ کارکردن لەگەڵیدا لەکۆمپانیا تایبەتەکەیدا.

لەوکاتەدا پەیوەندیم هەبوو بەچەند هاوڕێیەکی زانکۆ و بەڕاستگۆیانە.. و ئەو هاوڕێیەی کە زۆر نزیك بوو لێمەوە ناوی عەلی بوو، پەیوەندیم پێوە زیادی کرد، بارودۆخی کۆمەڵایەتیمان لە یەکی دەکرد، ئەویش تاقانەی ماڵی خۆیان بوو، بە تەواوی وەك ئێمە ئەوانیش گوزەرانیان زۆر خۆش بوو، وە لەنزیك ماڵی ئێمە نیشتەجێ بوون، کە یارمەتی دەداین ڕۆژانە بەئاسانی یەکتری ببینین.. و دوای ئەوەی پێکەوە زانکۆمان تەواو کرد، پێشنیاری بۆ کردم کە گرنگە گەشت بۆدەرەوەی وڵات بکەین، وەك چۆن هاوڕێکانیشمان وایان دەکرد، ئەوانەی کە چۆنیەتی لەزەت بینینیان دەزانی لە کاتەکانیان!! پێشنیارەکەم خستە بەردەم باوك و دایکم، ئەوانیش دوای داکۆکیەکی زۆری من ڕەزامەندیان نواند.. باوکم ئاگاداری کردم کە دەترسێ لە ڕووی ئاکار و ڕەوشتەوە توشی هەڵدێر ببم، وەك چۆن زۆرێك لەگەنجەکان توشی بوو بوون. منیش دڵنیام کردەوە و بەڵێنم پێدا کە ببم بە نمونەی کوڕێکی باش... و لەنێو دوعاو نزای باوك و دایکم کە بە سەلامەتی بگەڕێمەوە، هەستام بە کڕینی بلیتی سەفەرکردن بۆ خۆم و هاوڕێکەم بۆ ئیسپانیا... هەر کە گەشتینە ئەوێ.. تێبینیم کرد کە هاوڕێکەم پێداگری دەکات لە مانەوەمان تەنها لە یەك ئوتێلدا و ڕازی نیە بە ئوتێلەکانی تر... کاتێ هۆکاری ئەوەم لێپرسی پێی ووتم کە ئەم ئوتێلە کەوتۆتە تەنیشت زۆرێك لە بارەکان، کە تیایاندا وەك کەسانی تر ژیانمان نوێ دەکەینەوە!! لێرەدا بیری ئامۆژگاریەکانی باوك و دایکم کردەوە کە پێویستە دووربم لە هەموو ئەو شتانەی کە زیانیان هەیە بۆ ئاینەکەم، لە ڕۆژی یەکەمەدا ڕازی نەبووم لەگەڵیدا بڕۆم

بۆ ئەو جۆرە شوێنانە... بەڵام دوای داکۆکیەکی زۆری ئەو، ڕازی بووم بڕۆم لەگەڵیدا. هەر لەڕۆژی یەکەمەوە بردمی بەرە و کارانێکی ناشرین و بەدڕەوشتی، هەستم بەو تاوانانە نەدەکرد کە ئەنجامیان دەدەم لەڕۆژی داهاتوتردا نەبوایە... لەوکاتەدا هەستم بە پەشیمانیەکی زۆرکرد لەو تاوانانەی کە کردومە دەرهەق بەخۆم و ئاینەکەم.. بەڵام پەشیمانیەکە درێژەی نەکێشا.. و لەپێناوی گۆڕینی کەش و هەوا گەشتمانکرد بۆ غەرناتە و ﴿طليطە﴾.. کچێکی ناموسڵمانیشم لەگەڵدا بوو، بۆ ئاسەوارە ئیسلامیەکان لەگەڵمدا دەگەڕا.. لە ﴿طليطلە﴾ کۆشکە مەزنەکانم بینی، کە باوباپیرانمان کە موسڵمان بوون بنیاتیان نابوو.. کچەکە بۆی باسکردم کە دانیشتوانەکەی تەنها بەخێر و چاکە باسی موسڵمانەکان دەکەن.. چونکە ژیانیان بە تاکە کەسێك نەگەیاندووە لە خەڵکی ﴿ئەندەلوس﴾ کاتێ هەستاون بەفەتح کردنی. وە لەمیانی باسە تێر و تەسەلەکەی سەبارەت بە مەزنیی مێژووی ئیسلامی لەو وڵاتەدا، هەستم بەشەرم کردن زیادی دەکرد، کە چەندین تاوانم لەو شارەدا ئەنجام داوە.. کە باو باپیرانمان — رەحمەتی خوایان لێ بێ— تەنها بەخوا پەرستیەوە فەتحیان کردووە. هەستکردنم بەتاوان گەشتە ئەوپەڕی سنوور.. کاتێك یەکێ لە ﴿شتە نەخشێنراوەکان﴾ م بینی لەناو کۆشکێکی ئیسلامی لەشارەکەدا چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی لەسەر نوسرابوو.. هەرکاتێ تەماشای ئەو ئایەتانەم دەکرد، وام هەست دەکرد شتێك قوڕگمی گرتووە، تا لەناوم بەرێت بەهۆی ئەو تاوانانەوە کە کردومن دەرهەق بەخۆم، هەر لەیەکەم ڕۆژی گەیشتنم بۆ ئەم وڵاتە، کە پڕیەتی لە ڕابردوویەکی گەشاوەی سەروەری ئیسلامی. فرمێسك بەخوڕ بەچاوانمدا هاتە خوارەوە، کاتێ ئەم ئایەتەم بینی ﴿وَلاَ تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً(٣٢)﴾الإسراء.. واتە: ﴿وە بەهیچ شێوەیەك توخنی زیناو شەروالْ پیسی و ئەوانەیش پێشەکین بۆی مەکەون ، چونکە بەڕاستیی داوێنپیسی کردەوەیەکی زۆر خراپ و ڕێگایەکی زۆر ناپەسەندە﴾....ئەو کچەی لەگەڵمدا بوو سەرسام بوو بەو فرمێسکانە، منیش پێم ووت کە هەندێ یادگاریم هاتەوە یاد کە ئازاراوی بوون لەژیانمدا، چونکە دەمزانی ئەگەر بۆشی باس بکەم لێم تێناگات.. لەوساتەدا بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ شانشینی سعودیە.. بە یەکەمین فڕۆکە کە لە بەرشەلۆنەوە دەرچێت.. هاوڕێکەم هەوڵیدا ڕازیم بکات بە مانەوە لەگەڵیدا، تا لە گەشتەکەماندا

بەردەوام بین.. بەڵام زۆر بە پێداگریەوە ڕازی نەبووم.. دوای ئەوەی دەرکم بە خراپی تاوانەکانی کرد کە دەیکات دەرهەق بەخۆی و ئاینەکەی. بەو شێوەیە گەڕامەوە بۆ وڵاتەکەم بە پەشیمانی لەو کردەوانەم و ئومێدی لێخۆش بوونی خوا لەو تاوانانەی کە کردوومە.. هەر کە پێم دانا لەسەر خاکی وڵاتەکەم.. بڕیارمدا هەموو پەیوەندیەکم بەو هاوڕێیەمەوە بپچڕم کە خەریکبوو بمخاتە گۆمی تاوانەوە، بەڵام خوای گەورە پێش ئەوەی کارلەکار بترازێ ڕزگاری کردم.

# ٦٩- ﴿تەوبەی مامۆستا (سلیمان الثنیان)﴾

لە ئەندازیاری کیمیایی و دەرهێنانی سینەمایی لە ئەڵمانیا بۆ کۆلێژی شەریعەت لە ﴿الریاض﴾، ئەمە بە کورتی گەشتی مامۆستا ﴿سلیمان الثنیان﴾بوو لەتیاچوون و هەڵدێرەوە بەرەو ڕێنمایی ئیمان.

لەسەرەتاوە... (د.سلیمان الثنیان) نێردرا بۆ ئەڵمانیا بۆ خوێندنی ئەندازەی کیمیایی.. لەوێ گۆڕانی یەکەم لە ژیانیدا ڕویدا.. دەرکی بەوەکرد کە خوێندنی زانستی کیمیا بەس نیە، دەیەویست شتێکی تر بخوێنێ کە لە میانیەوە کاریگەری هەبێت لەسەر خەڵکی.. بۆیە ژمارەیەك مامۆستای ئەڵمانی ئامۆژگاریان کرد کە هونەر بخوێنێ و پسپۆڕی پەیدا بکات لە دەرهێنانی سینەماییدا.. بە ڕۆحی تەحەدداوە توانی خوێندنی ئەندازەی کیمیایی تەواو بکات.. لە هەمان کاتیشدا لە بواری سینەما و تەلەفزوێن و شانۆدا دەیخوێند.. هەشت ساڵی بردەسەر لە خوێندنی ئەو هونەرانەدا، لە میانیدا بەرنامەیەکی بۆ خوێندنەکە دانا کە بتوانێ زانیاریەکان و شارەزایی تەواو پەیدا بکات لە بواری دەرهێناندا.. ئەوەش بە یارمەتی ئەڵمانیە پسپۆڕەکان، و لەچەند پەیمانگەیەکی هونەریدا و لە ئەکادیمیای نیشتمانی بۆ سینەما و شانۆ و تەلەفزیۆن خوێندی..

ئێستاش ئێوە و دکتۆر ﴿الثنیان﴾ تا باسی گەشتی خۆیمان بۆ بکات.. دەڵێ: هیچ شتێ نەمابوو کە دەرهێنەر پێویستی پێی هەبێت و خۆم شارەزا نەکەم تیایدا.. پەیوەندیم کرد بە قوتابخانەکانی سواری ئەسپ و کەشتیوانی و ڕۆشتمە پەیمانگاکانی نواندن و مۆسیقاوە.. و جۆرەکانی دەنگ و وردەکاریەکانی ڕوناکی و کاریگەریە دەنگیەکان و جلوبەرگ و دیکۆرم خوێند.. بەو شێوەیە قۆناغی یەکەمم بەسەرکەوتوویی تەواو کرد، دەستم کرد بە قۆناغی دووەم، کە بریتی بوو لە شارەزایی کردەیی لە دەرهێنان و وێنەگرتن و کارەکانی شانۆ و بەرهەمهێنانی فیکری و نوسینی چیرۆکەکان.. زۆری نەبرد ئەو قۆناغەشم تەواو کرد، بەتەواوکردنی پێشنیاری زۆرم پێگەشت لە لایەن ﴿شانۆی سلرد﴾و هەندێ لەکۆمپانیاکان تا کاری تێدا بکەم وەك دەرهێنەر یان یاریدەدەری دەرهێنەر یان ئەکتەر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو. بەڵام من وەڵامی ئەو داوایانەم نەدایەوە... گۆڕانی دووەم لەژیانمدا

ڕوویدا، چاوم کەوت بە بەڕێوەبەری گشتی تەلەفزیۆنی سعودی، لەو کاتەدا کە داوای لێکردم کە بگەڕێمەوە و بەڵێنی پێدام کە چەندین شتی باش بەرهەم دێنم. و حەز و خولیای من تەنها دەرهێنانی فیلم یان شانۆ نەبوو، بەڵکو دەمەویست هەستم بە کارانێ لە میانیەوە وشەی ئیسلام و موسڵمانان بدەم بە گوێی هەموو جیهاندا..

لێرەوە بەخێرایی ڕازیبووم بگەڕێمەوە. لە تەلەفزیۆنی سعودیدا بۆماوەی ٤ساڵ کارم کرد، نوێنەری وڵاتەکەم بووم لە کۆنگرەی ﴿گینیس﴾ لە ﴿میونیخ﴾ کە سەبارەت بەڕۆڵی تەلەفزیۆن بوو لەپەروەردەکردنی لاواندا.. لەساڵی ١٣٩٦ک، بڕیارمدا واز لەبواری ڕاگەیاندن بهێنم.. چونکە دەمبینی من ناتوانم ئاواتەکانم لەمیانی ڕاگەیاندنی تەلەفزیۆنیەوە بینمەدی، و زیاتر حەزم لە سینەما بوو، چونکە تواناکانی گەورە بوون، بەڵام ﴿ماددە﴾ ڕێگر بوو لەبەردەم هاتنە دی ئەو حەزەدا.. من تەنها ئەو سامانەم دەبینی کە مەرجی لەسەرە قانجازی بازرگانی بکات. ساڵ و نیوێکم بردە سەر و من هەر لە ڕاڕایدا بووم، چەندین پێشنیاری بازرگانیم بۆ کرا، بەتەواوی ڕەفزم کردن.. لە یەکێ لە گەشتەکانمدا لە ﴿القصیم﴾ەوە بۆ ﴿ریاض﴾ گۆڕانی سێیەم دەستی پێکرد.. کاتی چێشتەنگاو بوو، لە ئۆتۆمبیلەکەمدا بووم، خۆشیەکی مەزنم بینی، وام هەست کرد کە من چاوەکانم داخراوە و سەرلەنوێ ئەو پەردەیەم لابرد، سەرلەنوێ دنیام بینیەوە خەریکبوو لە خۆشیا بفڕم، ماوەی ساڵ و نیوێکە ئازار دەچێژم، ئەوەتا خێر دەبینم لەبەردەممدا، توشی کەمێك لە گریان و پێکەنین بووم بەهۆی دڵخۆشی زۆرمەوە، بڕیارمدا سودی تەواو لەو تەمەنەم وەربگرم کە ماومەو پەیوەست ببم بەخوای گەورەوە، و بۆم دەرکەوت کە پێویستە شارەزایی و زانیاریم هەبێت، چونکە هەر لە منداڵیەوە ڕاهاتبووم بەوە، چونکە بەبێ زانیاری هیچ کارێکم نەدەکرد، بۆ ئەوەی ئەوە بەدەست بهێنم.. بڕیارمدا دەست بکەم بەخوێندن لەبواری شەریعە و علوم شەرعیدا بە قوڵیی. زۆر بەدڵخۆشی و ئاسودەییەوە ڕۆشتم بۆ کۆلێژی شەریعەت، پێیان ووتم: دەتوانی داواکاری پێشکەش بکەیت بۆ خوێندنی باڵا ئەگەر دەتەوێت.. ووتم پێیان: نا... دەمەوێ گەشتەکەم هەر لە سەرەتاوە دەست پێبکەم.. واتە لە قۆناغی یەکەمەوە، بۆیە هەر وام کرد.. دەستم کرد بە خوێندن تا بڕوانامەی بەکالۆریسم بەدەست هێنا.. بەبێ ئەوەی یەك ڕۆژ غائیب ببم.. دوای ئەوە ماستەرم

بەدەست هێنا، پاشان قۆناغی دکتۆرا هاتە پێشەوە، لەماوەیەکی کەمدا ئەویشم تەواوکرد.. هەموان پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە خۆڕاگر نابم لە خوێندنی شەریعەت بەهۆی قورسیەکەیەوە، بەتایبەتی من ﴿بەلای ئەوانەوە﴾ ڕاهاتبووم لەسەر ناوبانگ و پارە و سامان، پێیان ووتم: ڕۆژێك دێت کە بۆت دەرکەوێ ڕێگاکەت هەڵەکردووە، و بەرگەی دانیشتنی سەر کورسیە تەختەکان ناگریت تا فێری شەریعەت ببیت، بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە زۆری نەبرد سەرکەوتوو بووم لەخوێندن، و بۆ یەك ساتیش پەشیمان نیم لە گۆڕینی ڕەوتی ژیانم.

پاشان دەڵێ: من ئامادەم لە هەر ساتێکدا بێت کە بگەڕێمەوە بۆ بواری ڕاگەیاندن. ئەگەر ئەوەی دەمەوێ گونجاو بێت بۆم، با ڕای خۆمت پێ بڵێم سەبارەت ئەوەی کە دەگوزەرێ لە فیلمەکاندا لە بازاڕی عەرەبیدا.. زۆرێك لەو فیلمانە قسەی بەتاڵن و کاری بێ ئەرزشن کە شایانی نمایش نین و بەهەدەردانی پارەو سامانە، و لە تەماشاکردنیشیاندا کات بەفیڕۆ دەڕوات و عەقڵ کۆت دەکات و فیکر دەفەوتێنێ، وا لەمرۆڤ دەکات بەبێ هۆشیارانە و بەبێ چاوکردنەوە سەرگەردان ببێت... هیچ شوێنێکم نەبینیەوە بە ئەندازەی وڵاتە عەرەبیەکان فیلمەکانیان بێ ئەرزشبن، هەمویان چیان بوێ بەرهەمی دێنن بەبێ سانسۆری ڕەوشتی یان دینی یان کۆمەڵایەتی، کە بەڕاستی ئەوانە کۆمەڵێ فیلمی نزمن لە مانا و ناوەرۆك و گوزارشدا و لە شێوازی نمایش و ڕەهەندەکانیاندا.

پاشان دکتۆر ﴿الثنیان﴾ دەڵێ: من ئامادەم کە بەهیچ شێوەیە پێویستم بەڕۆڵی ئافرەت نەبێت، ئەوەشم تاقیکردەوە لە شانۆگەری ﴿خزمەتکاری دوو بەڕێزەکە- خادم السیدین﴾ کە بەتەواوی پێویستم بەئافرەت نەبوو، وە پێویستیشم بە مۆسیقا نەبوو بەهۆی چەندین هۆکاری ترەوە لە ئاواز و کاریگەریە دەنگیەکان، کە زۆر باشتربوون لەوەی کە مۆسیقا پێشکەشی دەکات..

وە دەڵێ: من دەتوانم ڕۆڵی ئافرەت لابەرم و قەرەبوی بکەمەوە بەلەوە باشتر، و هەر کارێ بمەوێ دەری بهێنم بەهۆی پیاوانەوە، کە کاریگەری هەبێت لەسەر بینەر، و زانست و فیکر و خۆشی تیا کۆبکەمەوە، ئەوەیە نموونەی شانۆیی ﴿خزمەتکاری دوو بەڕێزەکە﴾، کە لە بنچینەدا پڕە لە ئافرەتان و هەڵوێستە خۆشەکان، کە ئافرەت ڕۆڵی

تیا نابینیّ، و بە زمانی پاراوی عەرەبی نمایشم کرد، و جێگای سەرسامی بینەرانیش بوو بە گشتی، ئەزمونی شانۆ، بەبیّ بەشداری ئافرەت تیایا ئەزمونێکی نویّ نیە، بەڵکو ئەزمونێکە شانۆیی سعودی پیّ ناسراوە بە گشتی، کە توانیویەتی بەدرێژایی بە لایەنی کەمەوە ٣ساڵ دەیان شانۆگەری پێشکەش بکات بەبیّ ئەوەی ئافرەتان بەشدار بن تیایدا.. و لەوەدا بەتەواوەتی سەرکەوتوو بووە، بەڵکو لە ئەمریکا شانۆیەك هەیە ئەزمونی نویّ پێشکەش دەکات، کە ئافرەتانی تیادا بەشدار نابێت، گرنگ هونەرەکەیە نەك ئافرەت.

# ٧٠= ﴿ئەگەر بانگی باوکی نەبوایە خەریك بوو بخنکێت﴾

چیرۆکێکی سەیر و کاریگەر:

بەسەرهاتی ئەم چیرۆکە لەکاتی حەجدا ڕوویداوە، پێش دوو ساڵ لە ناوچەیەکی میللی، کە ناوچەیەکی کەناریە بەسەر کەناری دەریای سورەوە، کە دەکەوێتە باشوری شاری ﴿جدده﴾ لەسەر ڕێگای ﴿الليث﴾ ناوچەیەکە کە خێوەتگەی تێدایە بۆ لاوان و خێزانەکان لەکاتی مۆڵەت و پشوی زستاندا.

ئێمە پێنج لاو بوین، بەیانی گەشتینە ئەوێ و بەسەر کەناری دەریاکەوە خێمەکەمان هەڵدا.. وەك پیشەیەکی ئاسایی حەیوانێکمان سەربڕی و....هتد. بەڵام من، بە ڕاشکاوانە، تەنها من لەناویاندا بووم کە بەهیچ جۆرێ نوێژم نەدەکرد، لەوکاتەدا تەمەنم ٢١ ساڵ بوو، نوێژم نەدەکرد، هەرچەندە باوکیشم ئیمامی مزگەوت بوو، من لە هەموو شتێکدا بیوتایە و فەرمانی بکردایە بەگوێم دەکرد، تەنها نوێژ نەبێت.. لەژیانیدا هەرگیز گوێم لێ نەبووە دوعام لێ بکات، تەنها دەیوت ﴿خوای گەورە چاکت بکات و ڕێنماییت بکات﴾. ئەو خەبەری دەکردمەوە بۆ نوێژ، منیش دەڕۆشتم بە ئۆتۆمبێل بۆ پیاسە، کاتێ دەگەڕامەوە کە نوێژگەران لەنوێژ دەبوونەوە.. چونکە باوکم یەکەم کەس بوو دەڕۆشت بۆ مزگەوت و دواهەمین کەسیش بوو کە دەهاتە دەرەوە.. لەبەر ئەوە پێی نەدەزانیم، من تا ئەندازەیەکی ناسروشت خراپەکار بووم. دوای نان خواردنی نیوەڕۆ، لاوەکان کەلوپەلیان ئامادەکرد تا دابەزن بۆ ناو دەریاکە، و دەبوو یەکێکیش لای چادرەکە بمێنێتەوە، بۆیە من دانیشتم چونکە بە باشی مەلەم نەدەزانی.. بە تەنها لە چادرەکەدا دانیشتم.. لە تەنیشتمانەوە چەند لاوێکی لێ بوو، یەکێکیان بانگیدا، منیش چومە دەرەوەی چادرەکە، بینیمن خۆیان ئامادە دەکەن بۆ نوێژ -لەدڵی خۆمدا ووتم: بامنیش بڕۆم بۆسەر دەریاکە تا بەختی خۆم تاقیبکەمەوە و دوریش بکەومەوە تا ئیحراج نەبم. هەستام و جلم لەبەرکرد و ڕۆشتم.. ڕۆشتم ڕۆشتم تا گەشتمە شوێنێکی باش بۆ مەلەکردن ﴿واتە نە قوڵ بوو نە دوور﴾ مەلەکردن لە ناوچەی ﴿الشعيبه﴾، کەمێك ماندوو بووم، وتم باپاڵکەوم لەسەر پشت، و

کەمێك لەشم فەرامۆش بکەم تا کەمێك بحەسێمەوە پاشان بگەڕێمەوە.. خۆم پاڵخست و کەوتمە سەر ئاوەکە لە پڕ هەستم کرد کە یەکێك لە خوارەوە ڕامدەکێشێ. کەوتمە ژێر ئاوەکەوە. هەوڵمدا بگەمە سەرزەوی ناو ئاوەکە، تا پاڵ بەخۆمەوە بنێم بۆسەرەوە – بەخەیاڵی من ماوەکە نزیکەی دوو مەترە– لەپڕ بینیم دورکەوتومەتەوە و کەوتومەتە ناو گێژاوی ئاوەوە. و نەمدەزانی کە کەوتومەتە شوێنێکەوە قوڵیەکەی نزیکەی ٥مەتر دەبێت.. زۆر هەوڵمدا سەرکەومە سەر ئاوەکە بەڵام نەمدەتوانی، وام هەست دەکرد کەسێك ئەوەتا بەسەرمەوە و سەرمی گرتووە و پاڵم پێوەدەنێ بۆ خوارەوە. هەموو ئەو ڕێگایانەم بەکارهێنا کە لە یانە فێری بووبووم، بەڵام نەمتوانی بێمەوە سەر ئاوەکە.. بێچارە لەو ئاوەدا مابوومەوە لە بارێکدا جێگای بەزەیی بووم.. لەو ساتەدا هەستم کرد کە من لاوازترم لە مێشێك، خەریکە تیادەچم.. وردە وردە هەستم دەکرد خوێن لە مێشکمدا قەتیس دەمێنێت، پاشان هەستم بە مردن کرد..!! دەستم کرد بە بیرکردنەوە لە باوکم و دایکم و خوشك و براکانم و خزمانم و هاوڕێکانم و کوڕانی گەڕەك و پیاوە بەقاڵەکە و هەموو کەسێ کە لە ژیانمدا بینیبێتم.. هەموو ئەو کردەوانەم بیرکەوتەوە کە کردومن.. هەموو ئەوانە لە چەند چرکەیەکی دیاریکراودا.. پاشان بیرم لە خۆم کردەوە...!! لەخۆمم دەپرسی: ئایا نوێژت کرد؟ ئایا ڕۆژووت گرت؟ نەخێر.. ئایا حەجت کرد؟ نەخێر... ئایا خێرت کرد؟ نەخێر... ئێستا تۆ بەرەو لای خوا دەڕۆیت و دنیا بەجێدێڵێت.. هاوڕێکانت بەجێدێڵێت چۆن دەگەیت بە دیداری خوای گەورە؟!! لەپڕ گوێم لەدەنگی باوکم بوو، کە بەناوی خۆمەوە بانگم دەکات: هەستە نوێژ بکە.. سێ جار دەنگەکە هاتە بەرگوێم.. دوای ئەوە گوێم لەدەنگیەوە بوو بانگی دەدا.. هەستم کرد کە نزیکە لێمەوەو یەت و ڕزگارم دەکات.. منیش دەستم کرد بەبانگکردنی، لەکاتێکدا ئاویش دەچوە قوڕگمەوە.. هاوارم دەکرد و هاوارم دەکرد.. کەس وەڵامی نەیایەوە.. هەستم بەسوێری ئاوەکە دەکرد لە قوڵایی جەستەمدا.. خەریك بوو هەناسەم لێ دەبڕا.. دڵنیابووم کە تیاچووم.. هەوڵمدا ووتەی شایەتومان بێنم... ووتم: (اشهد... اشهد...) نەمدەتوانی تەواوی بکەم.. وەك ئەوەی دەستێك گیربووبێت لە قوڕگم و نەهێڵێت شایەتومان بێنم.. هەستم دەکرد گیانم دەردەچێت، لە جوڵە بڕام. ئەوە دواهەمین شت بوو کە بێتەوە یادم.. لەناو چادرەکەدا

خەبەرم بوویەوە.. سەربازێکم لابوو لە ئێشکگرانی کەنارەکە، و کۆمەڵێ لاو لە چادرەکەی تەنیشتمانەوە.. یەکەم هاوار کە کردم، سەربازەکە پێی ووتم: سوپاس بۆ خوا سەلامەتی، پاشان ڕۆشت. لەوەی پاڵم پرسی ووتم: ئەوە کێیە؟ کەی هاتووە؟ و چۆن هاتووە؟ ووتیان: نازانین، لەپڕ هات و ڕزگاری کردیت، وەك دەیبینیت لەپڕیش ڕۆشت!! لێم پرسی: ئایا کاتێ من لە ئاوەکەدا بووم ئێوە منتان بینی؟ ووتیان: هەرچەندە ئێمە لەسەر کەناری دەریاکە بووین، بەڵام سوێند دەخۆین بەخوا تۆمان نەبینیوە و هیچ نازانین سەبارەت بە تۆ، تەنها ئەوکاتە نەبێ ئەو سەربازە تۆی هێناو ڕزگاری کردیت. هەرچەندە بنکەی ئێشکگرتنی کەنارەکان نزیکەی ٢٠ کم لە چادرەکانمانەوە دوور بوو، واتە پێویستی بە نزیکەی سێیەکی سەعاتێك دەکرد تا بگەنە لای ئێمەوە ئەگەر هەواڵیان پێ بدرایە!! ڕووداوی نقوم بوونەکە لەچەند خولەکێکی دیاریکراودا ڕوویدا و ئەوانەی لەتەنیشتمانەوە بوون نزیکترین کەس بوون لەمنەوە، کە سوێند دەخۆن کە منیان نەبینیوە!! بەڵام چۆن ئەو سەربازە منی بینی و ڕزگاری کردم؟!! سوێند بەو خوایەی دروستی کردووم تا ئەمڕۆش نازانم چۆن فریای من کەوت!! مۆبایلەکەم زەنگی لێدا... وەڵامم دایەوە... باوکم بوو.. خەریك بوو شتەکانم تێکەڵ دەکرد.. پێش کەمێك گوێم لە دەنگیەوە بوو، ئێستاش پەیوەندیم پێوە دەکات؟!! وەڵامیم دایەوە: باوکەگیان چۆنی دەنگوباستان؟ لێی پرسیم: تۆ باشیت، سەلامەتیت ﴿چەند جارێ دووبارەی کردەوە﴾. بێگومان نەمدەویست پێی بڵێم تا نیگەران نەبێت.. دڵنیام کردەوە و دوای تەواو بوونی پەیوەندیەکەمان مۆبایلەکەم داخست.. هەستامەوە و دوو ڕکات نوێژم کرد. لە هەموو ژیانمدا وەك ئەو دوو ڕکات نوێژە نوێژم نەکردبوو.. تەنانەت بە نیوسەعات تەواوم کرد.. دووڕکات بە دڵێکی ڕاستگۆیانەوە ئەنجاممدا.. ئەوەندە گریام تیایدا هەتا دەنگم نەدەبیسرا.. لە هەمان ڕۆژدا، کاتێ لاوەکان گەڕانەوە، پێم ووتن: من دەگەڕێمەوە.. گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.. کاتێ گەڕامەوە باوکم لەماڵەوە بوو.. کاتێ دەرگام کردەوە، باوکمم بینی لەبەردەممدا.. ووتی: وەرە، کارم پێتە، ڕۆشتم لەگەڵیدا.. ووتی: سوێندت ئەیەم بەخوا ئەمڕۆ چیت بەسەردا هات.. لەکاتی عەسردا؟ سەرسام بووم و دڵم داخورپا، نەمتوانی قسەبکەم، وام هەست کرد کەسێك هەواڵی پێداوە!! دووجار پرسیارەکەی

دووباره کردەوه.. له ئەنجامدا به درێژی بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوه. لەو کاتەدا پێی وونم: بەخوا من گوێم له تۆوه بوو که بانگت دەکردم، لەکاتێکدا من لەسوجدەی دووەمدا بووم له کۆتا رکاتدا، وەك ئەوەی تۆ له نەهامەتیەکدا بیت که زۆر سەخت و دژواره.. تۆ بەهاوارەوه بانگم دەکەیت، و منیش دڵم خەریکه لەت دەبێ و گوێم له دەنگتەوەیه.. هەستم بەخۆم نەکرد کاتێك نەبێت بەوپەڕی هاوارەوه بانگم کردیت و خەڵکیش گوێیان لێوه بوو.. لەپڕ هەستم کرد وەك یەکێك ئاوی سارد بکات پیامدا.. لەمزگەوت دوای نوێژەکه هاتمه دەرەوه و ڕاستەوخۆ پەیوەندیم پێوه کردیت.. ئایا دەزانیت پەروەردگارت دەتوانێ باری تۆ لەچەند چرکەیەکدا بگۆڕێت، ئەوه شتێکی سادەیه که پەروەردگارت بیکات بەرامبەر بەتۆ، بەڵام خوای گەوره سەرلەنوێ ژیانی پێ بەخشیتەوه.. بۆم دەرکەوت ئەوەی کەمنی لەو ناڕەحەتیه ڕزگارکرد یەکەم خوای گەوره بوو، پاشان دوعای باوکم بۆ من.. ئەوه پێوەدانێکی بچووك بوو له پێوەدانەکانی مردن، تا خوای گەوره نیشانمان بدات، مرۆڤ چەند بەهێز و توانابێت، دەبێته لاوازترین دروستکراو لەبەردەم دەسەلات و هێزی خوای گەوره.. لەو ڕۆژەوه سوپاس بۆ خوا نەمهێشتووه یەك نوێژم بفەوتێ.. ئەی لاوان پێویسته گوێڕایەڵی خوای گەوره و باوك و دایکتان بن.. بڕوام پێ بکەن، ئەوەی لەگەڵ باوك و دایکیدا چاك بێت هەرگیز بێئومێد و بێچاره نابێت... بێگومان چاکەکردن لەگەڵیان بنچینەی بەختەوەری و سەرکەوتن و پارێزگاریته لەخراپه، دوای گوێڕایەڵی خوای گەوره.

## ٧١- ﴿بەسەرهاتی (الهمیان)﴾

بانگی بەیانی بەرزبوویەوە لە منارەکانی حەرەمی پیرۆزەوە لە مەککە لەیەکەم ڕۆژی ڕەمەزانی ساڵی ﴿١٤٠٠﴾ك.. ﴿قعیقعان﴾و ﴿ابو قبیس﴾ دابەزینە ئەو خاکە پیرۆزە. ڕیزی موسڵمانان وەستابوون بۆ نوێژکردن بە دەوری کەعبەدا، لەهەموو لاکانیەوە.. ڕیزەکان لە حەرەمدا کەعبەیان دەبینی، و ڕیزانێك ڕوویان کردۆتە کەعبە.. بەدڵەکانیان دەبینن. لەپشت شاخ و دۆڵ و دەریاکانەوە، لە شارەکان و گوندەکان و بیابان و لوتکەی شاخەکان و ئەشکەوتەکان و ماڵەکان و بەندیخانەکاندا، بەڕیز دەوەستن هەتا موسڵمان لەسەر زەویدا مابێت. لە مەککەی پیرۆزیش کەس لە ماڵەکاندا نەماوە تەنها پیرەمێردێك نەبێت لە تەمەنی ٨٦ساڵیدا، کەسانێك هەن نوێژ دەکەن و ناتوانن بەپێوە بوەستن، بەهۆی ئەوەوە کە سکیان پڕکردووە لە خواردن و خواردنەوەی خۆش لە شیرینی و ترشی و گەرم و سارد و شلە و تنە، ئەمیش وەستاوە نوێژ دەکات و ناتوانێ بە پێوە بوەستێ بەهۆی برسێتیەوە، ڕۆژووی گرتووە بەبێ پارشێو، و دوێنێ ئێوارەش بەبێ نان خواردنی ئێوارە خەوتووە، و ڕۆژی پێشوتریشی بەسەربردووە بەبێ خواردن.. کاتێ لەنوێژەکەی بوویەوە دانیشت لە میحرابەکەیدا بە غەمباری و دڵتەنگی، بیری لەخۆی نەدەکردەوە چونکە تەمەنی بە برسێتی بردبوویە سەر و ڕاهاتبوو پێی.. بەڵام بیری لەو سکە برسیانەی دەورو پشتی دەکردەوە.. ئەگەر پیاوێکی تر لە جێگەی ئەمدا بوایە و ئەو مەینەتیەی ببینیایە، و ئەو دەوڵەمەندانەی ببینیایە کە پارە و سامان تەخشان و پەخشان دەکەن، و لەشتی بێ سوددا خەرجی دەکەن، لەکاتێکدا ئەم پێویستی بە پاروە نانێکە.. ئەوە تورە دەبوو لە دنیاو سەردەم و ڕقی لەخەڵکی دەبوویەوە.. بەڵام ئەو پیاوێکی باوەڕدار بوو.. ووتی: ئاه، سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو بارێك! هەستاو کراسەکەی داکەند و هاواری کرد: ئافرەت وەرە.. ئافرەتێك بە پۆشاکی پیسەوە. ئافرەتەکە ووتی: ﴿ابو غیاث﴾ ئەمە سێ ڕۆژە تامی خواردنمان نەچەشتووە ئەمڕۆ ڕۆژی ڕۆژوو گرتنە و گەرمە.. ئەگەر تۆ و منیش ئارام بگرین، ئەوە کچەکان و پیرەمێردەکە ناتوانن ئارام بگرن.. برسێتی زۆری بۆ هێناون.. پشت بەخوا ببەستە و بڕۆ دەرەوە و شتێکمان بۆ پەیدا بکە، بەڵکو خوای گەورە دەروت لێ بکاتەوە بە چەند پاروە نانێ و شتێکی کەم

تا هەڵی گرین بۆ بەربانگ.. ووتی: پشت بەخوا وادەکەم.. چاوەڕوانی کرد هەتا خۆر بەرز بوویەوە و بوو بە چێشتەنگاو، چووە دەرەوەو بەڕێگاو کۆڵانەکانی مەککەدا دەگەڕا.. لە گەڕانەکەیدا کەسی شك نەبرد، گەرماکە زیادی کرد و قاچەکانی شەکەت بوون و چاویشی بێهێز بوون. لە ناخیدا هەستی بە کوڵان دەکرد لەتاو تینوێتی.. ڕۆشت بۆ خوارەوەی شاری مەککە، خۆی خستە سێبەری دیوارێکەوە.. گەورەترین ئاواتی ئەوە بوو کە مەرگ بێتە میوانی و بە ئیمانەوە بمرێت.. و ڕزگاری ببێت لەو مەینەتیە و بگات بەئاسودەیی هەمیشەیی.. بە دەستەکانی خۆڵی بەردەمی لادەبرد، و هەر بیری لە ئاواتەکەی دەکردەوە، تا دەستی بەر شتێکی لاکێشەی نەرم کەوت، ڕایکێشایە دەرەوەو تەماشای کرد.. تەماشای کرد کلکی مارێکە لە خۆڵەکەدا خۆی حەشارداوە.. پەنای گرت بەخوای گەورە.. پاشان حەزی دەکرد کە بمرێت.. ئاواتی دەخواست کە ئەو مارە بیگەزێت و بیحەوێنێتەوە.. پاشان بیری کەوتەوە کەنابێ باوەڕدار ئاواتە خوازی مردن بێت بەڵکو پێویستە بڵێت: ﴿اللهم احيني ما كانت الحياة خيراً لي، و أمتني إن كان الموت خيراً لي..﴾ ئەمیش وای ووت و داوای لێخۆشبوونی کرد لەخوای گەورە.. دەستیکردەوە بەچاودێری مارەکە، کە نەدەجولا، سەرسام بوو لێی.. قاچی لێدا بەلام نەدەجولایەوە گەڕا بەدوایداو چاڵەکەی هەڵکەند، تەماشای کرد ئەو شتە قامچیە و مار نیە.. ڕایکێشا، کەچی کیسێك هات بەدەستیەوە کە زێڕی تێدا بوو.. لە ڕاوەشاندنی و قورسیەکەیدا ئەوەی بۆ دەرکەوت.. هەستی کرد برسێتی و تینوێتیەکەی نەما.. وەك ئەوەی هێز کرابێتەوە بەبەری پەنجەکانیدا، و لاوێتی گەڕابێتەوە بۆی.. وێنای ئەوەی کرد کە تێریی و حەوانەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ ماڵ و منداڵەکەی.. و سکیان پڕدەکات بەوشتانەی خەونی پێوە دەبینن و ناز و نیعمەتەکانی دنیایان نیشان دەدات.. بیری دەکردەوە کەچی بکڕێت بۆیان.. و چۆن خوای گەورە خستونیەتە ناز و نیعمەتەوە، پاشان ئاینەکەی بەئاگای هێنایەوە و دەنگی پاراستنی ئەمانەت بەرز بوویەوە و پێی ووت: ئەم ماڵ و سامانە هی تۆ نیە.. بەڵکو دۆزراوەیەکە و پێویستە بۆ ماوەی ساڵێك بەدوای خاوەنەکەیدا بگەڕێیت، ئەگەر خاوەنەکەیت نەدۆزیەوە ئەوە دەبێ بە هی تۆ.. بیری لە درێژایی ساڵێك چاوەڕوانی دەکردەوە، ئایا بۆ ساڵێکی تر ئەم دەمێنێ؟ ئایا خێزانەکەی لە ژیاندا دەمێنێت؟ ئەبێ

ئەو زێڕە سودی چیبێت بۆی ئەگەر ئەم لە برسانا بمرێت.. ئەوانەشی کە دەبنە میراتی بمرن؟ هەستی کرد کە هێزی لەبەرا نەماوە، ئاواتی دەخواست گەنجینەکە بخاتەوە شوێنی خۆی، و توشی ئەم نائارامیە نەبوایە.. بەڵام مرۆڤێکی هۆشمەند بوو، دەیزانی ئەگەر دۆزراوەیەك دۆزرایەوە پێویستە ئاشنا ببێت پێی، ئەگەر وابوو بیخاتەوە شوێنی خۆی، چونکە ئەو بەرپرسە لێی.. بەڵام ئەگەر دەستی لێ نەدات هیچی لەسەر نیە.. بیرۆکەکان هەر بەمێشکیدا دەهات، تا ئەو ئەندازەیەی وای هەست دەکرد کە ئێسکی سەری خەریکە تێك دەشکێت بەهۆی ئەو جەنجاڵیەی ناو مێشکیەوە.. لەپڕ دەنگێ هاتە بەرگوێی: هەڵی گرە ئەمە ڕۆزی خوایە و ناردویەتی بۆ تۆ.. تا کچەکانت لەبرساندا نەمرن، کە ئەوەتا ئێستە لە لێواری مەرگدان.. سکی ئەوانی پێ تێر بکە، پۆشتە و پەرداخیان بکە، کاتێکیش بارودۆخت و گوزەرانت باش بوو بیگێڕەوە بۆ خاوەنەکەی، یان ئەو پارەیەی لێت خەرج کرد بیگێڕیتەوە شوێنی خۆی هیچی تێدا نیە.. پاشان گوێی لەهاواری ئاینەکەیەوە بوو پێی دەوت: پیاوەکە ئارامبگرە، ناپاکی لە ڕاسپاردەکەت مەکە.. و سەرپێچی پەروەردگارت مەکە، و خۆت ڕاگرە لەسەر ئارامگرتن، و پشت بەخوا ببەستە، پۆشت بۆ ماڵەوە و گەنجینەکەی شاردەوە هەتا خاوەنەکەی دێتەوە.. یان تا حوکمی خوایی بۆ دەردەکرێت. بە ئەسپایی ڕۆشتە ماڵەوە، ژنەکەی ئەمی بینی و پێی ووت: ئەی ﴿ابو غیاث﴾ ئەوە چیە پێت؟

ووتی: هیچ، ویستی بۆی باس نەکات و بە نهێنی بیهێڵێتەوە.. بەڵام پێشتر هیچی لێ نەشاردبوویەوە. ژنەکەی ووتی: نەخێر، بەخوا شتێکت پێیە، ئەوە چییە؟ ترسا ژنەکەی بیبینێ و بەرگە نەگرێت.. بۆیە بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، بەڕاستی ژنێکی ئیمانداری خواناس بوو، بەڵام لەڕووی ئیرادە و لێبڕانەوە لەو لاوازتر بوو، بۆیە ووتی: بیکەرەوە چەند دینارێکی لێ دەربهێنەو هەندێ شتی پێ بکڕە بۆمان، بەڕاستی ئێمە ناچارین و ناچاریش دەتوانێ گۆشتی مردارەوەبوو بخوات. مێردەکەی ووتی: نەبەخوا شتی واناکەم، ئەگەر دەستی لێوە بدەیت یان هەواڵ بەکەسێك بدەیت، ئەوە تەڵاقت کەوتبێ.. بۆیە لەماڵەوە جێی هێشت و ڕۆشتە دەرەوە تا بەدوای خاوەنەکەیدا بگەڕێت، بەڵکو شتێکی حەڵاڵی لێ دەست بکەوێت تا بتوانێ مەینەتی ماڵ و

منداڵەکەیی پێ کەم بکاتەوە. ڕۆشت بۆ حەرەمی پیرۆز، لەوێ لاوێکی خەڵکی ﴿تەبەرستان﴾ی لێ بوو کە گەڕیدەی زانست بوو.. لاوە تەبەریەکە ووتی: ﴿خوراسانیەکم بینی هاواری دەکرد، ئەی حاجیانی ماڵی خوا، کێ گەنجینەیەکی دۆزیوەتەوە کە هەزار دیناری تێدایە، با بیگێڕێتەوە بۆم، خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە، یەکێ لە زاناکانی خەڵکی مەککە ووتی: ئەی خوراسانی، شاری ئێمە خەڵکەکەی هەژارە، گوزەرانیان سەختە، بەڵکو کەوتبێتە دەستی پیاوێکی باوەڕدارەوە حەزبکات تۆ شتێکی بەیتێ و ئینجا بیگێڕێتەوە بۆت. خوراسانیەکە ووتی: چەندی ئەوێ؟ دەیەك، سەد دینار. ووتی: شتی وا ناکەین ، دەیدەینە دەستی خوای گەورە.. ئیتر جیابووەوە. تەبەریەکە ووتی: هاتە دەروونمەوە کە ئەو پیاوە دۆزیویەتیەوە، منیش شوێنی کەوتم، وەك گومانم برد، ڕۆشتە ماڵێکەوە، گوێم لێبوو دەیوت: سڵاو ئەی ﴿لوبابە﴾.. ژنەکە ووتی: بەخێربێیتەوە ئەی ﴿ابو غیاث﴾ ووتی: خاوەنی پارەکەم بینیەوە هاواری دەکرد بۆی، منیش پێم ووت: تۆش ئەندازەیەك دیاری بکە بۆ ئەوکەسەی کە دۆزیویەتیەوە، ووتی: چەند؟، ووتم: دەیەك.. ووتی: شتی واناکەم، بەڵکو دەیدەمە دەستی خوای گەورە.. ئەی ئێمە چی بکەین.. پێویستە هەر بیگێڕمەوە بۆی.. ژنەکەی پێی ووت: ئێمە پەنجا ساڵە لەگەڵ تۆدا بەهەژاری دەیگوزەرێنین، تۆ چوار کچ و دوو خوشك و من و دایکم و تۆش نۆ کەسین.. ئەی ﴿ابو غیاث﴾ بەڕاستی خوای گەورە ڕێز لەکەسێ دەنێ کە خزمەت بەوانە بکات.. تۆ نەتدزیوە و داگیریشت نەکردووە.. بەڵکو خوای گەورە خستویەتیە نێو دەستت، دەست بە ڕۆزیەکەوە مەنێ خوای گەورە بۆی ناردبیت، خوای گەورە سەبارەت بەو ئافرەتانە پرسیار لەتۆ دەکات.. تەبەریەکە ووتی: تەماشای ڕوخساری پیاوەکەم کرد، هەستم کرد کە پێیەوە دیارە هەست دەکات کچەکانی برسی و ڕووت و ڕەجاڵن، ئەو پیرەژنە هەژارەش دایکی ﴿لوبابە﴾ پێستی وشك بۆتەوە بە ئێسکەکانیەوە، دەڵێی داری وشك هەڵاتووە.. بۆیە دڵی سوتا بۆیان و فرمێسك بەڕوومەتیدا هاتە خوارەوە.. کاتێ ئەو ئافرەتەشی بینی دڵی زیاتر هاتە کوڵ.. کەچی خۆی ڕاگرت، خۆزگەی دەخواست ئەگەر بیتوانیایە چەند دینارێکی لێ دەربهێنایە.. بەڵام هاتەوە یادی کە ئەو ماوەی پەنجا ساڵە ئارام دەگرێت.. چۆن دەبێت بۆ لەزەت بینینی ڕۆژێك ئەو تەمەنە هەمووی بفەوتێنێ، و

هاتەوە یادی کە نزیکیش بۆتەوە لە لێواری مەرگ، و دەگات بەدیداری خوای گەورە.. نابێ بەناپاکی لە ڕاسپاردە بگات بەدیداری ئەو.. منداڵەکانیشی خوای گەورەیان هەیە، بەڕاستی خوای گەورە بەسۆز و میهرەبانترە بۆیان. بۆیە خۆی کۆکردەوە و بەلێبڕاوانە و باوەڕێکی پتەوەوە بە ژنەکەی ووت: شتی واناکەم، من خەرمانی کردەوەکانم دوای هەشتاو شەش ساڵ ناسوتێنم.

تەبەریەکە ووتی: پاشان بێدەنگ بوو، ژنەکەشی بێدەنگ بوو، منیش ڕۆشتم. بانگی مەغریبی دا، پیاوەکە و ئافرەتەکان دانیشتن لەسەر چەند دەنکە خورمایەك.. خەڵکیش بە دەوری ئەواندا دانیشتبوون لەسەر سفرەی پڕخواردن، لە ماڵەکانیانەوە بۆن و بەرامی برژاو و شیرینی بەرز دەبوویەوە، دەیانخوارد و لەزەتیان دەبینی، لەبیریان چووبوو کە مانگی ڕەمەزان مانگی مرۆڤایەتی و بەخشینە، و خوای گەورە ڕۆژووی لەسەر فەرز نەکردوون بۆ برسێتی و تینوێتی و سزا.. بەڵکو بۆ ئەوەیە ئەو برسێتیەمان بێنێتەوە یاد بەشێوەیەکی کاتی، و کەسانێك هەن لەم دنیایەدا کە بەزۆر برسی کراون، کە ڕزگاریان نابێ لێی و بۆ کاتێکی دیاریکراویش نیە.. و تاوەکو لەمێشکمان و ئەندامەکانماندا هەست بەچاکە بکەین ئەوەی دادەنیشێ لەسەر سفرەو خوانی پڕ خواردن و دراوسێکەشی بە برسێتیەوە دەناڵێنێ، و ئەمیش بیری لێ ناکاتەوە و بەشداری ناکات لەخواردنەکەیدا، ئەوە نە ڕۆژوی گرتووەو نە مانای ڕۆژوگرتنیش دەزانێ، با بەدرێژایی ڕۆژیش برسی و تینوو بێت. نەریت هەست لاواز دەکات، و ڕاهاتن بە ڕۆزیی لەزەتەکەی لادەبات، لەبەرئەوە خوای گەورە ڕۆژووی فەرز کرد بەسەرماندا، تا هەست بە تاڵیی لەدەستدان بکەین و دەرك بەشیرینی ویژدان بکەین، و تا بەڕۆژدا ئیشتیهامان بۆ پاروە نانێك و قومێك ئاوی سارد بڕوات، و بزانین کە ئەو پاروە نانە و ئەو قومە ئاوە ساردە، ڕۆزیەکە لە ڕۆزیەکان.. نابێ دەست بە هیچ چاکەیەکەوە بنێین با کەمیش بێت. و نابێ خۆمان لە بەخشینێك بگرینەوە کە دەتوانین بیکەین.. (إبْراهیم الحربی) هەموو ڕۆژێ تەنها یەك نانی هەبوو، هەموو ڕۆژێ پارویەکی لێ لادەدا، کاتێك ڕۆژی هەینی دەهات، پاروە نانەکانی دەخوارد و نانەکەی ئەو ڕۆژەی دەکرد بەخێر.. ئەو پیاوە ئیماندارەش بیری لەوە دەکردەوە بۆیە خەفەتی خوارد بۆ حاڵی موسڵمانان، پاشان بیریکردەوە کە خوای گەورە ڕۆزی دەرە،

بۆیە وەك ئیماندارێکی ڕاستەقینە سوپاسی خوای گەورەی کرد. شەوی چوارەمی بەبێ خواردن بردەسەر.. چونکە چەند دنکە خورماکەی جێهێشت بۆ کچ و ئافرەتەکان.

(تەبەری) دەڵێ: کاتێ بەیانی هات، گوێم لەپیاوە خوراسانیەکەوە بوو دەیوت: ئەی حاجیانی ماڵی خوا لە خەڵکی شار و دەشت ئەوەی کیسێکی دۆزیوەتەوە کە هەزار دیناری تێدایە، با بیگێڕێتەوە خوای گەورە پاداشتی بداتەوە، پیاوەکە هەستایەوە و وتی: ئەی بەندەی خوراسانی دوێنێ پێم وتیت و ئامۆژگاریم کردیت، وڵاتەکەی ئێمە هەژارە و ڕۆزی و کشتوکاڵی کەمە، پێم وتیت ئەگەر سەد دینار بدەیت بەو کەسەی کە دەیدۆزێتەوە، بەڵکو ئەمە خوای گەورە بیخاتە دەست بەندەیەکی ئیماندار کە لەخوای گەورە بترسێت.. تۆش ڕازی نەبوویت.. ئێستا تۆ دە دیناری بۆ بگێڕەوە بەڵکو ئەو دە دینارە ببێتە هۆی هاوکاری و گرۆیی ئەو.. خوراسانیەکە پێی ووت: واناکەم، بەڵکو دەیدەمە دەستی خوای گەورە. پاشان جیابوونەوە. بۆ ڕۆژی دواتر خوراسانیەکە دەستی کردەوە بەهاوارکردن.. پیاوەکە هەستایەوە و پێی ووت: ئەی خوراسانی، پێرێ پێم ووتیت دەیەکی بدەرێ، دوێنێ ووتم: دەیەکی دەیەك، واتە دە دینار، تۆ هەر ڕازی نەبویت، ئێستا دەیەکی دەیەکی دەیەکی ببەخشە تا بەنیو دینار گۆزەیەك بکرێت تا ئاوی پێ بدات بەوانەی لە مەککەدان بە کرێ و بە نیو دینارەکەی تریش خواردنێکی پێ بکرێت، و بیباتەوە بۆ منداڵەکانی. ووتی: بابەگیان، شتی واناکەم و دەیدەمە دەست خوا.. پیاوەکە بۆی دەرکەوت کە هیچ لەبەردەستا نەماوە و بێئومێد بوو، بیری لەحاڵی کچەکانی و دوو خوشکەکەی و ژنەکەی و دایکی دەکردەوە.. و ئەو خوراسانیە ڕازی نەبوو لە هەزار دینار یەك دینار ببەخشێت تا ئەم برسێتی و ڕووت و ڕەجاڵی خێزانەکەیی پێ دەربکات، و مردن لە بۆسەدایە بۆی، و هەزار دینارەکەش بەدەستیەوە بوو، دەروونی لەگەڵیدا دوا کە نەیداتەوە، یان یەك دیناری لێ دەربهێنێ بەڵام بیری لە خوای گەورە و ڕۆژی لێپرسینەوە کردەوە، لەبەر ئەوە پەنای گرت بەخوای گەورە لەو خەیاڵاتانە، ئایا مەینەتی هەمیشەیی بکرێت بە لەزەتێکی کاتی، و ئەو دەزانێت کە لەزەتی دنیا هەموی نابێتە هۆی لابردنی بەڵایەك و ناڕەحەتیەکی ڕۆژی زیندووبوونەوە، و هەرچی ناڕەحەتی دنیایە بە هاڵاوێکی بەهەشت لەبیر

دەچێتەوە!! بەڵێ، دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە(د.خ) کە فەرمویەتی ﴿من ترك شيئا لله عوضه الله خيراً منه﴾واتە:{ئەوەی واز لە شتێك بهێنێت لەبەر خوای گەورە، ئەوە خوای گەورە لەوە باشتر قەرەبووی بۆ دەکاتەوە}. بۆیە پارەکەی دایەوە، خوراسانیەکەش ووتی: وەرە ئەو کیسە، پارەیە بەرەوە.... پێی ووت: وەرە لەگەڵم.

تەبەری ووتی: ڕۆشتن و منیش دوایان کەوتم، هەتا گەشتنە ماڵەکە، پیاوەکە ڕۆشتە ژورەوەو زۆری نەبرد هاتە دەرەوە... ووتی: وەرە ژورەوە ئەی خوراسانی، ڕۆشتە ژورەوەو منیش ڕۆشتمە ژورەوە، پیاوەکە لەژێر قادرمەیەکدا کیسە ڕەشەکەی دەرهێنا، ووتی: ئەمە پارەکەت؟ تەماشای کرد و پێی ووت: ئەمە پارەکەی منە. سەرێکی ڕاوەشاند و پاشان پارەکەی هەڵڕشت و چەند جارێ ئەمدیو دیوی کرد، و پاشان ووتی: ئەمە دینارەکانی ئێمەیە. ﴿لوبابە﴾ و کچەکان لەدرزی دەرگاکەوە تەماشای زێڕەکانیان دەکرد شێوە و ڕەنگیان لەبیر چووبوویەوە، وایان زانیبوو لەزەویدا نەماوە.. وەك چۆن برسی تەماشای بنی مەنجەڵ دەکات، و ئاواتەخوازە کە پارویەکی لێ بخوات.. پیاوەکە ئاڵتونەکەی کردەوە ناو کیسەکە و بەستیەوە، دای بە شانیداو هەستایەوە و ڕۆشتە دەرەوە.. تەماشای ڕوخساری خاوەن ماڵەکەشی نەکرد و تەنانەت سوپاسیشی نەکرد.. ﴿لوبابە﴾ وای هەست دەکرد کە منداڵێکی تاقانەی لەدەست داوە وەك ئەوەی پارچەیەك لەدڵی کرابێتەوە، ڕایکرد بەدوایدا، کچەکان گرتیان، لە سەرسامیدا هەموویان واقیان وڕمابوو.. کاتێ دوورکەوتەوە و بێ ئومێدبوون لێی، بەهۆی برسێتی و لاوازی و بێتاقەتیەوە کەوتن بەسەریدا.. پیاوەکە گوێی لە جوڵەیەکەوە بوو، تەماشای کرد خوراسانیەکە گەڕاوەتەوە.. سەری بەرز کردەوە بۆی و ووتی: چیت دەوێ، هەقی خۆی بوو ڕووی نەداتێ و ڕقی لێی بێت، چونکە تەنانەت دینارێکیشی پێ نەدا، تا ئەو دەروونە برسیانەی پێ تێر بکات و لە مردن ڕزگاریان بکات.. بەڵام خاوەن ماڵ پیاوێکی لێبووردە بوو، دڵی جێگای توڕەیی تیادا نەدەبووەوە.. هەستایەوە لەبەری لێی پرسی بۆچی گەڕاوەتەوە. خوراسانیەکە ووتی: خاوەن ماڵ، باوکم مردووە و سێ هەزار دیناری بەجێ هێشتووە، منیش سێیەکیم دەرهێنا کە هەزار دینار دەکات، لە ناو ئەم تورەکەیەدا دامنا، هەتا ئێرە کەسم نەبینی کە لە تۆ شایانتر بێت پێی.. دەی تۆ بیگرە و بە حەڵاڵت بێت.. داینا و

ڕۆشت. تەبەری ووتی: منیش ڕۆشتم، تەماشام کرد خاوەنماڵەکە بە خێرایی ڕادەکات بە دوامدا و بانگم دەکات، منیش گەڕامەوە بۆ لای پێی ووتم: من تۆ دەبینم لە یەکەم ڕۆژەوە چاودێریمان دەکەیت.. زانیم کە ئاگات لە گوزەرانمانە، گوێم لە ﴿احمد بن مسليم اليربوعي﴾ بووە دەیوت: گوێم لە ﴿نافع﴾ەوە بووە دەیوت: لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە کە پێغەمبەر(د.خ) بە عومەر و عەلی فەرمووە: ﴿إذا اتاكم الله بهدية بلا مسئلة ولا إستشراف نفس فاقبلاها، ولا تردّاها فتردّاها على الله فهى هدية من الله، والهدية لمن حصر﴾ دەی وەرە لەگەڵمدا ڕۆشتم لەگەڵیدا، و پێی ووتم: تۆ موبارەك و پیرۆزیت، من هەرگیز ماڵی وام نەبینیوە ئایا ئەو کراسە دەبینیت؟ بەخوا من بەیانیان هەڵدەستم و نوێژی پێوە دەکەم، و پاشان دایدەکەنم و ژنەکەم و دایکی و کچەکانم و خوشکەکەم یەك لەدوای یەك نوێژی پێوە دەکەن، پاشان من دەیکەمەوە بەرم و دەڕۆم بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیان، پاشان دەگەڕێمەوەو کەمێك خۆراك دێنمەوە. هەتا گەشتینە ماڵەکە هاوری کرد، ئەی ﴿لوبابە﴾ ئەی فلان... هەتا هەمویان هاتن لەلای چەپی دانیشانم و کیسەکەی کردەوە و ووتی: پریاسکەکانتان درێژ بکەن، من درێژم کرد، ئەوان پۆشاکەکانیان پریاسکەی نەبوو، ئەو دەستی کرد بە ژماردنی دینارەکان، هەتا گەشتە دەیەمین و ووتی: ئەوە بۆ تۆ، تا کیسەکەی خاڵیکرد.. هەریەکەیان سەد دیناری پێدان و سەد دیناریشی دا بەمن. کاتێ بانگی ئێوارە درا، سفرەی ئەو پیاوەش وەك سفرەی ماڵەکانی تر ڕازایەوە، پڕ بوو لەخواردنی خۆش، بە خێزانی ووتی: ئایا بینیت ئەی لوبابە؟ بەڕاستی خوای گەورە پاداشتی ئارامگران زایە ناکات ﴿إن الله لايضيع أجر المحسنين﴾ ئەی لوبابە، ئێمە تەنانەت یەك دیناری حەرامیشمان لە خۆمان حەرام و قەدەغە کرد، خوای گەورە هەزار دیناری بۆ ناردین، پیاوەکە چەند پاروە نانێکی خوارد و پاشان هەستا تا بڕواتە دەرەوە، خێزانەکەی پێی ووت: بۆ کوێ ئەی ﴿ابو غياث﴾؟ ووتی: دەگەڕێم بەڵکو کەسێکی هەژار هەبێت بەڕۆژوو بێت ئەوەندە خواردن شك نەبات بەربانگی پێ بکاتەوە، با بەشداری بکەین لەم خواردنەی خۆماندا. بەڕێز مامۆستای ئیمام ئەبو جەعفەری کوڕی محمدی کوڕی جدید الطبري دەڵێ: خوای گەورە بەهۆی ئەو چەند دینارەوە سودمەندی کردم و بووە هۆی بەهێز بوونم و چەند ساڵێك سەرقاڵی زانست بووم، و دوای شانزە ساڵ گەڕامەوە بۆ مەککە..

کچەکانم بینی لە ماڵ و حاڵی خۆیاندا بوون، و زانیم کە پیاوەکە دوای ئەوەی من بەجێم هێشتوون پاش چەند مانگێك وەفاتی کردووە، منیش دەچوم بۆ لای مێرد و منداڵەکانیان و ئەو بەسەرهاتە و بەسەهاتی ترم بۆ دەگێڕانەوە ئەوانیش زۆر ڕێزیان لەمن دەگرت.. دوای چل ساڵی تر هەواڵم پرسین، بۆم دەرکەوت کە کەسیان نەماون، خوای گەورە ڕەحم بەهەموویان بکات.

قصص من التأريخ/علی طنطاوي..

# ٧٢-﴿پیاوێك جن بەریكەوتووە لە ئۆتۆمبێلەكەیدا﴾

(ابو نهار الشهری) دەیگێڕێتەوە: هەموو ئێوارەیەك دەڕۆشتم بۆ كۆرنیشی شاری ﴿الدمام﴾ تا سەعاتێك بەسەربەرم لەئەنجامدانی وەرزشی پیادە ڕۆشتن، ئەو ڕۆژە من ئۆتۆمبێلەكەم وەستاندبوو لەپشت ئۆتۆمبێلەكەوە لە كۆرنیش، لەناو ئۆتۆمبێلەكەی پێشەوە كەسێكی ئەسمەرم بینی كە جننی بەركەوتبوو لە ئۆتۆمبێلەكەدا، توشی ڤ بوو بوو، بەلای ڕاست و چەپدا پەلە قاژەی دەكرد. دەرگام كردەوەو هەوڵمدا دابەزم، گوێم لەدەنگێكی بەرزەوە بوو لە ئۆتۆمبێلەكەی پێشمەوە، دەنگی مۆسیقایەكی زۆر بەرز. سبحان الله... پێش ئەوەی دەست بە وەرزشەكەم بكەم بەخۆمم ووت: ئایا خوای گەورەی بێنمەوە یاد و ئامۆژگاری بكەم و كاسێتێك لە كاسێتەكانی لای خۆمی بەمێ، بەڵكو خوای گەورە لەسەردەستی من هیدایەتی بدات.. من نیازێكی ڕاستگۆیانەم هەبوو لەگەڵ خوای گەورەدا.. دوعام كرد و كاسێتێكم هەڵگرت بە ناونیشانی ﴿الحافە﴾ی بەڕێز مامۆستا ﴿خالد الراشد﴾-خوای گەورە پارێزراوی بكات- كاتێك نزیك بوومەوە لێی و بینیم لە حاڵەتێكی هیستریادایەو دەمج بووە لەگەڵ گۆرانیەكەدا.. كاتێك منی بینی داخورپا و ووتی: منت ترساند... خێرە، كارێكت هەبوو. سڵاوم لێكرد بە بزەوە و ئەویش بە بێتاقەتیەوە وەڵامی دامەوە.

ووتم: برام ناوت چیە؟

ووتی: خێرە، كارێكت هەبوو؟

ڕاستەوخۆ ووتم: من برات ﴿ابو نهار﴾م، حەزدەكەم دیاریەكت پێشكەش بكەم..

ووتی: بەڵێ، چیە دیاریەكە؟

ووت: فەرموو، كاسێتەكەی گرت و ئەمدیودیوی كرد و ووتی: ئەمە چیە؟

ووتم: تكات لێدەكەم، كە گوێی لێ بگریت، و سوێندت دەدەم بەخوا كە بەتەواوی گوێی لێ بگریت.. پێم ووت: من دەڕۆم و كەمێك پیادە ڕۆشتن دەكەم، بەیارمەتی خۆت.

ووتی: سوپاس.

من وەك عادەتی خۆم ڕۆشتم و دەستم بە پیادە ڕۆشتن كرد، بەدرێژایی ئەوكاتە لەخوا دەپاڕامەوە كەدڵی بكاتەوە.. دوای تێپەڕبوونی سەعاتێك و كاتێك گەڕامەوە بۆلای ئۆتۆمبێلەكەم، ئۆتۆمبێلی هەمان كەسم بینی وەستابوو نەجوڵابوو، منیش تەماشای

ئۆتۆمبێلەکەم کرد و کەسم نەبینی تیایدا، تەماشای لای دەریاکەم کرد، لەوێشەوە کەسم نەبینی، نزیك بوومەوە لە ئۆتۆمبێلەکە، و گوێم لەدەنگی کاسێتەکەوە بوو، کە دەنگی بەرز بوو، پیاوەکەشم بینی، بەکوڵ دەگریا.

ووتم: فلان کەس ئەوە چیتە؟

وەلامی نەدامەوە.. بەخوای گەورە.. بەخوای گەورە، هەرکەس بیبینیایە وای هەست دەکرد منداڵێکی شیرەخۆرە و دەگری.. دەرگای ئۆتۆمبێلەکەم کردەوە و سەریم بەرز کردەوە، و ئەو هەر دەگریاو فرمێسك ڕوخساری تەنی بوو، بەدەنگێکی نزم کە بەئەستەم دەبیسترا گوێم لێوە بوو ووتی: ﴿دادو بێداد بۆ من، پەروەردگارم لێم ببورە﴾ کاتێك تێگەشتم لەوەی کە لە چ بارودۆخێکدایە، شتێکی سەیرم بەسەرداهات، کە ناتوانم وەسفی بکەم، بەلام خۆم نەگرت و لەگەڵیدا گریام، نەك بۆ خەفەت خواردن بۆ ئەو، بەڵکو بەهۆی دڵخۆشیمەوە بۆ ئەو لاوە.. سوپاس بۆ خوا.. وازم لێ هێنا کەمێك بحەسێتەوە و پاشان ووتم: ئێستە چۆنی؟ ووتی: لە سینەمدا هەست بەشتێکی نامۆ دەکەم. ووتی: مامۆستاگیان بەڕاستی من لەژیانمدا نمونەی ئەم قسانەم نەبیستووە، من لەکوێ بووم، بۆیە بەکوڵ دەستی کردەوە بەگریان.. پێم ووت: بگری و ئەوەی لەدڵتایە فڕێی بدە دەرەوە، لەخوای گەورە داواکارم خێرت بۆ ئیسلام و موسڵمانان هەبێت. ووتم ناوت چیە؟ ووتی: ﴿سەعد﴾. ووتم: کاك سەعد ئەمڕۆ ڕۆژی لەدایك بوونتە و ئاواتەخوازم ئەم شەوەت سەرەتای ژیانی تۆ بێت، لەگەڵ ئەو پەروەردگارەدا، کە دووربوویت لێیەوە لە کاتێکدا کە ئەو زۆر زۆر نزیکە لێتەوە، لەخوای گەورە دەخوازم کە دامەزراوت بکات.. ووتی: ئامین.

ژمارەی مۆبایلەکەم پێداو، پێم ووت، ئەگەر پێویستت بەهەر شتێك بوو ڕاڕا مەبە و پەیوەندیم پێوە بکە.. لەخوای گەورە دەخوازین کە ئەو بەڕێزە دامەزراو بکات، لەگەڵ هەموو موسڵمانانندا.....ئامین.

# ٧٣- ﴿شاعیرێك لەسەر نێت﴾

خوشك و برایانیٚ بەرێز و ئیماندار.

سڵاو و رەحمەت و بەرەكاتی خوای گەورەتان لیٚ بێت، وە پاشان من بەسەرهات و چیرۆكی خۆمتان بۆدەگێڕمەوە لەگەڵ خۆشەویستیدا.. پاشان تەوبە كردنم و گەڕانەوەم بۆلای خوا. بەڵكو خوای گەورە بەهۆی ئەم پەیامەوە سود بەو عاشقانە بگەیەنیٚ كە كەوتونەتە بۆسەی وەحشە بیٚ بەزەییەكانەوە. بەڵام دەیەویٚ تەوبە بكات و بگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە.. ئەمڕۆ من لە دەرگای ئەو نەخۆشەوە بۆتان دەگێڕمەوە، كە پێش ئێوەكەوت بۆ چارەسەركردن، و حەزدەكەم كە ئاشنا بن، تا ئێوەش پەند و وانە وەربگرن.. وە من كاتێك ئەو بەڵایەم بەسەرداهات، ئاواتەخواز بووم یەكێك بهاتایە و رێنمایی بكردمایە.. و بەڕاشكاویەوە من كاتێك رێنمایی و بۆچونی مامۆستاكان و بانگخوازانم دەخوێنمەوە، دەڵێم ئەوانە قسەی تیۆرین، چونكە ﴿لەوانەیە﴾ ئەو كێشەیان تاقی نەكردبێتەوە، و پێوەی نەتلاونەتەوە، وەك چۆن ئێمەی لاو گرفتاری بوین.. ئەوەتا من چۆن خێر و چاكەم بۆخۆم دەوێت، بۆ ئێوەشم دەویٚ، و قسەتان لەگەڵدا دەكەم وەك مرۆڤێك، كە خۆشەویستی تاقیكردۆتەوەو گرفتار بووە و بە كۆمەكی خوای گەورەش ڕزگاری بووە و گەڕاوەتەوە بۆ لای خوای گەورە.. دەی گوێم لیٚ بگرن، خوای گەورە پاداشتان بداتەوە. من ناوم ﴿ابو عبدالله﴾یە لە سوریا، تەمەنم ٢٥ ساڵە، لە زانكۆ دەخوێنم و لە هەمان كاتیشدا لە بواری كۆمپیوتەردا كاردەكەم.. دیندارم، و سوپاس بۆ خوا عاشقی ئیسلام و پیاوچاكانم، و حەز و ئارەزووم وەك زۆربەی لاوانی تر دانیشتنە لەبەردەم ئینتەرنێتدا.. كێشەكەم لەو كاتەوە دەستی پێكرد، كە جارێكیان لەبەردەم ﴿نێت﴾دا دانیشتبووم، لەكاتی گەڕان بەناو سایتەكاندا هەستم بە بێزاریەكی زۆر كرد، حەزم كرد كەمێك لەزەت لەكاتەكان ببینم، ووتم قەیناكا با بڕۆمە ناو پێگەكانی وتووێژو قسەكردن لەگەڵ خەڵكیدا سەبارەت بەهەر بابەتێكی بەسود بێت، بۆیە وام كرد و لەویٚ چەندین لاوی كوڕ و كچم بینیەوە قسەیان دەكرد و پێدەكەنین و خۆشیان دەگوزەراند.. بەڵام من تەنها دەمەویست سەبارەت بە بابەتە بەسوودەكان قسە بكەین، بەشداریم نەدەكردن، كەمێك چاوەڕوان بووم. ویستم من بابەتی بەسود پێشنیار بكەم، تا قسە بكەین لەسەری،

بەڵام زانیم لەوێدا بوار نیە بۆ قسەکردن لەسەر بابەتە ئاینیەکان و تەقوا، چونکە لەو کاتەدا من وەك پیاوێکی ئاینی دەردەکەوم، کە وتار و ئامۆژگاری پێشکەش بکات لە هۆڵێکی سینەمادا کە پڕیەتی لە کەسانی خراپ، بۆیە پاشەکشەم کرد.. توانیم لە دەرگای شیعر و ئەدەبەوە بچمە ژوورەوە، چونکە خۆم زۆرحەزم لە شیعر بوو، دەستم کرد بە نوسینی شیعر، بەبێ ئەوەی داوابکەم لەکەس بەشداری بکات لەگەڵم، بەڵام هەندێ لە کوڕان و کچانی گەنج حەزیان لە شیعرەکانم بوو، بۆیە داوایان لێ دەکردم کە بەشداریان پێ بکەم، و هەیانبوو لەشیعردا کێبڕکێی لەگەڵدا دەکردم، بەو شێوەیە ئەو شێوازی دەربڕینە پێگەی باشی من بوو، وە بەهۆی شیعر و ئەدەبەوە چەندین پەیوەندی هاوڕێیانەم بەست. یەکێ لەو پەیوەندیانە لەگەڵ کچێکدا بوو، لەدوایدا بۆم دەرکەوت کە شاعیرە و چەندین بەشداریی هەیە لە زۆرێك لە سایتەکانی شیعر و ئەدەبدا.. خوا شایەتە کچێکی زۆر بەڕەوشت بوو لە قسەکردنی و بەشداری کردنی لەو پەیوەندیانەدا تا بۆم دەرکەوت ئەو تەنها بۆیە ئەو پەیوەندیانە سازدەکات بۆ بێتاقەتی دەرکردنەو نەمانی بێزاری، کتومت وەك ژیانی من.. جارێکیان لەبەردەم نێتدا دانیشتم و هەستام بە تۆمارکردنی چوونە ناو ماسنجەرەوە، لەپڕ کەسێك داوای لێکردم پەیوەندی لەگەڵدا ببەستم کە پێشتر ناویم نەبیستبوو، منیش ڕازی بووم، کەچی ئەو کچە بوو کە لە سایتەکەی تردا ناسیبووم، کە بەناوێکی جیاواز لەوەی پێشوو پەیوەندی دەکرد.. زۆر بەگەرمی پێشوازیم لێ کرد، بەڕاشکاوانەوە دڵخۆشبووم بەو هەنگاوە، چونکە ئەو کچێکی زۆر بەڕەوشت بوو–من لەمیانی پەیوەندیەکانیەوە وام هەڵدەسەنگاند– پێی ووتم ئەو منی قبوڵ نەدەکرد ئەگەر هەستی نەکردایە کە من گەنجێکی بەڕەوشت و بەڕێزم لەمیانی پەیوەندیەکانمەوە. لەو ڕۆژەوە دەستمانکرد بە وتووێژ لەسەر ماسنجەر، وردە وردە دورکەوتینەوە لە پێگەکەی تر، سوێند دەخۆم بەخوا کە قسەکانی من لەگەڵیدا تەنها سەبارەت بە بابەتە بەسوودەکان و بەهاوارەکان بوو، ئێمە سەبارەت بە زۆر شت بیرو بۆچونمان ئاڵوگۆڕ دەکرد، و هەروەها سایت و پێگەی بەسودمان نیشانی یەکتر دەدا، و ئەو کتێبانەشمان ئاڵوگۆڕ دەکرد کە لە سایتەکانەوە بەخۆڕایی ﴿داونلۆد﴾مان کردبوون. بۆ ماوەیەك بەوشێوەیە ماینەوە، پاشان پەیوەندیەکە پەرەی سەند کاتێك کە داوای لێکردم کە لە زانکۆ یەکتر ببینین،

لەو کاتەدا هەستم بە ئیحراجیەکی زۆر کرد، چونکە من لاوێکی ناسراوم لەنێو هاوڕێکانمدا لەڕووی دینداری و پابەند بوونەوە، وە پێشتر قسەم لەگەڵ کچدا نەکردبوو، ئەگەر من ئێستا وتووێژ لەگەڵ ئەو کچەدا بکەم، ئەبێ چی بڵێن سەبارەت بەمن.. بەڵام لەهەمان کاتیشدا، دەترسام هاوڕێیەتی ئەوکچە لەدەست بدەم. کاتێ کە ڕازی نابم، بۆیە ڕەزامەندیم نواند و لەزانکۆدا یەکترمان بینی، بەڕاستی ئافرەتێکی بالاپۆشی زۆر جوان و بەحەیا بوو، زۆر سەرسام بووم بە حەیاو شەرمە زۆرەکەی، چۆن داوای بینینی لێکردووم، لەکاتێکدا ئەوەندە بەشەرم و حەیایە، بەوشێوەیە شێوازێکی نوێمان گرتەبەر لەپەیوەندیەکانماندا، بینینەکان زیادیانکرد، بەڵام قسەکردن لەسەر ماسنجەر بەشێوەیەکی ڕۆژانە بوو، چەند سەعاتێکیشی دەخایاند، کاتێکیش لەسەر ماسنجەر نەدەماین یان لەزانکۆ پێکەوە نەبووین، هەموو هۆش و بیرم لای ئەو بوو، ئایا چی پێ بڵێم، تا ئەو ئەندازەیەی زۆر بیرم لێ دەکردەوە و تەنانەت گوێشم لە گۆرانی دەگرت.. و لەبەر ئەوەی من گەنجێکی پابەند و دیندار بووم سوپاس بۆ خوا هاوڕێکانیشم دیندار و بەڕێزبوون، هەندێکیان ئاگایان لەبەسەرهاتم بوو، ئامۆژگاریان دەکردم، بەڵام سوودی نەبوو. زۆر بیرم کردەوە، دواتر زانیم کە هۆکاری چیە من ناتوانم واز لەو کچە بهێنم، لای هاوڕێیەکم دانم پیادانا، کە هۆگربوونە بەو کچەوە و سەرەتای هەستکردنە بە خۆشەویستی بەرامبەری، بەڵام سەرەتای خۆشەویستی، لێرەدا هەستم بەمەترسی کرد، چونکە من کاتی ژن هێنانم نەبوو، چونکە لەمپەری زۆرم لەبەردەمدا بوو، ئەگەر بەو شێوەیە بەردەوام بم لەگەڵ ئەو کچەدا، تا بارودۆخی گونجاوم بۆ دەڕەخسێ بۆ هاوسەرگیری، ئەوە کێشەیەکی گەورەیە و پێویستی بەچارەسەرێکی خێرا هەیە. گەڕامەوە بۆلای پەروەردگارم، لەبەردەمیدا گریام، تکام لێکرد و سەرپشکم کرد، ڕاوێژم بەهاوڕێ نزیکەکانم کرد، هیچ هۆکارێکم فەرامۆش نەکرد بۆ گەڕان بەدوای چارەسەردا.. بەڕاستی تاکە چارەسەر زۆر ئاشکرا بوو، وە زۆر قورسیش بوو.. پێویستە واز لەو کچە بهێنم، تا زیاتر هۆگری نەبم، چونکە ترسی زۆر گەورە لەوەدا بوو کە بکاتە خاڵی نەگەڕانەوە.. ئازیزانم ئەگەر بمەوێ باسی خۆمتان بۆ بکەم لەو ڕۆژانەدا ئەوە پێویستی بە چەندین لاپەڕەی درێژ هەیە، بەڵام هەوڵ دەدەم بەپێی توانا کورتی بکەمەوە. سبحان الله، ئەمە

سوننەتی پەروەردگارمە لە گەردونەکەیدا، کە بەڕاستی دەرمانەکەی تاڵە و ناخۆشە، چۆن دەتوانم کچێکی ئاوا فەرامۆش بکەم... و بۆچی؟ ڕۆژێ لەڕۆژان کردەوەیەکی خراپمان ئەنجام نەدابوو... بەڵام.. ﴿کاری حەڵاڵ دیارەو کاری حەرامیش دیارە﴾. هەستم بە ماندوێتی دەروونی زۆر سەخت دەکرد، و بەتوڕەیی و زۆر حاڵەتم گۆڕا و کەسایەتیم خراپ بوو، نزیکترین کەس لێمەوە بێزار بووبوو لێم، لەوساتەدا زانیم کە هیچ پەناگەیە نیە بێجگە لە پەنابردن بۆلای خوای گەورە، و هیچ کەس ناتوانێ یارمەتیدەرم بێت بێجگە لەو زاتە، بۆیە منیش خۆمم تەسلیم کرد پێی و بەتەواوی تەسلیم بوونەوە ووتم: ﴿خوایەگیان چیت پێ باشە وام لێ بکەو فریام کەوە﴾ لەو چەند ڕۆژەدا وڵاتی تیرۆری زایۆنیزم دەستی کردبوو بە هێرشکردنە سەر شاری ﴿غەززە﴾ی خۆڕاگر، منیش زۆر گرنگیم دەدا بەگوێگرتنی هەواڵەکان، بەڕاشکاوانەوە زۆر دڵتەنگ دەبووم بۆ دانیشتوانی شاری ﴿غەززە﴾.. و زۆر رقم لەخۆمان دەبوویەوە چونکە ئێمە هیچیان پێشکەش ناکەین بێجگە لە دوعاکردن بۆیان و غەمباریمان بۆیان. و لەهەمان کاتیشدا زۆر کەم دڵم بەخۆم خۆش بوو، چونکە ئەو کچە هەرچەندە توانیبوی هەموو عەقڵ و دڵ و بیرکردنەوەم بەرێ بۆلای خۆی، بەڵام بەخوا هێشتا پارێزگاری خواو ئاینەکەم و نەتەوەکەم کردووە لەناخی دڵمدا و لە جەوهەری عەقڵمدا. بەڵێ ئەوبوو دواهەمین شوڕا و قەڵای من، ئەگەر بکەوتایە منیش دەکەوتم، بۆیە کاتێ دیمەنی منداڵان و ژنەکانم دەبینی بڕیارمدا کە بەرگریان لێ بکەم، بەپشت بەستن بە پەروەردگارم و هاوەڵانی دڵسۆز.. بڕیارمدا لە سەرەتاوە خۆم بۆ ئەو بابەتە ئامادە بکەم، یەکەم جار دانم نا بەهەستی خۆمدا بەرامبەر بەو، وە من خۆشم دەوێت، بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەترسم هۆگری ببم بەشێوەیەکی گەورە.. چونکە من لە ئێستادا ناتوانم بیخوازم.. بەڕێزان ئەوە بزانن ئەگەر ئێوە بەڕاستی پشت بەخوا ببەستن خوای گەورە سەرکەوتوتان دەکات، و ئەگەر خوای گەورە سەرخەن، ئەو زاتەش ئێوە سەردەخات.. کاتێ من ئەم قسانەم بە کچەکە ووت، ئەو داوای لێکردم، کە پەیوەندیەکانمان لەسەر نێت کەم بکەینەوە و پەیوەندیەکانی زانکۆش بوەستێنین، من چاوەڕوانی توڕەیی و جیابوونەوەم لەو دەکرد. بۆیە بەهۆی هەڵوێستی جوانی ئەوەوە، من زیاتر هاندرام و هەستام بە نوسینی پەیامێکی درێژ، کە ناردم بۆ

ئیمێڵەکەی ئەو کە بۆچونی خۆمم بۆ ڕوون کردەوە، کە پێویستە هەریەکەمان بڕوات بەلای کاری خۆیەوە. ئەو وەك ناسیبووم ئافرەتێکی تێگەشتوو ڕۆشنبیر و موسڵمان بوو، لە قسەکانم تێگەشتبوو، هەردوکمان بڕیارماندا لەیەکتر دوربکەوینەوە، و لەناخی هەردوکماندا تێڕوانینی پڕ لەڕێز و بەهەندگرتنی بەرامبەر هەبوو.. بەخوای گەورە ئازیزان کارەکە بەو ئاسانیە نەبوو کە ئێوە وێنای بکەن، تەنانەت نەمتوانی بەخێرایی ناوی لەسەر ماسنجەر بسڕمەوە، کاتێ دەمبینی ئەو هەستاوە بە تۆمارکردنی ناوی من بەخوا وەك لەسەر ئاگر دانیشتبم، وابووم، هەتا خوای گەورە یارمەتی دام و بەتەواوی ناویم کوژاندەوە. وردە وردە گەڕامەوە بۆ ژیانی سروشتی خۆم و سوپاس بۆ خوا بە کۆمەکی خوای گەورە ڕاهاتم بەدووری ئەو. خوایەگیان دامەزراومان بکە کە زانستی ئینتەرنێت بەکاربهێنین لەپێناو خزمەتی تۆدا و بۆ سەرخستنی پێغەمبەر و ئاینەکەت، خوایەگیان لە گەنج و لاوەکان خۆش ببیت چونکە نەزانن، و ئەگەر بیشزانن، بێگومان لاوازن، ئەوان کاتێ سەپێچی تۆ دەکەن مەبەستیان بڕوانەبوون بە تۆ و دان نەنان بەمەزنی تۆدا نیە، بەڵکو بەڕاستی ئەوان دەروونیان لاوازە، خوایەگیان بەهێزیان بکە، خوایەگیان لە لاوازەکان خۆش بەو بیانبوورە.. ئامین خوایەگیان.

## ٧٤- ﴿وشەی خوا لەسەر جەستەی سەماکەرێك﴾

لاوێکی کوێتی لە پارێزگای ﴿الجهراء ﴾.. ڕۆچوو بوو لە خواردنەوەی مەی و ئەنجامدانی خراپەکاریدا، پشوی هاوینی لەیەکێ لەولاتانی ئەوروپای خۆرهەلات بردە سەر، ئاشکرایە لای خەڵکی کە سیستەمی شیوعی کە فەرمانڕەوای ناوچە ئەوروپییەکانی دەکرد نوقمی مەی و عارەق کردبوو بە نرخێکی هەرزان وەك نرخی خاك و خۆڵ، و هەندێ خەڵکی ناوچەی کەنداویش ئەگەر ئارەزووی کاری حەرامیان بوایە، دەچوون بۆ ئەوێ.. لە یەکێ لە کەباریهات و بارەکاندا، یەکێ لە سەماکەران لەسەر تەختی شانۆکە سەمای دەکرد!!! و بە ئەرکی خۆی هەڵدەستا ﴿خۆش ئەرك!!﴾... کۆمەڵێ عەرەبیش لە ولاتانی جیاوازەوە بەدەوری مێزەکەدا بوون، لەو ولاتانەشدا مافیای زۆری تێدایە، لەبەرئەوە عەرەبە دەوڵەمەندەکان و بازرگانەکانی قومارکردن کەسێکیان دەگرت بۆ پاسەوانی کردنیان ﴿بۆدی گارد﴾ کە بریتی بوو لە پیاوێکی ماسولکە بەهێز و لەش پتەو کە لەگەڵیدا بوو.. لەوکاتەدا کە عەرەبەکان پێکی عەرەقیان هەڵدەدا، سەماکەرەکەش سەمای دەکرد و جەستەی نمایش دەکرد، لەو کاتەدا ئالای ولاتەکانیش لە لایەن ئامادەبوانەوە دەئالێنرا لە سەماکەرەکە، ئالای ئەوروپی و ئالای ئەفریقی و ئالای ئاسیایی.. لەپڕ لاوەکە بەهاوڕێکانی ووت... برادەرینە ئایا وەك من ووشەی ﴿الله﴾ لەسەر جەستەی سەماکەرەکە دەبینن؟.. لاوەکە لە حاڵەتی نیوە سەرخۆشیدا بوو. هاوڕێکانیشی ووتیان: بەڵێ ئەو بە ئالای سعودیەوە سەمادەکات ﴿نەفرەتی خوای لێبێت﴾ لاوەکە ووتی: نابێ بێدەنگ بین لەو کارە... بە توڕەییەوە هەستایەوە و ڕۆشتە سەر شانۆکە، سەماکەرەکە و ئامادەبوانیش وایان زانی دۆلار دەکات بەسنگیدا، وەك چۆن سەرخۆشەکانی تر وایان دەکرد، بەڵێ بەبێ پێشەکی زللەیەکی سرەواندە سەماکەرەکە و ئالاکەی لێکردەوە و هاواریکرد: ﴿الله اکبر...﴾

ئەوەندەی نەبرد پیاوانی پارێزەری سەماکەرەکە پەلاماریاندا و دەستیان کرد بە لێدانی و ئەویش هەر ئالاکەی پێ بوو.. برا عەرەبەکانی تریش لەگەڵ پارێزەرەکانیاندا چون بۆ کۆمەکی کردن.. هەرا دەستی پێ کرد و بەوە کۆتایی هات کە کوڕە کوێتیەکە ڕەوانەی نەخۆشخانە کرا، بەتەواوی شەکەت کرابوو، دوای ئەوەی

هۆشی هاتەوە و کەمێك حەسایەوە، یەکێ لەدەستەکانی زۆر بە توندی داخرابوو، کاتێ دەستی کردەوە تاماشای کرد پارچەیەك لە ئاڵای سعودیە لەناو دەستیدایە کە بەشێك لە وشەی تەوحید و یەکتاپەرستی تێدایە ﴿لاإله إلا الله﴾ ئەو غیرەتە ڕاستگۆیانە و ئەو ڕووداوە سەختە، بوو بە خاڵێکی وەرچەرخان لە ژیانی ئەو لاوەدا، کەوای لێکرد پشت بکاتە دنیای فەساد و بێتەوە بەخۆیداو بگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری و سوپاس بۆ خوا تەوبە بکات. منیش دەڵێم بەڕاستی ئەوە هەڵوێستێکی شەریفانەیە کە بەڵگەیە لەسەر تۆوی خێر کە لە ناخ و دەروونی هەموو کەسێکدا هەیە، تەنانەت ئەوانەش کە زیادەڕۆن و ڕۆچوون لە خراپەکاریدا، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئادەمیزاد ئەو ئیمانە لە ناخی خۆیدا زیندوو بکاتەوە تا ژیانێکی پاك و ئیماندارانە بەرێتە سەر.

لە بابەتێکی مامۆستا ﴿محمد العوضي﴾ وەرگیراوە.

# ٧٥- ﴿لاوێك لە گیرفانیدا شتێك هەبوو﴾

منداڵە بچوكەكەم لە دوێنێ ئێوارەوە تەندروستی تەواو نەبوو، كاتێك ئەو ئێوارە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە لەسەر كارەكەم، بڕیارمدا بڕۆم و بیبەم بۆ نەخۆشخانە، لەگەڵ ئەو هەموو ماندوێتیەشمدا، بەڵام ماندووبون بۆ ئەو حەوانەوەیە، هەڵمگرت و بردم.. ئەوانەی چاوەڕوانیان دەكرد لە نەخۆشخانە زۆر بوون، لەوانەیە زیاد لە سەعاتێك دوابكەوین.. ژمارەیەكم وەرگرت بۆ چوونە لای پزیشك، و ڕۆشتمە ژووری چاوەڕوانی و دانیشتم.. ڕوخسارێكی زۆر و جیاواز.. گەورە و بچوكی تێدا بوو.... بێدەنگی باڵی بەسەر هەمواندا كێشابوو.. چەند نامیلكەیەكی بچوكی لێ بوو، چەند برایەك سەرقاڵ بوو بوون پێیەوە، تەماشایەكی ئامادەبوانم كرد، هەندێكیان چاویان لێك نابوو، نەتدەزانی بیر لەچی دەكەنەوە، یەكێكی تر تەماشای سەرنجی هەموانی دەكرد، كەسانێكی تریش بە ڕوخساریاندا هەستت بە نائارامی و بێزاری دەكرد بەهۆی چاوەڕوانیانەوە... ئەوەی كە ژمارەكانی دەخوێندەوە، ئەو بێدەنگیە درێژەی دەشكاند، ڕوخساری ئەو كەسەش كە بانگ دەكرا، دەگەشایەوە و بەخێرایی چەند هەنگاوێكی دەنا، پاشان بێدەنگی دەگەڕایەوە بۆ هەموان... گەنجێك كە لە هەرەتی لاوێتیدا بوو سەرنجی ڕاكێشام.. گرنگی بەهیچ شتێكی دەوروبەری نەدەدا، قورئانێكی بچوكی پێ بوو..دەخوێندەوە.. تەماشای ئەملاولای خۆیی نەدەكرد، تەماشام كرد و زۆر بیرم لەحاڵی نەكردەوە.. بەڵام كاتێ چاوەڕوانیەكەم درێژەی كێشا بۆ زیاد لە سەعاتێك، تەنها بەتەماشاكردنم بۆی بیرێكی زۆر قوڵم كردەوە لە ژیانی و لە پارێزگاریكردنی كاتەكانی.. سەعاتێكی تەواو لەژیانم، چ سودێكم لێ بینی، لە كاتێكدا بەتاڵم و بێ ئیش و كارم، بەڵكو چاوەڕوانیەكی بێزار كەرە، بانگبێژ بانگی مەغریبی دا... ڕۆشتین بۆ نوێژكردن، لە نوێژگەی نەخۆشخانەكە.. هەوڵمدا لە تەنیشت ئەو كوڕەوەبم، دوای ئەوەی لە نوێژەكە بووینەوە، ڕۆشتم بۆلای و ڕاستەوخۆ پێم ووت كەمن سەرسامم پێی كە چۆن پارێزگاری كاتەكانی خۆی دەكات، قسەكانی باسیان لە زۆریی ئەو كاتانە دەكرد كە ئێمە بەهیچ شێوەیەك سودیان لێ نابینین، شەوەكان و ڕۆژەكان لەتەمەنمان تەواو دەبێت بەبێ ئەوەی هەست بكەین و پەشیمان بین.

ئەو كوڕە لاوە ووتی: ئەو قورئانە گیرفانیەی نزیكەی تەنها ساڵێك دەبێت هەڵگرتووە،

کاتێ هاوڕێیەکی هانیدا کە سوربێت لەسەر پارێزگاریکردنی کات، و پێی ووتم: ئەو لەوکاتانەدا دەیخوێنێتەوە کە بەتاڵە و سودی لێ نابینێت دوهێندەی خوێندنەوەی لە مزگەوتدا یان لەماڵەوە، بەڵکو خوێندنەوەکەشی هەرچەندە خێر و پاداشتی بۆ زیاتر دەکات، بەویستی خوای گەورە، هەروەها دەبێتە هۆی نەمانی بێتاقەتی و دڵەڕاوکێکەشی.. وە هەروەها قسەکەرەکە ووتی: ئەو ئێستا زیاد لە سەعات و نیوێکە لەشوێنی چاوەڕوانیدایە، و لێی پرسیم: لە کوێ سەعات و نیوێکت دەست دەکەوێت تا قورئانی تێدا بخوێنیت.. ڕامام.. چەندە کاتمان بەبێ هوودە بەسەردەچێت.. چەند لەساتەکانی ژیانت تێدەپەڕێ و هیچ حیسابێکیشی بۆ ناکەیت.. بەڵکو چەند مانگ تێدەپەڕێ بەسەرتا، و قورئانی تێدا ناخوێنیت.. تەماشامکرد کە خەریکە دەبمە ژمێریار و کاتیش نیە بەدەستمەوە، ئەی چاوەڕوانی چی بکەم؟ بانگی بانگکەرەکە بیر و هۆشمی پچڕی.. ڕۆشتم بۆلای پزیشکەکە، ئێستە ئەمەوێ شتێ بەدەست بهێنم.. دوای ئەوەی لە نەخۆشخانە هاتمە دەرەوە.. قورئانێکی بچوکم کڕی.. بڕیارمدا پارێزگاری کاتەکانم بکەم.. کاتێ قورئانەکەم خستە گیرفانمەوە بیرم دەکردەوە.. چەند کەس ئاوا دەکات.. و دەبێت چەند پاداشتی گەورە بەڵگەبێت لەسەر ئەوە.

(الزمن القادم.. الكاتب/عبدالملك القاعم).

# ٧٦- ﴿پڕ بە بینم هاوارم کردك خوایەگیان ڕزگارمکە﴾

لاوێك عاشقی دەریا بووبوو، هەرلەبەر ئەوەش بەلەمێکی کڕیبوو، تا بۆماوەیەکی درێژ لەدەریادا بمێنێتەوە، بۆچی نا؟ چونکە عاشقی ئاوازی خەوناوی شەپۆلەکان بوو بوو کە هەمیشە گوێی لێ دەگرت. لەگەڵ هاوڕێکانیدا سەیران و گەشتی دەکرد، خوای گەورە خێری ویست بۆی، بۆیە موفاجەئات ڕوویدا.

(م.ص.ر) دەڵێ: ڕۆژێکیان بەتەنها بەسواری بەلەمەکەمەوە لەدەریادا بووم، شەپۆلەکانم دەبڕی، کاتیش لە خۆرئاوابوون نزیك بووبوویەوە، منیش بەتایبەتی لەو ساتەدا دەمەویست بەتەنها بمێنمەوە، و لەگەڵ خەونەکانمدا بژیم.. خۆشترین کاتەکانم لە دەریادا بەرمەسەر، من تاق و تەنها بووم لەسەر ئەو ئاوە شینە، لەپڕ شتێك ڕوویدا کە بەخەیاڵمدا نەهاتبوو، بینیم بەلەمەکە بەرزی کردمەوە و منیش لەناو ئەو دەریادا ململانێم لەگەڵ شەپۆل و مردندا دەکرد.. نەمدەتوانی دەست بەبەلەمی ڕزگار بوونەوە بگرم، یان بەو تەوقانەوە کە بۆ ئەوە دانرابوون، پڕ بە بینم هاوارمکرد: پەروەردگارا ڕزگارمکە.. ئەو دەنگ و هاوارە لەناخی دڵمەوە دەرچوو، هەستم بەخۆم نەکرد لەهۆش خۆم چووم.. خەبەرم بوویەوە، چاوم گێڕا بەلای ڕاست و چەپی خۆمدا.. پیاوانێکی زۆرم بینی دەیانوت: ﴿سوپاس بۆ خوا، ئەو زیندووەو نەمردووە﴾. دوانیان پۆشاکی دەریاوانیان لەبەردا بوو. پێیان ووتم: ﴿سوپاس بۆ ئەو خوایەی لە نوقم بوون ڕزگاری کردیت﴾ زۆر لەمەترسی نزیك بووبوویتەوە، بەڵام ئیرادە و دەسەڵاتی خوا بوو بە ڕەحمەت و ڕزگاربوون بۆت. من هیچم لەو ڕووداوە نەدەهاتەوە یاد، تەنها ئەوە نەبێ کە بانگم لە پەروەردگارم کرد. جارێکی تر دنیام هاتەوە پێش چاو، لەگەڵ خۆمدا دەدوام، بۆچی ئەوەندە وشکیت بەرامبەر پەروەردگارت؟ بۆچی سەرپێچی دەکەیت؟ وەڵامەکە بریتی بوو لە: شەیتان و دەروون و دنیا، کە من دووردەخەنەوە لە زیکر و یادی خوا!! لەخەیاڵەکەم بەئاگا هاتمەوە: ووتم بەئامادەبوان: ئایا کاتی عیشا هاتووە؟ ووتیان: بەڵێ. لەنێو سەرسامی ئامادەبواندا هەستامەوە، دەست نوێژم گرت و نوێژم کرد، ووتم: زۆر سەیرە، ئایا

بەڕاستی ئەوە منم کە نوێژ دەکەم؟! لەژیانمدا نوێژم نەکردووە زۆر بەکەمی نەبێت، لەسەرروو هەموو ئەوانەشەوە پەروەردگارم ڕەحمی پێ کردم و ڕزگاری کردم. پەیمانمدا بە پەروەردگارم کە هەرگیز سەرپێچی نەکەم.. و ئەگەر شەیتان خستمیە تاوانەوە، داوای لێخۆش بوون بکەم چونکە بەڕاستی پەروەردگارم لێبوردەو میهرەبانە، هەستم بە ترس کرد کە لەوانەیە خوای گەورە تەوبەم لێ قبول نەکات، هەتا ئەم ئایەتەم خوێندەوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾النساء/١١٦... واتە: ﴿بەڕاستی خوای گەورە لەکەسێ خۆش نابێ هاوەڵی بۆ دانێ، و بێجگە لەوە لە هەموو شتێ خۆش دەبێ، بۆ کەسێ کە خوا ویستی لەسەر بێت و بیەوێت﴾.

بۆیە دڵئارام بووم، و زانیم کە خوای گەورە دڵی خۆش دەبێ بە تەوبەی بەندەکەی، با گوناهەکانیش زۆربن. لەخوای گەورە داواکارم کە لێم ببورێ لە من و لە ئێوە و لە هەموو موسڵمانان، بەڕاستی خوای گەورە بیسەر و وەڵام دەرەوەیە. چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و دەستی کرد بە گریان و تا ئەو ئەندازەیەی ئێمەشی لەگەڵ خۆیدا هێنایە گریان.

## ٧٧- ﴿فریشتەی مردنم بینی، ڕۆحم لەجەستەم دەردەکات﴾

لاوێك بوو خەونی دەبینی بەناوبانگ دەرکردن و جەماوەری بوون و بوون بە ئەستێرەبوون لەبواری گۆرانیدا، یەکێ بوو لەبەشداربوان لەبەرنامەی ستاری ئەکادیمی و سۆپەرستار، بەلام پەروەردگاری منەتی تەوبەکردنی پێ بەخشی.. ئێستا ئەو مرۆڤێکی ئیمانداره کە گەڕاوەتەوە هۆشی خۆی و بۆلای پەروەردگاری و بوو بە کەسێکی خاوەن هەلوێست و دیندارە و پەشیمانە، لەو کردەوانەی کە لە ڕۆژانی ڕابردووی ژیانیدا ئەنجامی داوە لەکات بەسەربردن لە شەونخونی و گۆرانی و مۆسیقا و سەرپێچی خوای گەورە لە هەموو هەلسوکەوت و کاروباری ژیانیدا، باسی گەڕانەوە و تەوبەی خۆیمان بۆ دەکات و دەلێ: سوپاسی خوای مەزن دەکەم کە دەریهێنام لە تاریکاییەکانەوە بەرەو ڕووناکی.. بەڕاستی من شتێ نەمابوو لەکاری حەرام کە نەیکەم. لەم دواییانەدا هەرکات کە ئامێری پیانۆکەم دەگرت بەدەستەوە هەستم بە جۆرێك لە ڕشانەوە دەکرد، ، بەپێچەوانەی جارانمەوە کاتێ کە پیانۆکەم دەژەند هۆشم لای خۆم نەدەما و لە ئاسمانی شەیتاندا مەلەم دەکرد. شەوێکیان بەسەر گوناهەوە خەوم لێ کەوت، کە پێشتر کەم دەخەوتم و خەونی سەیرم دەبینی، لەپڕ باوێشك زۆری بۆ هێنام و ئاگام لەخۆم نەما و چومە جیهانێکی سەیر و ترسناکەوە. خەوەکە وا دەستی پێ کرد وەك ئەوەی کە لەشەوبێداریەکی گوناهکارانەدابم، چەند ئافرەتێك بەدەورمەوە بوون، دوای ئەوەی خۆم بینیەوە کە مردووم، بینیم وەك ئەوەی کە فریشتەی مردن ڕۆحم لەجەستەم جیابکاتەوە، منیش نەمدەهێشت بەلام ئەو بەهەموو هێز و توانایەکەوە و بەئازارەوە لە جەستەمی دەرکرد.. هەر لەو ساتانەدا کەسوکارەکەمم بینی، بەدەورمەوە بوون، ئەوان دەگریان و منیش دەمەویست قسە بکەم، بەلام نەمدەتوانی، پاشان خۆمم بینی، لەسەر تەتەشۆر بووم و شۆردمیان و کفنیان کردم، پێش ئەوەی ئەسپەردەی خاکم بکەن، لە خەوەکەم ڕاچلەکیم بەدەنگی بانگی بەیانی، زۆر سەیر بوو بەلامەوە، وەك ئەوەی پێشتر گوێم لەبانگەوە نەبووبێت. دوای خەوەکە ڕۆشتم و خۆم خست بەسەر قاچی دایکم و باوکمدا، گریام و داوای

لێبوردنم کرد لە هەڵەکانم و گوناهەکانی ڕابردووم، داوام لێکردن کە یارمەتیم بدەن، پاشان پەیوەندیم کرد بە کوڕی پورمەوەو داوام لێکرد، هەموو ئەو شتانەی خۆی کە پەیوەندی بەڕابردووەوە هەیە بیبات و بەزوترین کات لێمی دورخاتەوە. لەو ساتەدا تەوبەی ڕاستەقینەی خۆم ڕاگەیاند لەبەردەم خوای گەورەداو ئێستاش ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەم ﴿من پێشتر مردبووم، خوای گەورە بە منەت و فەزڵی خۆی زیندووی کردمەوە﴾.

سەرچاوە/ ڕۆژنامەی: (النخبە) ژ: ٣٩٨ بەدەسکاریەوە.

## ٧٨- ﴿داپیرەم هۆکاری ڕێنماییم بوو﴾

دوای شەوێکی درێژ، کە لەگەڵ هاوڕێیانی خراپدا بەسەرم بردبوو، لەگەڵ گوناه کاران و ئەوانەی دوورن لە خواپەرستیەوە، بەسەرم بردبوو لەگەڵیاندا بە یاری و گۆرانی و شەونخونی، لە دیمەنێکی بێزارکەری پێکەنیناوی و گریاناویدا، کە مرۆڤی ژێر تیایدا هەست دەکات کە هیچ بەهایەك و نرخێکی نیە. هەموو شەوێ بەو جۆرە بووم، کاتێ کاتژمێری سەعاتەکە لاردەبوویەوە بەرەو خوار و ئێمە دەچووینە بەشی کۆتایی شەوەوە.. سواری ئۆتۆمبێلەکەم دەبووم و دەگەڕامەوە بۆماڵەوە، ئەوکاتەش سەعات سێ و نیوی نیوەشەو بوو، دەرگای ماڵەوەم کردەوەو چوومە ژوورەوە، داپیرەشم- خوای گەورە ڕحمی پێ بکات- بەرماڵەکەی ڕاخستبوو، لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا، و سەرقاڵی نوێژە درێژ و زۆرەکانی بوو، کە نەدەژمێردران. ئەوەی لەیادم بێت ئەو بە دانیشتانەوە نوێژی دەکرد، ماندوو بووبوو لەوەستان بەپێوە، ئەوەندە وەستابوو لەبەردەم خوای بەبەزەیی و میهرەباندا، بە بەردەوامی ئەوە پیشەی بوو، ساتەکانی بەزەیی و ڕێنمایی پەروەردگاری میهرەبان منی وەستاند تا تەماشای بکەم، کاتێك کە نوێژ دەکات، بە بێ گوێدان بەوانەی خەوتون، ئا لەو ساتەدا هەستم بەشتێکی سەیر کرد کە دامدەچڵەکێنێت.. وەك ئەوەی شتێ لە ژیانمدا ڕوویدات، پاشان چوومە ژورەکەی خۆمەوە، هەوڵمدا بخەوم، بەڵام خەو لە چاوانم تۆرابوو، وێنەی داپیرەم هەر لەمێشکمدا بوو، لەبەرچاوم و لەدەوروبەرمدا بوو، لە هەموو شوێنێکی ژوورەکەدا بوو.

خوایەگیان، من چیم لێهاتووە پاشان گەڕامەوە و بیرم لەخۆم و لەژیانم دەکردەوە، لە گەنجێتیم و بەتواناییم و کەشخەییم، چۆن ئەو هەموو ڕۆزی و نیعمەتانەم لە تاوان و سەرپێچی کردندا بردۆتەسەر، داپیرەشم کە لە ماڵئاوایی کۆتایی نزیك بۆتەوە، ئەو بە دانیشتانیشەوە هەر لە خواپەرستیدایە، توانای نەماوە بەپێوە خواپەرستیەکەی ئەنجام بدات، بێگومان ئەو حەزی دەکرد بە پێوە نوێژەکانی بکات، ئەی چی ڕێگری دەکات؟ بێگومان بەساڵاچون و کەمتوانایی، کەواتە ئەو ئاواتەخوازە کە لە تەمەنی مندا بوایە و لاو بوایە، لەکاتێکدا منیش ئەو لاوێتیەی خۆم دەفەوتێنم، پاشان کێ زامنی ئەوەم بۆ دەکات کە بژیم تا بگەمە تەمەنی ئەو، کەوتمە گێژاوی بیرکردنەوەوە، دەنگی بانگی بەیانی تێکەڵ بەخەیاڵەکانم بوون، کە خەڵکی بانگدەکرد بۆ نوێژی

بەیانی ﴿الصلاە خیر من النوم- نوێژ خێری زیاترە تا خەوتن﴾ ووتم: کوا خەو؟ کارەکە زۆر مەزنترە لە خەو.. مەسەلەکە ئەوەیە من لە دوو ڕێیاندام، پێویستە بڕیارێکی خێرا بدەم، داوام لە خوای بالادەست کرد کە کۆمەك و پشت و پەنام بێت.. بۆیە هەستم بە بۆنی تەوبە کرد، تامەکەیم چەشت، دڵیشم ملکەچ بوو بەرامبەر ڕەحمەت و فەرمانی پەروەردگار و ڕووباری ئیمان هەڵقولا ﴿وَإِنَّ مِنْ الحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الانْهَارُ﴾ البقرة/. واتە: ﴿، بەڕاستی بەردی وا هەیە لە چەند لاوە جۆگە ئاوی لێ هەڵئەقوڵێ﴾.

وام هەست کرد کە سەرلەنوێ لەدایك بوومەتەوە.. پاشان ڕۆشتمە دەرەوە بۆ مزگەوت، من یەکەم کەس بووم دوای بانگ بێژەکە کە چومە مزگەوتەوە، نوێژی سوننەتی بەیانیم ئەنجامدا، و قورئانێکی پیرۆزم گرت بەدەستەوە، ئایەتەکانیم دەخوێندەوەو ڕادەمام لێی، وام هەست دەکرد لەگەڵ مندا دەدوێ و دڵم دەداتەوە، و غەم و تاوان و هەڵەکانم دەسڕێتەوە، بەهۆی فراوانی ڕەحم و بەزەیی پەروەردگارەوە. کاتێك بەو شێوەیە بووم، دەستێکم بینی بەرەو لای من درێژ بوو، تا تەوقەم لەگەڵدا بکات، منیش دەستم درێژکرد، تەماشام کرد بزانم کێیە، بینیم باوکمە-خوای گەورە بیخاتە بەر ڕەحمەتی فراوانی خۆیەوە- ئەو هەموو شتێکی لەمنەوە چاوەڕوان دەکرد، تەنها هاتن بۆ مزگەوت نەبێت.. تەماشایەکی کردم کە هەرگیز ئەو تەماشاکردنەم لەیاد ناچێتەوە تەماشایەك ناتوانم وەسفی بکەم، پڕ بوو لەهەست و سۆزی تێکەڵ بەیەکتر، کە لەناخی دڵیەوە هەڵدەقولا، لە ئەنجامیدا فرمێسك داباریە سەر ڕومەتی..

لە موحازەرەی: (سبب هدایتی جدتی) ی بانگخواز: عبدالله سالم.

# ٧٩- ﴿نابینایەك ڕێگام نیشان دەدات﴾

زیاتر لەحەوت ساڵ دەبوو کە ژنم هێنا بوو، سوپاس بۆ خوا ئەو شتانەی کە ئاواتە خوازی بووم-بەلای خۆمەوە- لەودا دەمبینیەوە، من جێگربووم لە کارەکەمدا..و جێگیربووم لە هاوسەرگیریەکەمدا.. تەنها کەمێك بێتاقەت بووم.. من و هاوسەرەکەم منداڵمان نەبوو.. بێتاقەتیەکە دەستی پێ کرد.. سەردانی پزیشکەکان زیادیان کرد. لەو بڕوادابووم کە هەموو هەوڵێکم دابوو.. سەفەرم بۆ دەرەوەو ناوەوەی وڵات دەکرد. کاتێ دەمبیست پزیشکێکی پسپۆڕ لە بواری نەزۆکیدا هاتووە.. خێرا مەوعیدم وەردەگرت.. شیکاریە زۆرەکان و بەکارهێنانی دەرمانی زۆر.. بەڵام هیچ سودێکیان نەبوو.. زۆربەی قسەکانی نێوان من و ژنەکەم سەبارەت بە فلان و فیسار دکتۆر بوو، کەچی ووت.. ئێمە پێشبینی چی دەکەین، پێشبینیەکان بەردەوام دەبوون بۆ ماوەی ساڵێك یان دوو ساڵ.. چەند قۆناغی چارەسەرکردنەکە درێژ بوو.. هەندێکیان پێیان دەوتم کە نەزۆکیەکە لە منەوەیە...و هەندێکیشیان دەیان ووت نەزۆکیەکە لەژنەکەمەوەیە.. بەهەر حاڵ.. ڕۆژەکانمان تێدەپەڕین و ئێمەش بەدوای چارەسەرەوە بووین.. منداڵ بوون زاڵ بووبوو بەسەر بیر و هۆشماندا.. لەگەڵ ئەوەدا کە من هەوڵم دەدا ژنەکەم هەست بەوە نەکات، بەڵام دەبێ هەست بکات کەچی ڕوودەدات، پرسیارەکان زۆر بوون.. هەبوو لێی دەپرسی: چاوەڕوانی چی دەکەیت؟ وەك ئەوەی کارەکە بەدەست ئەو بێت.. وە هەبوو ئامۆژگاری دەکرد کە بچێ بۆلای فلان دکتۆر لە فلان شوێن.. فلان کەس چووەتە لای و پاش ماوەیەك منداڵی بووە، و فلان کەس و لەو جۆرە بەسەرهاتانە.. بەو شێوەیە کۆمەڵگای ژنەکەم پشکێکی گەورەیان هەبوو لە پرسیارکردن.. کەس پێی نەدەوتین بۆچی ڕوونەکەینە خوای گەورەو بە پاڕانەوەیەکی ڕاستەقینە تکا لەو بکەین.. حەوت ساڵ تێپەڕی ئێمە هەر هەڵپەمان بوو بەدوای دکتۆردا و وازمان لەدوعاو پاڕانەوە هێنابوو.. ڕووکردنە خوای گەورەمان فەرامۆش کردبوو.. ئێوارەیەکیان بەڕێگادا دەچووم، تەماشام کرد پیاوێکی نابینا دەیەوێ بەڕێگادا بپەڕێتەوە.. دەستیم گرت.. نیوەی شەقامەکەمان بڕی و لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا وەستاین.. چاوەڕوانی چۆڵ بوونی سایدەکەی ترمان دەکرد.. ئەوەی وەك فرسەت قۆزتەوەو لێی پرسیم: ﴿دوای ئەوەی دوعای لەش ساغی و خۆش گوزەرانی بۆ کردم﴾ ئایا ژنت هێناوە؟ منیش ووتم: بەڵێ. پاشان ووتی: منداڵتان هەیە؟ پێم ووت: خوای گەورە هێشتا منداڵی پێ نەبەخشیوین..ماوەی حەوت ساڵە ئێمە

هەر چاوەڕوانی دەرویەکین لە خوای گەورەوە.. ڕێگاکەمان بڕی کاتێ ویستم خواحافیزی لێ بکەم.. پێی ووتم: کوڕی خۆم ئەوەی بەسەر تۆدا ڕوویداوە، منیش هەر وابووم، بۆیە دوای هەموو نوێژێك ئەم دوعایەم دەخوێند ﴿رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ(٨٩)﴾الأنبياء. واتە: ﴿خودایە! بەتەنیام مەهێڵەوە بێکەس و بێ دەر! تۆ چاکترین کەسێکی بۆ ئینسان بمێنیتەوە﴾.

سوپاس بۆ خوا ئێستە حەوت منداڵم هەیە.. دەستی گوشیم و ووتی: دوعاکەت لەبیر نەچێت.. پێویستم بە بیرخستنەوەی ئەو نەبوو.. چونکە من وێڵی چارەسەرکردن بووم.. بەسەرهاتەکەم بۆ هاوسەرم گێڕایەوە.. پێکەوە قسەمان کرد.. ئێمە لەکوێی دوعاو نزاو پاڕانەوەداین.. هەموو شتێکمان تاقیکردەوەو ڕۆشتین بۆ هەموو شوێنێ.. ناوی هەر پزیشکێکمان ببیستایە تەقەمان دەدا لەدەرگاکەی؟.. ئەی بۆچی تەقە نەدەین لەدەرگای خودای میهرەبان؟ کە فراوانترین و نزیکترین دەرگایە.. بە بیری خێزانم هێنایەوە کە ئافرەتێکی بەساڵاچوو دوو ساڵ پێش ئێستە پێی ووتبوو: پشت بە دوعاکردن ببەستە، بەڵام وەك خێزانم ووتی: لەوکاتەدا مەوعیدێکی زۆری پزیشکەکانمان هەبوو، سەردانەکانمان بۆلای پزیشکەکان سەردانی ئاسایی بوو بەبێ دڵەڕاوکێ و هەڵەداوانی.. سەردانی سادە.. تەنها بەدوای چارەسەری دیاریکراوەوە بووین.. کە ببێتە هۆکارێ لە هۆکارەکان.. بەدڵەکانمان ڕوومانکردە خوای گەورە و میهرەبان.. لە کاتی نوێژە فەرزەکان و لە نیوەشەودا، بەدوای ساتەکانی وەڵامدانەوەی دوعاوە دەگەڕاین خوای گەورەش بێ هیوای نەکردین و ئاواتەکەمانی هێنایە دی و خوای گەورە دەرگای وەڵامدانەوەی لێکردینەوە.. خێزانم سکی بوو.. پاشان خوای گەورە منداڵێکی پێ بەخشین.. پاك و بێگەردی بۆ باشترینی دروستکەران ﴿و تبارك الله احسن الخالقين﴾.... ئێستا ئەم دوعایە دەڵێینەوە ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا(٧٤)﴾الفرقان... واتە: ﴿خوایە کەسی وامان لە ژن و منداڵەکانمان پێ ببەخشە مایەی ڕووناکیی چاوو شادمانی و سەربەرزی بێ بۆمان و بمانکە بە پێشەوای ئەو جۆرە کەسانەی لە خودای خۆیان ئەترسن و خۆیان لە گوناه ئەپارێزن﴾.

سەرچاوە/ الزمن القادم..

الكاتب: عبدالملك قائم.

## ٨٠- ﴿چیرۆكێكی زۆر زۆر كاریگەر﴾

من وانەبێژ بووم لە ئەڵقەی لەبەركردنی قورئانی پیرۆز لە مزگەوت.. دوای مەغریب دەمبینی، گەنجێك كە تەمەنی ١٥ساڵ بوو قورئانێكی بچوكی دەگرت بەدەستەوەو دەیخوێندەوە.. نەء .. نەیدەخوێندەوە.. وا نیشانی ئێمەی دەدا كەدەیخوێنێتەوە.. سات ناساتێك تەماشایەكی دەكردین.. دەیەویست بزانێ ئێمە چی دەكەین... دەیەویست گوێی لێمانەوە بێت..و بزانێ ئێمە چی دەڵێین.. هەر كە تەماشام دەكرد چاوی دادەخست و دەستی دەكردەوە بە قورئان خوێندنەكەی وەك ئەوەی هیچی نەكردبێ.. رۆژانە بەو شێوە شەرمنانە دانیشتبوو.. بەو شێوە تەماشاكردنانەش تەماشای دەكردین.. دوای كۆتایی نوێژی عیشا.. ویستم ئاشنا ببم پێی.. من ناوم ﴿سەلمان﴾ە، لە ئەڵقەی قورئانی پیرۆز لە مزگەوت دەخوێنم.. منیش ناوم ﴿خالید﴾ە سەیرە:!! بەخێرایی وەڵامی دایەوە، وەك ئەوەی وەڵامەكەی ئامادەكردبێت و پێشبینی پرسیاركردنەكەی كردبێت.. خالید لەكوێ دەخوێنیت؟ لە پۆلی ٩ی بنەڕەتیدام.. وە زۆر حەزم لە قورئانە.. زیاتر سەرسام بووم!!! ئەبێ ئەم ڕستەیەی كۆتایی چ پێویست بكات!!! غیرەت گرتمی و ووتم پێی: خالید ئایا دوای مەغریب كاتت هەیە؟ تا ئێمەش دڵخۆش بین بە ئامادەبوون لە ئەڵقەكەماندا كە تایبەتە بە قورئانی پیرۆزەوە؟ هاە!! قورئان.. ئەڵقە.. بەڵێ، بەڵێ، زۆر بە شادومانیەوە.. پشت بەخوا ئامادەدەبم و ئەم.. كەواتە إنشاء الله مەوعیدمان سبەینێیە.. ئەو شەوەم بەسەر برد و هەر بیرم لەحاڵی ئەو لاوە دەكردەوە.. خەو لەچاوانم تۆرابوو.. هەوڵم دەدا وەڵامێكم دەست كەوێت بۆ ئەوەی كە بینیبووم و بیستبووم.. نەمتوانی، بەخۆمم ووت: ئەوەی كە تۆ نایزانیت ڕۆژەكان بۆت ڕوون دەكەنەوە.. بەلای ڕاستمدا پاڵكەوتم، شەو خستمیە دنیای خۆیەوە.. و خەون لە ئامێزی گرتم ﴿اللهم اسلمت وجهي إليك.. و فوضت امري إليك﴾. واتە: ﴿خوایە گیان خۆمم سپارد بۆ تۆ و هەموو فەرمانێكی خۆمم خستە بەردەم تۆ﴾.

ڕۆژەكان تێپەڕین، خالید بەردەوام بوو لەگەڵماندا لەئەڵقەی قورئانی پیرۆزدا، زۆر چالاك بوو لە لەبەركردن و پیاداچونەوەدا، هەموانی خۆش دەویست و هەموانیش ئەویان خۆش دەویست.. جیانەدەبوویەوە لەقورئانی پیرۆز.. و هەمیشە لەڕیزی

یەکەمی نوێژکردندا بوو، نکولیان لە هیچ شتێکی نەدەکرد، تەنها یەك شت نەبێت!! بیر و ئەندێشەکانی نەبێ.. هەندێ جار هەستمان دەکرد جەستەی لەگەڵماندایە، بەڵام ڕۆحی دەڕۆشت، لە دنیایەکی تردا مەلەی دەکرد، هەندێ جار لەپڕ پێم دەوت.. بەڵام ئاشکرای نەدەکرد و داوای لێبووردنی دەکرد کە بیر و هۆشی لەلامان نیە.. و ئەو دەیزانی کە ئێمە بڕوای پێ ناکەین.. ڕۆژێکیان بردم بۆ کەناری دەریاکە، بەڵکو نهێنیە گەورەکەی یەك بگرێك لەگەڵ ئەم دەریا گەورەدا و هەرچی خەم و خەفەتی ناخی هەیە خاڵی بکاتەوە، وە هەرچی ئازاری ناخی هەیە خاڵی بکاتەوە.. گەشتینە سەر دەریاکە، بە کەنارەکەیدا پیاسەمان دەکرد.. کات دەمەو ئێوارە بوو.. مانگ چواردە بوو، دیمەنێکی سەیر... ڕەشی ئاسمان لەگەڵ ڕەشی دەریاکە بەیەك گەشتبوون، رووناکی زیوینی مانگەکەش لە نێوانیاندا وەستابوو بە سەرسامییەوە، وەك وەستانی من بە سەرسامی لەبەردەم خالیددا.. لەبەردەم ئەو لاوە بێدەنگەدا وەستابووم.. دیمەنەکە هەمووی بێدەنگی بوو.. هیچ دەنگێك نەبوو تەنها دەنگی بێدەنگی نەبێت.. لە پڕ!!!؟ دەنگی گریان و هاواری بەکوڵ ئەو بێدەنگیەی هەژاند.. دەنگی خالید کە دەگریا.. نەمویست لەزەتی گریانەکەی و تامی فرمێسکەکانی پێ بپچڕم، لەوانەیە ئەوە سوکنایی بدات بەناخی، و غەمەکەی لابەرێت.. دوای چەند ساتێك ووتی: من ئێوەم خۆش دەوێت، و قورئانی پیرۆزم خۆشدەوێت و قورئان خوازانم خۆش دەوێت، و پیاوچاکان و چاکەکارانم خۆشدەوێت.. بەڵام.. باوکم، باوکم.. ووتم: باوکت؟! بۆچی باوکت؟؟ باوکم هەمیشە ئاگادارم دەکاتەوە کە ڕێگای ئێوە نەگرمە بەر.. لە ئێوە دەترسێت.. ڕقی لە ئێوەیە.. ئەو هەمیشە ڕقی ئێوە لەناخمدا دروست دەکات.. بۆ ئەوەش بەڵگە دێنێتەوە بە بەسەرهات و ئەفسانەی خەیاڵی.. بەڵام کاتێ من ئێوە دەبینم لەو ئەڵقەدا و قورئان دەخوێنن لە ڕوخسارتاندا نوور دەبینم.. نوور لە قسەکردنەکانتاندا، بەڵکو نور لە بێدەنگیەکەتاندا... من گومانم هەیە لە قسەکانی باوکم، لەبەرئەوە هەمیشە دوای مەغریب دادەنیشم، دادەنیشم و وا وێنادەکەم کە لەگەڵ ئێوەدام، نوور لە ئێوەوە وەردەگرم، وە خۆم شەرەفمەند دەکەم بە نزیکیمەوە لە ئێوە.. ئایا لەیادتە مامۆستا سەلمان، لەیادتە کاتێ دوای نوێژی عیشا هاتیت بۆلام.. من هەر لە زووەوە چاوەڕوانی تۆم دەکرد.. ڕۆحی من بگریت..و لەگەڵ ڕۆحەکانی

ئێوەدا باڵەفڕببێت.. لە جیهانی پاکێتی و داوێن پاکی و نور و خۆڕاگری و ڕێك وەستاندا... غیرەت گرتمی و هاتمە ئەڵقەکەوە.. تێکۆشام.. نەدەخەوتم.. ڕۆژ و شەوم بوو بوو بەدیداری قورئان.. باوکم هەستی بە گۆڕانی ژیانی من کردبوو. بەهەرشێوەیەك بێت زانی کەمن چومەتە ئەڵقەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزەوە.. تا ئەو شەوە ڕەشە هاتە پێشەوە.. ئێمە چاوەڕوانی گەڕانەوەیمان دەکرد لەقاوەخانەوە وەك نەریتی ڕۆژانەی تا نانی ئێوارە پێکەوە بخۆین، هاتەماڵەوە بە ڕوخسارێکی تاریك و تورەوە.. لەسەر خوانی خواردنەکە دانیشتین.. هەموان –وەك پیشەی هەمیشەییمان– بێدەنگ بووین، هەموومان لەکاتی ئامادەبوونی ئەودا لەقسەکردن دەترساین، پاشان ئەو بەدەنگە بەرزەکەی بێدەنگیەکەی پچڕی و بەڕاشکاوانە ﴿کەپیشەی هەمیشەیی بوو﴾ ووتی: بیستومە تۆ هاوڕێیەتی قوتابیانی مزگەوت دەکەیت؟ زمانم لاڵ بوو، نەمدەتوانی هیچ بڵێم، ووشەکان لە زارمدا تەتەڵەیان دەکرد.. چاوەڕوانی وەڵامی نەکرد.. قۆریە چاکەی هەڵگرت و بەهێزەوە فڕێیدا بۆ ڕوخسارم، دنیا لەبەرچاوم سوڕایەوە.. ڕەنگەکان لەبەرچاوم تێکەڵ بوون، وام لێهات دیوار و سەقف و زەوی ژوورەکەم لەیەك جیانەدەکردەوە، کەوتم.. دایکم هەڵیگرتم.. بەهۆی دەستە گەرمەکانیەوە لە بورانەوە کەمەکەم بەئاگا هاتمەوە.. باوکم بەدەنگێکی بەرز ووتی: وازی لێ بێنە، ئەگەرنا تۆش وەك ئەو لێ دەکەم.. هێزم هێنایە بەر خۆم و تا بڕۆم بۆ ژوورەکەی خۆم.. ئەویش بەناشرینترین شێوە قسەی پێدەوتم.. ڕۆژێك تێنەدەپەڕی کە لێم نەدات و قسەم پێ نەڵێ و نەکێشێت پیامدا.. هەرچی لەبەردەستا بوایە هەڵی دەدا بۆم.. تەنانەت جەستەم وەك تابلۆیەکی ترسناکی لێ هاتبوو.. ڕەنگە تاریکەکان تێکەڵی بوو بوون.. ڕقم لێی دەبوویەوە، دڵم پڕ بوو بوو لە ڕق و قین بەرامبەری. ڕۆژێکیان لەسەر سفرەی نان خواردن دانیشتبووین ووتی: هەستە.. نان مەخۆ لەگەڵماندا.. پێش ئەوەی هەستم، ئەو هەستایەوە و کێشای بە پشتمدا.. خستمی بەسەر خواردنەکەدا... ﴿بیرم کردەوە﴾ کە ئێستا هاواربکەم بە ڕوویداو پێی بڵێم: بەخوا هەقی خۆمت لێ دەکەمەوە.. چۆن لێم دەدەیت، منیش لێت دەدەم.. گەورە دەبم و بەهێز دەبم... تۆش بەساڵا دەچیت و لاواز و بێهێز دەبیت.. ئەو کاتەش چیت لێ کردووم وات لێ دەکەمەوە.. بەخراپترین شێوە پاداشتت دەدەمەوە.. پاشان

ڕامکرد.. لەماڵ هاتمە دەرەوە.. ڕامکرد بەبێ ئەوەی بزانم بۆکوێ دەچم، بەبێ ئامانج.. تا پێیەکانم منیان هێنا بۆ سەر ئەم دەریایە، کە شەپۆلەکانی خەمەکانی دەروونم و ئازارەکانی دڵم دەشواتەوە.. قورئانەکەم گرت بەدەستەوەو دەمخوێندەوە.. تا ئەو ئەندازەیەی ئەم توانی لە خوێندنەوەی بەردەوام بم.. بەهۆی گریانی زۆرەوە.. لەوساتەدا چەند فرمێسکێکی پاك لەچاوەکانی خالیددا بارین.. کە لەبەردەم ڕووناکی مانگەکەدا دەبریسکایەوە وەك چۆن مرواری لەژێر ڕووناکیدا دەدرەوشێتەوە.. یەك قسەم نەکرد.. سەرسامی زمانی بەستبووم، ئایا سەرسام بم لەم باوکە نەگریسە، کە دڵی بەتەواوی خاڵیە لەماناکانی بەزەیی.. و هەموو جۆرەکانی توندوتیژی لە دڵیدا هێلانەیان کردووە یان سەرسامبم لەم کوڕە ئارامگرە، کە خوای گەورە هیدایەتی ویستووە بۆی.. و چەسپاوی کردووە.. یان سەرسامبم لە هەردوکیان.. کاتێ پەیوەندی کوڕ و باوکایەتی نێوانیان گەشتۆتە بنبەست.. پەیوەندیان وەك پەیوەندی شێر و پڵنگ..و ڕێوی و گورگی لێهاتووە.. دەستیم گرت،و بەدەستەکانم فرمێسکەکانیم سڕی..و دوعام بۆ کرد..و ئامۆژگاریم کرد کە چاکبێت لەگەڵ باوکیدا بەئارامگرتن لەسەر ئازارەکانی با چی دەکات بی کات.. بەڵێنم پێدا کە باوکی ببینم و قسەی لەگەڵدا بکەم و سۆزی ڕابکێشم.. ڕۆژان تێپەڕین و منیش هەر بیرم دەکردەوە لە ڕێگایەك کە قسە لەگەڵ باوکی خالیددا بکەم و ببینم و چۆن قسە بکەم لەگەڵیدا..و چۆن قەناعەتی پێ بکەم.. بەڵکو چۆن خۆمی پێ بناسێنم.. وە چۆن تەقە بدەم لەدەرگا.. لەکۆتاییدا هەموو هێزی خۆم کۆکردەوە..و بیر و هۆشم کۆکردەوە.. بڕیارمدا کە بەرەوڕوی ببمەوە.. مەبەستم ڕووبەڕوو بوونەوەیە.. ئەمڕۆ.. سەعات پێنج... ڕۆشتم بۆماڵی باوکی خالید.. بیرۆکەی زۆرم پێ بوو، لەگەڵ پرسیارە زۆرەکانم.. تەقەم دا لەدەرگا..و دەستەکانم دەلەرزین، قاچەکانم نەیاندەتوانی هەڵمبگرن.. پاشان دەرگاکە کرایەوە.. ئەو ڕوخسارە گرژەم بینی، کە تورەیی لێ دەباری... خەندەیەکی زەردم کرد، بەڵکو تەماشا ڕەشبینانەکەی قوت بدات.. پێش ئەوەی قسە بکەم!! پۆشاکەکانی گرتم و ڕایکێشام بۆلای خۆی.

ووتی: تۆ خۆبەخشەکەیت کە وانە بەخالید دەڵێیتەوە لە مزگەوت؟؟

ووتم: بە.ڵ.ێ..

ووتی: بەخوا ئەگەر جارێکی تر بتبینم لەگەڵیدا دەگەڕێیت، قاچت دەشکێنم.. خالید لە ئێستە بەدواوە نایەت بۆ لاتان.. پاشان ﴿مادەی ناو دەمی کۆکردەوە﴾و بەیەکجار هاویشتی بۆ ڕوخساری ئەم بەندە هەژارەی خودا.. دەرگاکەی داخست.. کۆتاییەکەی میسك بوو ﴿ختامە مسك﴾.. ڕوخسارم پاکردەوە لەو دیاریەی کە پێشکەشی کردم.. دڵنەوایی خۆمم دەکرد و دەموت ﴿پێغەمبەری خوا(د.خ) لەمە زۆر زیاتری پێکرا، گەلەکەی بەدرۆزنیان دەزانی و قسەیان پێ دەوت...و بەردیان تێ دەگرت..و قاچیان خوێن لێ دەهێنا..و چوارپەلیان دەشکاند..و پیساییان دەکرد بەسەریدا..و لەزەوی و خاکی خۆی دەریان دەکرد﴾.. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تێپەڕی، مانگ لە دوای مانگ تێپەڕی، ئێمە خالیدمان نەدەبینی، باوکی نەیدەهێشت بێتە دەرەوە تەنانەت بۆ نوێژکردنیش، وە نەیدەهێشت ئێمە ببینین و سەردانیشی بکەین.. دوعامان بۆکرد و بەهۆی سەرقاڵی ژیانەوە لەبیرمان کرد.. چەند ساڵێك تێپەڕی.. شەوێکیان.. دوای نوێژی عیشا.. لە مزگەوت.. دەستێکی قورس سەرشانمی گرت.. هەر ئەو دەستەبوو کە پێش چەند ساڵێك ملی گرتم..و هەمان ڕوخسار بوو.. هەمان سیما.. و هەمان دەم کە ڕێزی لێنام بە شتێ کە شایانی نەبووم، بەڵام؟!! گۆڕانێکی گەورە ڕوویدابوو!! ئەو ڕوخسارە مڕ و مۆچە.. نەرم و نیان بوو بوو، زەلیل و لەسەرخۆ بوو، جەستەکەش غەم و خەفەت بێهێزی کردبوو.. چۆنی مامەگیان.. سەریم ماچ کرد و بەخێرهاتنیم کرد.. چووینە گۆشەیەکی مزگەوتەکەوە.. زۆر گریا!! سبحان الله.. هەرگیز گومانم نەدەبرد کە ئەو کێوە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوا چۆك دابدات.. و ئەو ڕووبارە شەپۆلاویە، ئاوا ئارام بوو بێت.

ووتم: قسەبکە مامە، چی لەدڵتایە بیڵێ، خالید حاڵی چۆنە؟

ووتی: خالید، وەك ئەوەی بەو ووشەیەی من خەنجەرێك بکەیت بە سکیدا..و چەقۆیەك بکەیت بەدڵیدا.. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو ووتی: خالید، کوڕی خۆم، ئەو خالیدە نیە کە دەتناسی.. ئێستە ئەو گەنجە لەسەرخۆ و خواناس نیە.. لەو کاتەوەی لای ئێوە نەماوە.. ئاشنا بوو بە کۆمەڵێکی سەرەڕۆ، ئەو لە هەڵسوکەوتیدا کۆمەڵایەتیە.. ئەو لە تەمەنێکدایە حەزدەکات بڕوات و بێت و یاری بکات و خۆش بگوزەرێنێ.. سەرەتا دەستی کرد بە جگەرەکێشان.. قسەم پێ وت و لێمدا.. سوودی نەبوو

جەستەی بە لێدان ڕاهاتبوو.. گوێی کاس بوو بوو لە قسە پێوتن و لۆمەکردن.. بەخێرایی گەورە بوو.. شەو لەگەڵ هاوڕێکانی دەمایەوە.. تەنها لەکاتی بەرەبەیاندا دەگەڕایەوە.. لەقوتابخانە دەرکرا.. هەندێ شەو دەهاتەوە، قسەکانی قسەی خۆی نەبوون، ڕوخساری، ڕوخساری خۆی نەبوون.. زمانی تەتەڵەی دەکرد، دەستی لەرزی و.. جەستەیەکی لەرزۆکی لاواز.. ئەو ڕوخسارە سپیە پاکەی گۆڕابوو.. بۆ ڕوخسارێکی ڕەش کە تەپ و تۆزی تاوان و تیاچون نیشتبووەوە پێیەوە.. ئەو دووچاوە سافە شەرمنانەی گۆڕابوون بۆ دووچاوی سوور وەك ئاگر.. وەك ئەوەی کە ئەوەی دەیخوات و دەیخواتەوە هەر لەم دنیایەدا پێش ئاخیرەت سزاکەی بچێژێت.. ئەو شەرم و حەیایەی نەمابوو.. لە جێگایدا بێ ئەدەبی و بێ شەرمی جێگەی گرتبوویەوە ئەو دڵە پاکە گۆڕابوو بۆ دڵێکی ڕەق وەك بەرد بەڵکو ڕەقتر لەبەرد... ڕۆژێك تێنەدەپەڕی ئەگەر قسەی پێ نەوتمایە یان تێی نەسرەواندمایە، یان لێی نەدامایە.. وێنای بکە کوڕی خۆم.. من باوکی ئەوم و لێم دەدات؟! پاشان بەکوڵ دەستی کردەوە بەگریان و هاوار.. پاشان فرمێسکەکانی سڕی، ووتی: تکات لێدەکەم، کوڕی خۆم.. ئەی سەلمان.. سەردانی خالید بکەن.. لەگەڵ خۆتان بیبەن... ڕێگاتان پێ دەدەم.. دەرگای ماڵم لەئاستی ئێوەدا کراوەیە.. بڕۆن بۆلای.. ئەو ئێوەی خۆش دەوێت.. ناوی تۆمار بکەن لە ئەڵقەی لەبەرکردنی قورئان.. لەگەڵ خۆتاندا بیبەن بۆ گەشتەکانتان.. من هەرگیز نارازی نیم... بەڵکو من ڕازیم کە لەماڵەکانی ئێوەشدا بژی..و لەگەڵتاندا بخەوێت.. گرنگ ئەوەیە.. خالید بگەڕێتەوە بارودۆخی جارانی.. تکات لێدەکەم کوڕی خۆم دەستت ماچ دەکەم... پێکانت ماچ دەکەم.. تکادەکەم.. تکا.. دەستی کردەوە بەگریان و ناڵە.. هەتا هەموو ئەوانە کۆتایی هات.

پێم ووت: مامە ﴿ئەوە کشتوکاڵی خۆتە..و ئەوەش بەرهەمەکەتە﴾ لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا. من هەوڵی خۆم دەیەم.

# ٨١- ﴿تەوبەی گۆرانیبێژی صۆماڵی (عبدوڵلا زولفا)﴾

لە یەکێ لە قوتابخانە بنەڕەتیەکان لە مەقادیشۆ، مامۆستایان و کارگێڕان کۆبوونەوە، و بەڕێوەبەری قوتابخانەکەشیان لەگەڵدا بوو، بەتاسەوە گوێیان لەو لاوە ئەسمەرە لاوازە دەگرد، کە بە دەنگە سیحراویەکەی قسەی دەکرد.. چەندین شیعری عەرەبی دەوت.. صۆماڵ لەو کاتەدا ژیانێکی سۆشیالیستانە دەژیا لەسەردەمی سەرۆك ﴿سیاد بەری﴾.. دەبوو ئەو لاوە بەهرەی خۆی لەو بوارەدا خەریك بکات، شاعیرەکان پێشبڕکێیان دەکرد لە دانانی شیعری ستایش بەسەر سەرۆك و سەردەمەکەیدا.. تا ئەو لاوە کە ناوبانگی دەرکردبوو لە قوتابخانەکانی پایتەختدا بیخوێنێتەوە بوو بوو بەجێی سەرنجی بەرپرسیارانی پەروەردە و فێرکردن.. ئەو لاوە گەشتە قۆناغی ئامادەیی، لەگەڵیدا بەهرەی زیاتری پەیدا کرد بوو، بوو بەجێ سەرنجی وەزیری فێرکردن، بۆیە وەزیر بڕیارێکی دەرکرد بە دامەزراندنی تیپێکی مۆسیقی لەژێر سەرپەرشتی ئەو لاوەدا.. ئەوە سەرەتای کاری عبدوڵلا زولفی بوو، گۆرانیبێژی تۆبەکاری سۆماڵی، کە بڕیاریدا دوورکەوێتەوە لەو تیمەی کە تێیدا بوو چونکە بەرەو دۆزەخ دەچوون. ناوبانگی بڵاوبوویەوە، وای لێهات هەموو تاکێکی سۆماڵی و جیبۆتی دەیانناسی، نازناوی یەکەم گۆرانیبێژی سۆماڵیان لێ نابوو، لەساڵی ١٣٩٦ك، سۆماڵ خاڵێکی وەرچەرخانی بینی لە بۆچوندا، بەشێوەیەك پسپۆڕە سۆڤیەتیەکان دەکران، و پشت بە سیاسەتی کرانەوە بەسترا، پێویست بوو ئەو گۆرانیبێژە یەکەم وەڵامی ئاراستەی وڵاتەکەی بکات، وازی لە تیمە مۆسیقیە حوکمیەکە هێناو، بۆ حسابی خۆی کاری دەکرد، لە گۆرانی وتنەوە بۆ سۆشیالیستی دەستی کرد بە گۆرانی وتن بۆ سیاسەتی کرانەوە.

عبداللە زولفا دەڵێ: مەلهایەکی شەوانەم کڕی و گۆرانیم تێدا دەوت، ئوتێلی مەقەدیشۆ و مەلهاکانی پێشبڕکێیان دەکرد بۆ میوانداری کردنم، منیش لە دوو هوتێلە گەورەترینەکەی پایتەخت ﴿عروبە، جوبا﴾ گۆرانیم دەوت، ڕۆڵی من لەگەڵ پێداویستی قۆناغەکەدا دەڕۆشت، پێویست بوو لاوان نوقمی تاوان و گوناه بکەم،

بەشێوەیەك بیرنەكەنەوە كەچی دێت بەسەر وڵاتەكەیاندا،و چۆن سەروەت و سامانی وڵاتەكەیان تەفروتونا دەكرێت.. لاوانی دەوروبەرم سەمایان دەكرد، لەكاتێكدا تانك و موشەكەكانی ئەسیوبیا ناراستەی مزگەوتەكان دەكران لە «هرجیسیا» و «برعو»و چەند شاری تری موسڵمانان نشین.. سەفەرم كرد بۆ لەندەن و پاریس و رۆما، و چەندین پایتەختی تری ئەورووپی و ئەفریقی بۆ پێشكەشكردنی هونەری نوێی سۆماڵی!! لاوانێكی زیاتر هۆگرم بوو بوون.. مردنیش لە چاوەڕوانی هەركەسێكدا بوو كە باس لە بارودۆخی گشتی بكردایە. میدیاكانیش بەردەوام ستایشی ئەو گۆرانیانەی منیان دەكرد كە پێشكەشم دەكردن.. ئەوەش مانای ئەوەیەكە بڕێكی زیاد پارە دەهاتە گیرفانمەوە.

ساڵی ١٩٨٣. «١٤٠٣ك» ساڵێكی جیاكەرەوە بوو لە ژیانمدا.. باوك و دایكم دەیانەویست دڵخۆش بن بە ئاهەنگی هاوسەرگیری كوڕەكەیان، كە بوو بووە جێگەی سەرنجی لاوانی كوڕ و كچی سۆماڵی.. دەترسان ئافرەتێك بخوازم كە نەیناسن و دووركەومەوە لێیان، بۆیە كچێكی خزمیان بۆ دۆزیمەوە كە زەماوەندی لەگەڵدا بكەم، بەڕاستی ئاستێكی بەرزی هەبوو لە رۆشنبیری و جوانیدا.. بەبێ دوودڵی ڕازی بووم پێی.. وام پێشبینی دەكرد كە ئەویش لەخۆشیاندا كە دەبێتە هاوسەری من باڵ دەگرێتەوە.. بۆچی نا، من لەنێو هەزاران كچدا كە ئاواتەخوازن بن بەهاوسەرم، ئەوم هەڵبژاردووە.. بەڵام پێشبینیەكەی من وادەرنەچوو، هەر لەشەوی یەكەمدا لە چاوەكانیدا هەستم بەخەمێكی شاراوە دەكرد، كە كامێراكانی تەلەفزیۆن و فۆتۆگرافەكان كە هۆڵەكەیان پڕ كردبوو نەیاندەتوانی بیشارنەوە. وا گومانم دەبرد كەمەسەلەكە تەنها شەكەتی یان شەرمنیە. كە كچان لەو جۆرە ساتانەدا توشی دەبن.. بەڵام كارەكە بەو شێوەیە نەبوو.. من پێش بەرەبەیان لە مەلها دەگەڕامەوە.. دەمبینی ژنەكەم قورئان دەخوێنێ، و ئەگەر باسی بەسەرهاتی خۆمم بۆ بكردایە ئەو تەنها بە سڵاوكردن كۆتایی پێ دەهێنا..و داوای هیدایەتی بۆ دەكردم.. پاشان دەچوو بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی.. منیش دەچومە سەر جێگاكەم.. هەركاتێ باسی كارەكانی خۆمم بۆ بكردایە ئەو وەڵامی دەدامەوە «رۆزیدەر تەنها خوای گەورەیە» لەوكاتەدا لە نهێنی ئەو قسەیە نەدەگەیشتم. ئێمە دوچاری هەژاری و نەداری

نەبووبووین.. دوای پێنج ساڵ خێزانم وای بینی کە ڕاستەوخۆ بەرەو ڕووم ببێتەوە، ڕۆژێکیان کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، مزگەوتەکانی ناوشار دەنگی ﴿الله اکبر﴾یان لێ بەرز دەبوویەوە... بە ناخافڵی لێی پرسیم: بۆچی نەچویت بۆ مزگەوت، لە کاتێکدا گوێت لە بانگی بەیانیەوە بوو.. ئەوە یەکەمین جار بوو کە ببیستم کە من دەتوانم بچمە مزگەوتەوە.. و دەتوانم ببمە موسڵمانێکی چاك و خواناس، ئەوە سەرەتای جەنگێك بوو لەناخمدا لەنێوان فیترەتمدا کە بانگی دەکردم بۆ وەڵامدانەوەی ئامۆژگاری هاوسەرەکەم، و واقیعی نوقم بووم لە گۆماوی هونەری سەرەڕۆییدا.. بۆ ئێوارە پۆشاکەکانم چاك دەکرد تا خۆم ئامادەبکەم بۆ ڕۆشتن بۆ مەلها، لەوکاتەدا خێزانم بە نەرمیەکەوە چپاندی بەگوێمدا ﴿ئازیزم، پشووبدە، ڕۆزی بەدەست خوایە﴾ ترسام لە بەردەمیدا بە لاوازیی دەرکەوم.. بەپەلە ڕۆشتمە دەرەوە لەماڵ، بەڵام ڕەحمەتی خوای گەورە لە قەرەوڵدا بوو بۆ من.. هەرکە لە ئۆتۆمبێلەکەم دابەزیم و ویستم بڕۆمە ژوورەوە بۆ مەلهاکە، گوێم لە دەنگی بانگەوە بوو بۆ نوێژی عیشا: ﴿حی علی الفلاح، حی علی الفلاح، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله﴾ وەك ئەوەی بۆجاری یەکەم بێت گوێم لەو بانگ کردنەوە بێت.. منیش هەر ئەوەندەم پێکرا ئاراستەی خۆمم گۆڕی و ڕۆشتم بۆ مزگەوتەکە.. دەستنوێژم گرت، نوێژم کرد لەگەڵ ئەو نوێژگەرانەی کۆبوو بوونەوە بەچواردەورمەوە.. کە بەراستی بە پیرۆزبایی و بەخێرهاتن داباریین بەسەرمدا.. ڕوخساریان پڕ بوو بوو لە ئاسودەیی و بەختەوەری، یەکێکیان کتێبی ﴿ شەرحی فەرمودەکانی بوخاری﴾ پێشکەش کردم. لە مزگەوتەکە چوومە دەرەوە، و سواری ئۆتۆمبێلەکەم بووم، و ڕاستەوخۆ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە تا مژدە بدەم بە خێزانم کە من سەرلەنوێ لەدایك بوومەتەوە. ئەوە بوو بەسەرهاتی یەکەم گۆرانیبێژی سۆماڵی و هیدایەتدانی، ئەو بەچەند هەنگاوێکی کردەیی ڕاستی تەوبەکەی سەلماند.. سەرەتا ئامێرە دەنگیەکانی بەخشی و هەروەها ستۆدیۆکەشی بەخشی بۆ خزمەت بەبانگەوازی ئیسلامی.. وردە وردە داهاتەکەی کەمی کرد،و ماڵ و سامانەکەی کەم بوویەوە، ئەو گۆرانی بێژ بوو، هیچ داهاتێکی نەبوو تەنها ئەو پارەیە نەبێت کە بەهۆی گۆرانی وتنەوە دەستی دەکەوت.. ئەوەش چۆکی پێ دانەدا، ئۆتۆمبێلەکەی و خانوە گەورەکەی فرۆشت،.. شیرینی ئیمان کە دڵی ئەوی پڕکردبوو سەبوری بۆ داهێناو

خەمەکانی دەڕەواندەوە.. و هەروەها ئەو ئاسودەییەی کە خێزانی بۆی دەستەبەر کردوو بەردەوام دەیوت ﴿ڕۆژێدەر خوای گەورەیە﴾ ئێستە ئەو دەستەواژەیە ماناو چێژی تایبەتی هەیە، مادام پێشتر هەستی پێ نەدەکرا. لەبەر ئەوەی ڕێگای بانگەواز و تەوبەکردن تەنراوە بە ناڕەحەتی و تاقیکردنەوە، دەسەڵاتداران بانگیان کرد و لۆمەیان کرد لەسەر ئەو هەنگاوانەی کە ئەوان ناویان لێ نابوو ﴿سەرکەشیکردن﴾ وە لەسەرەتادا واگومانیان دەبرد کە تەنها بریتیە لە ماڵێکی کاتی لە هونەرمەندێکەوە دەیەوێ سەرنجی خەڵکی بۆ خۆی ڕاکێشێت.. بەڵام بینیان بووە بە مرۆڤێکی تر، نەك ئەو مرۆڤەی ئەوان بە درێژایی هەژدەساڵ خویان پێوە گرتبوو-تەمەنی کاروانی هونەرەکەی- هەڕەشەیان لێ کرد و داوایان لێ کرد کە لە تەلەفزیۆندا دەرکەوێت و پەشیمان ببێتەوە لە هەڵوێستەکانی، و پۆزش بۆ هەوادارانی لە کوڕان و کچان بهێنێتەوە، و دڵنیایان بکات کە ئەوە هەڵوێستێکی سەرکەشانەبوو.. ئەویش ڕەفزی کرد وابکات.. کاتێ بۆیان دەرکەوت بەگوێیان ناکات، ناچاربوون بەندی بکەن!! بەڵێ... بەندیان کرد، چونکە وازی لە ڕۆڵێکی گرنگ هێنابوو کە ئەویش مەستکردنی لاوان بوو، ئەو بوو بە پێشەنگ لە جۆرێکی تر، جۆرێك ناهەقانی توشی دڵەڕاوکێ کردبوو،و هەڕەشەی لە پرۆژەکانیان دەکرد. بەکارهێنانی داریش سودی نەبوو، ناچار پەنایان بردە بەر ئەوەی ئیغرای بکەن.. پێشنیاری بڕێکی زۆر پارەیان بۆ کرد تا بگەڕێتەوە بۆ کاری هونەری.. بەڵام هەر ڕازی نەبوو.. پێشنیاریان بۆ کرد کە ئاهەنگێکی وازهێنانی بۆ ساز بکەن، بەڵکو ئەوە ببێتە سەرەتایەك بۆ ئەوەی ڕایکێشنەوە بۆ گۆرانی وتن جارێکی تر.. بەڵام ئەو لە پیلانەکە تێگەشتبوو، بۆیە ڕەفزی کرد.

عەبدوڵلا زولفا دەڵێ: ﴿بیر و باوەڕم بەهێز بوو، هاوسەرەکەشم لەو ناڕەحەتیانەمدا شان بە شانم وەستا بوو، بۆیە بەیەکجاری بڕیارمدا بوو کە نەگەڕێمەوە بۆ گۆرانی ووتن﴾

لەساڵی ١٤١٠ك ویستی دەربچێت لەو کەشی ئابلۆقەیە کە دەورەی دابوو، وە ئەو بەدواداچوونەی کە بوو بوە هۆی فشار دروستکرن بۆ سەری، بۆیە دەروویەکی شك نەبرد بێجگە لە ڕۆشتن بەرەو ماڵی خوا.. بەڵێ لەوێ شەحن بوویەوە بە شەحنێکی

ئیمانی نویێ، کە کاریگەری باشی هەبوو بۆ دامەزراوی لەسەر ڕێگای ئیمان، لەوێ دەستە پاکەکان لە مەککە دەورەیان داو سەرپەرشتیان دەکرد هەتا ئەو ئەندازەیەی کە توانی ١٠ جوزئی قورئان لەبەر بکات کاتێ شاوری جەنگ لە سۆماڵ لێدرا، و هۆزەکان و میلیشیاکان کەوتنە گێژاوی شەری نەگریسی ناوخۆوە، ئەو بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ سۆماڵ، لە کاتێکدا خەڵکی ڕایان دەکرد.. بەڵێ سۆماڵ زۆر پێویستی بە ڕۆڵی عبدالله ی نویێ هەبوو وەك بانگخواز و موصلیحێك.. ویستی کارەکانی بکاتە کەفارەتی ئەو تاوانانەی کە دەرهەق بەلاوانی سۆماڵ کردبووی.. بەڵێ بە سۆماڵدا دەگەڕا و لاوانی هاندەدا لەسەر ئارامگرتن و جێگیری و ئاشتی.. و ئاگاداری دەکردنەوە کە شوێن عەصابەکانی جەنگ و فەساد و خوێنڕشتن نەکەون. کاتێ بۆی دەرکەوت ئاژاوە خەریکە بنبڕ دەبێت، سۆزی مەککە ڕایکێشایەوەو گەڕایەوە بۆ مەککەو هەنگاوێکی گەورەتری نا لە لەبەرکردنی قورئاندا.. ئێستا عبدالله کاری بانگخوازی دەکات.. هەندێ لە هاوڕێکانی بانگیانکرد تا بەهرەکەی بەکاربهێنێت لە خزمەتکردن بە بانگەواز، لە کاتێکدا ئەو خاوەنی دەنگێکی زوڵاڵە کە دەتوانێ خۆشترین سروود بڵێت.. بەڵام ڕازی نەبوو.. ووتی: دەترسم ئەگەر لە دەرگای سروودەکانەوە بڕۆمەوە جیهانی هونەر، دیسان بگەڕێمەوە بۆ کاری جارانم، لای ئێمە لە سۆماڵ دەوترێت: ئەو دەستەی شتی کەم دەدزێت، سەرەنجامەکەی هەر دزیە، هونەر بەم وەسفەی ئێستایەوە حەرامە، بۆ خزمەتکردن بە ئیسلام ناشێت، وە من بواری بانگەوازم هەڵبژاردووە کە دووربم لە هونەرەوە... هەندێ لە زانایان ڕێگایان داوە بە گۆرانی ووتن بێ مۆسیقا بەمەبەستی حەماسەت و پەند و پابەند بوون بە ئاینەوە، بەڵام من بەشیاوی نازانم بۆ خۆم، وە ڕێگر نیم لە کەسێ کە توانا لەخۆیدا شك دەبات بۆ بەکارهێنانی هونەر بۆ پەروەردەکردنی ڕۆحی ئیسلامی لە دەروونی خەڵکیدا.. بارودۆخی سۆماڵ پێویستی بە هونەر نیە، بەڵکو پێویستی بە نزاو پاڕانەوەکان هەیە لە سێیەکی کۆتایی شەودا، لە گەڵ گرتنە بەری هۆکارەکاندا، بۆ ڕزگارکردنی لەو بارە مەینەتیەی کە تێیدایەتی.

## ٨٢- ﴿هەستام و نوێژم کرد﴾

بەڕێزان.. قسەکانم دەست پێدەکەم بەو خەونەی کۆتایی کە پێری بینیبووم، لەو شەوەدا وەك نەریتی ئاسایی، لەسەر کۆمپیوتەرەکەم بووم، تەماشای ئینتەرنێتم دەکرد، هەرخوا خۆی دەزانێ کە شەیتان چەندە وەسوەسەی خستە دڵمەوە تا تەماشای ئەو شتانە بکەم کە خوای گەورە حەرامی کردوو لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.. وە چەندە ئاسانە کە ئەو شتانە ببینیت کە خوا حەرامی کردووە لەسەر ئەو ئامێرە.. کاتێ شەیتان زاڵ بوو بەسەرمدا، غیرەت گرتمی و پەنام گرت بەخوای گەورە لەشەیتانی نەفرەت لێ کراو، پاشان هەستام و دەست نوێژم گرت، پاشان هەستامەوەو دوو ڕکات نوێژم کرد، کاتژمێرەکە دووی شەوی نیشان دەدا، لەبەردەم خوای گەورەدا وەستام و دووڕکات نوێژم کرد، کاتێ لێبوومەوە تا هەستامەوەو پاشان ڕۆشتمە سەر جێگاکەم، پاشان سێ سورەتەکەم خوێند ﴿المعوذتین﴾ و ﴿الإخلاص﴾و پاشان ﴿آیة الکرسی﴾ پاشان دوعا چەسپاوەکان، ئینجا خەوتم، و ئەم خەوەم بینی: ﴿بینیم جیهان کۆتایی هاتووەو هەموو خەڵکی سەر زەوی مردوون، منیش لەناویاندام، پاشان زەوی شەقی بردوو مردوەکانی فڕێدایە دەرەوە و منیشی تێدابووم.. خوایەگیان..پاشان هەستامەوە و تەپ و تۆزم بەخۆمەوە تەکاند و لەسەرساميدا بووم، خوای گەورە هەموو مرۆڤەکانی کۆکردەوە، لەگەڵیاندا ڕۆشتم بۆ گۆڕەپانی حەشرکردن، ترس و تۆقین دایگرتبووم، بەڵام شتی تر هەبوو سەیرتر بوو لە خەیاڵ، من دەمکرد، بەڵکو دەموتەوە، ئایا دەزانن چیم دەوت، من کە دەڕۆشتم بۆ گۆڕەپانی حەشر دەموت ﴿سبحان الله و بحمدة، سبحان الله العظیم﴾ وە لەگەڵ خۆمدا دەدوام و دەموت ﴿عسی أن یرحمنی الله، یا الله، عسی الله أن یرحمنی، عسی الله أن یرحمنی﴾ ﴿بەڵکو خوا ڕەحمم پێ بکات﴾ پاشان بەو شێوەیە خەبەرم بوویەوە، کات سەعات چواری بەیانی بوو، دەستنوێژم گرت تا نوێژی بەیانی بکەم، کاتێ ڕۆشتم بۆ مزگەوت،و ئیمام دەستی کرد بە قورئان خوێندن، بەو سورەتە دەستی پێ کرد ﴿بسم الله الرحمن الرحیم، القارعە، ما القارعە- تا کۆتایی سورەتەکە.﴾ پاك و بێگەردی بۆ خوای مەزن، داواکارین لەخوای گەورە عاقیبەت خێرمان کات و دوعای خێر بۆ براتان بکەن تا دامەزراو بێت لەسەر حەق.

## ٨٣- ﴿ژوورەکە ئامادەبوو بۆ تاوانی زینا﴾

یەکێ لە بانگخوازان دەڵێت: من لەیەکێ لە گەڕەکە ڕاقیەکاندا بووم بۆ پێشکەشکردنی موحازەرەیەك، لەکاتی گەڕانەوەمدا چەند لاوێك لەیەکێ لەمەیدانەکاندا وەستاندمیان، لاوێکیش لە نوسینگەکەی بەخێرایی دابەزی، کاتێ زانی من لەوێم، کە لە گەورەترینی خێزانەکانی ئەو شارە بوو بەگەرمی سڵاوی لێ کردم و بانگهێشتی کردم بۆ سەردانی نوسینگەکەی بۆ خواردنەوەی چاو قاوە، منیش ڕەزامەندیم نواند. وە تەنها بە چونمان بۆ ناو نوسینگەکە، ئەو بەدەم گریانەوە پێی ووتم: مامۆستا گیان تۆ هۆکاری هیدایەتدانی من بوویت.. پاشان دەستی کرد بەقسەکردن و ووتی: من تەواو دوور لەخوا بووم بەڵکو گاڵتەم دەکرد و ڕام دەبوارد بەکەسانی دیندار و چاکەخوان، یەکەم شتێ لەسەر سفرەکەم دابنرایە، عارەق بوو.. ئەو ژوورەی لکابوو بەم نوسینگەیەوە ئامادەکراو بوو بۆ ئەنجامدانی زیناکردن، و سێ فەرمانبەرم هەبوو، جوانترین ئافرەتیان بۆ دەهێنام، ئەو سێ کارمەندە تەنها کاریان ئەوە بوو. ڕۆژێکیان من لەگەڵ کچێکدا بووم، هەستم بەئاسودەیی نەدەکرد لەگەڵیدا، فرمانمدا بە یەکێکیان کە ئافرەتێکی ترم بۆ بهێنێ.. ریمۆتەکە ﴿کۆنترۆڵ﴾م گرت بەدەستەوە بۆ بەسەربردنی کات، بەڵام سودی نەبوو. وە لەکاتی گەڕان بەنێو کەناڵەکاندا مامۆستا گیان تۆم بینی کە لەیەکێ لە کەناڵەکاندا موحازەرە پێشکەش دەکەیت، بە گاڵتەو ڕابواردنەوە ووتم ﴿ئەوە شوێنی ئەو جۆرە کەسانە نیە﴾ چەند چرکەیەك دانیشتم و تەماشای تۆم دەکرد، نەك لەبەر حەزی گوێگرتن بۆ تۆ، بەڵکو بۆ بینینی سیمایەك کە ڕانەهاتبووم ببینم ﴿پۆشاك، ریش، خاکیێ بوون﴾ دوای خولەکێك یان دوو خولەك قسەکانت ڕایان کێشام و ریمۆتەکە لەدەستم کەوتە خوارەوە، دانیشتم و گوێم لەقسە کاریگەرەکانت دەگرت، بەتەواوی هەژاندمیان، هەرئەوەندە هەستم بەخۆم کرد کە دەگریم.. موحازەرەکە کۆتایی هات کە تایبەت بوو بە ﴿مەترسیەکانی زینا.. بەڕێز مامۆستا محمد حسان﴾ هەستامەوەو لەش پیسیم دەرکرد،و دەست نوێژم گرت و نوێژم کرد، لە کاتی سوجدە بردنمدا هەستم بە حەسانەوەیەك کرد، کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوو، وە پۆستەکەم و ماڵ و سەروەتەکەم ئەو حەسانەوەیەی پێ نەبەخشیبووم، بە کوڵ گریام، ئەوە بۆچەندین ساڵ دەبێت کە یەکەم نوێژی من بوو، نوێژەکەم تەواوکرد و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.. بۆ سبەینێ بەیانی، لەگەڵ خێزانەکەمدا ڕۆشتم بۆ مەککە بۆ ئەنجامدانی عەمرە، تا لاپەڕەیەکی نوێ هەڵبدەمەوە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا.

سەرچاوە: م.محمد حسان.

## ٨٤- ﴿دڵی وەستابوو زاریشی هەرشایەتومانی دەوتەوە﴾

ئافرەتێك لەتەمەنی ٥٥ساڵیدا برا بۆ ژووری فریاکەوتن، لەئەنجامی بەریەککەوتنێکی سەختدا، کە بووە هۆی وەستانی دڵی.

هاورێکانم پەیوەندیان پێوە کردم.. داوایان لێ کردم پەلە بکەم بۆ بینینی.. ئەو کاتە نزیکەی سەعات حەوتی بەیانی بوو.. ڕامکرد بۆ ئەوێ بەڵکو لەسەر دەستی من خوای گەورە شیفای بدات.. کاتێ گەیشتم.. بینیم دڵەکوتێکەی زۆر سەخت بوو. داوام کرد بەپەلە بیبەن بۆ بەشی قەصتەرەی دڵ بۆ کاری قەصتەرە کردن و پەیوەستکردنی کارەبا پێیەوە.. لە کاتی شێلانی دڵیدا و هەوڵدان بۆ بوژاندنەوەی هەرچەندە ئامێرەکە ئاماژەی دەدا بەوەی کە دڵی وەستاوە، بەڵام شتێکی سەیر ڕوویدا، کە پێشتر نەمبینیبوو، وە ڕانەهاتبووم پێی! ئایا دەزانن چی بوو؟! ئافرەتەکە بەئاگا هاتەوە و چاوەکانی کردەوە، بەڵکو قسەی کرد؟! بەڵام دەزانن ووتی چی!؟ ووتی ﴿اشهد ان لا إله إلا الله.. واشهد ان محمداً عبد و رسوله﴾ پاشان... پێشبینی چی دەکەن؟! دڵی جارێکی تر وەستایەوە... ئامێرەکە ئاگاداری نیشاندا کە دڵی وەستاوە... سبحان الله!! ئەو کارە جارێکی تر دووبارە بوویەوە... هەردوو چاوی کرایەوە.. بە زاری ووتی ﴿اشهد أن لا إله إلا الله واشهد أن محمد رسول الله﴾ ئایا بڕوا دەکەن، کە ئەوکارە بە بەرچاومەوە سێ جار دووبارە بوویەوە، دڵی دەوەستا،و پاشان زمانی دەهاتە گۆ و شایەتومانی دەوتەوە، گوێم لە وشەیەکی ترەوە نەدەبوو.. نە ناڵە، نە بێزاری، نە داوای دنیایی، تەنها زیکری خوا و ووتنی شایەتومان!! پاشان دوای ئەوە وەفاتیکرد-خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات- شتێکی سەیرم بینی ڕوخساری ڕووناك بوویەوە، بەڵێ.. بڕوام پێ بکەن، سوێند بەو خوایەی پەرستراو نیە بێجگە لەو، ڕوخساری ڕووناك بوویەوە.. دەمبینی نووری لێ دەباری.. ڕۆشتمە دەرەوە بۆلای مێردەکەی تا سەرخۆشی لێ بکەم.. بینیم پیاوێکی سادەیە.. لە ڕواڵەت و پۆشاکدا خاکیە... دیار بوو فەقیر حاڵ بوو.. سەرخۆشیم لێ کرد و بیرم خستەوە یادی خوا بکات، هیچم لێ نەبینی بێجگە لە ڕازیبوون بەقەدەری خوا نەبێت.. لە ڕوخساریدا

نوری ئیمان و گوێڕایەڵیم بینی..

پێم ووت: بەڕێزم، شتێکی سەیر ڕوویدا بەسەر ژنەکەتدا، کە کارانێك بوون مژدەبەخش بوون بەخێر، سوپاس بۆ خوا، بەڵام حەز دەکەم پرسیارێك بکەم.. ژیانی ئەو چۆن بوو.. ئەو ژیانی چۆن دەگوزەراند؟! زۆر بەسادەیی و بەبێ گرێ ووتی: من ماوەی زیاتر لە ٣٥ ساڵە ئەوم خواستوە و خێزانمە و لەو کاتەوە بەدرێژایی ژیانی ئەو لەگەڵ مندا نەمبینیوە نوێژی ویتری نەکردبێت و شەوەکانی زیندوو نەکردبێتەوە، مەگەر نەخۆش بوایە یان بەهانەیەکی بەجێی هەبوایە..

## ٨٥- ﴿تەوبەی پیاوێکی پاکستانی﴾

(ئیبن قەیم) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت ﴿لەمەزنترین فێڵەکانی شەیتان کە زۆربەی خەڵکی گرفتاری بوون، کەم کەس لە داوی دەرچووە، مەگەر کەسێ خوای گەورە پاراستبێتی، لە کۆن و لە ئێستادا، ئەویش پشت بەستنە بە گۆڕی پیاوچاکان، تاوای لێهاتووە لە بری خوا بپەرسترێن و بکرێن بە بت و پەیکەریان لەسەر دروست بکرێت﴾.

وە دەڵێ ﴿هەندێکیان لە دوورەوە دێن و ئەگەر بەسواری وڵاخەوە بن کاتێ ئەو مەزارگانە بەدی دەکەن، دادەبەزنە خوارەوە، تەوێڵیان دەلکێنن پێیەوەو زەویەکەی و خاکەکەی ماچ دەکەن و سەر ڕووت دەکەن،و دەنگ و ناڵەیان لێ بەرز دەبێتەوە، و دەگرین و دەیکەن بەشین و شەپۆڕ، تکا دەکەن و لێی دەپاڕێنەوە.. کاتێ دەگەنە لای دوو ڕکات نوێژ دەکەن، و پێیان وایە پاداشت لەسەر پاداشتیان دەست دەکەوێت کە یەکێ ڕوو بە دوو ڕەوگە نوێژ بکات. دەیانبینیت بە دەوری گۆڕەکەدا لە ڕکوع و سوجدەدان، داوای کۆمەك لەو مردووە دەکەن، دەسیان پڕ دەکەن لە بێئومێدی خەسارەت، بۆ غەیری خوا بەڵکو بۆ شەیتان دەنگ بەرز دەکەنەوە، داوای پێویستیەکانیان لەو مردووە دەکەن، داوای لێ دەکەن دەروویان لێ بکاتەوە، و ئەوانەی دەردەدارن چاکیان بکاتەوە، پاشان بە دەوری گۆڕەکەدا تەواف دەکەن، هەر وەك تەوافی ماڵی خوا، پاشان مەزارەکەی ماچ دەکەن و خۆیان دەسوون لێی.. وەك چۆن خەڵکی بە بەردە ڕەشەکەی دەکەن. پاشان تەوێڵ و ڕومەتیان دەلکێنن پێیەوە، پاشان قوربانی پێشکەش دەکەن. ئەو کاتەش نوێژیان و قوربانیان و خێراتیان بۆ غەیری خوا دەبێت﴾.

خوێنەری بەڕێز دەوای ئەم پێشەکیە جوانە کە لام وایە پێویست ناکات درێژەی پێ بدەین، ئێستە بەجێت دێڵم لە گەڵ خاوەنی چیرۆکەکە تا باسی گەشتەکەیمان بۆ بکات، دەڵێت: لە کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو گەورە بووم لە گوندێك لە گوندەکانی پاکستان کەناوی ﴿شاری ئەولیاکان﴾ بوو بەهۆی بوونی ژمارەیەکی زۆر لە مەزارگە و گۆڕ... هەر لە منداڵیەوە باوکم و دایکم و برا و خوشکە گەورەکانم و خزمانم دەبینی، بەڵکو هەموو خەڵکی گوندەکە دەڕۆشتن بۆ زیارەتی ئەو گۆڕەی ناویان نابوو وەلی یان سەید، تا ئەوەندا ناحاڵی بوون دەڕۆشتنە ژوورێکی خاڵیەوە، کە نوێنێکی تێدا بوو

کەسی لەسەر نەبوو. وا گومانیان دەبرد کە ئەوە نزرگەی ئەو وەلیەیە بە زیندوویی و نامرێت، و ئەم ئایەتەی خوایان لەبیر چوو بوویەوە ﴿إِنْ تَدْعُوهُمْ لا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ(١٤)﴾فاطر.. واتە: ﴿ئەگەربانگیان لێبکەن گوێیان لە بانگ لێکردنەکەتان نییەو ئەگەر گوێیشیان لێبێ وەڵامتان نادەنەوەونایەن بەدەنگتانەوە. چونکە هیچیان پێناکرێ بۆتان ولەڕۆژی قیامەتیشدا ئینکاریی ئەوە دەکەن کە ئێوە ئەوانتان کردووە بە هاوبەشی خواو کەسیش ناتوانێ وەك یەکێکی ئاگادارو شارەزا کە خوایە لەم بابەتەت ئاگادار بکا﴾.

من بەشداریم دەکرد لە هاوەڵدانانەکەیاندا و لەو نەریتانەیاندا، تا ئەو خەرافیاتانە بووبوو بە عەقیدەیەکی تەواو لەناو دڵمدا.. پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ: ﴿هەموو لەدایك بوویەك لەسەر فیترەتێکی پاك لەدایك دەبێت، باوکو دایکی دەیکەن بە یەهودی یان مەسیحی یان ئاگر پەرست﴾

ئەگەر بەو عەقیدەیەوە بمردمایە دەبووم بەکەسێکی دۆزەخیی ﴿ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ(٧٢)﴾المائدة... واتە: {ئەوەی هاوەڵ دانێت بۆ خوای گەورە ئەوە خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام دەکات، و جێگای ئاگرە و زاڵمان هیچ پشتیوانێکیان نیە}.

لەسەر ئەو عەقیدە ناتەواوە مامەوە تا ئەوکاتەی بووم بە مێرد و باوك، منداڵەکانم لەسەر ئەو عەقیدەیە پەروەردە دەکرد،.. دەمبردن بۆ مەزاری ئەو وەلیە، لەوێ قژی یەکێکیان دەتاشی وەك قوربانی و نزیك بوونەوە، وە دیاری و کەل و پەلم دەبرد، نەزرم دەکرد و شتم سەردەبڕی و ئاوم دەپرژاند لە گۆڕەکە... من کەسێکی نەزان بووم، تا خوای گەورە کاری بۆ ئاسان کردم کە بێم بۆ ئێرە ﴿مەککە﴾، سەرچاوەی وەحی و پەیامی خواریی، ئەوەی کە من خووم پێوە گرتبوو لە مەزار و نزرگەو دیاردەکانی شیرك، لەوێ نەمبینی لەگەڵ ئەوەشدا بیرم لەوە نەدەکردەوە کە بیروباوەڕە بەتاڵەکەم بگۆڕم.. من هۆگری ئەو مەزارگانە بووبووم، هەرچەندە دووریش بوون لێمەوە، سەیرتر لەوەش من نوێژە فەرزەکانم نەدەکرد.. تەنانەت ئامادەی نوێژەکانی جومعەش نەدەبووم، بە خەستی جگەرەم دەکێشا، کاری حەرامی زۆریشم دەکرد..!

ویستی خوای گەورە وابوو کە گەشتم بە یەکێ لە بانگخوازە پاکستانیەکان لەوانەی

**که لەم وڵاتەدا خوێندیان، دوای چەند وتووێژێك کە درێژەی نەکێشا، توانی دەرم بهێنێت لە گۆماوی شیرك، بەرەو مێرگی یەکتاپەرستی، ئیتر بۆن و بەرامی ئیمانی ڕاستەقینەم هەڵمژی، و ئەوەتا من ئێستا تەماشای کەسوکار و گەلەکەم دەکەم لە بەرزیەوە، هەوڵ دەدەم دەریان بهێنم لە زۆنگاوە ژەنگاویەکانی شیرك** ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ(٣١)﴾ **الحج.. واتە: ﴿، هەرکەس هاوبەش قەرار بدا بۆ خوا، وەك ئەوە وایە لە ئاسمانەوە بەربیێتە خوارەوە و پەلەوەر بێنە سەر کەلاکەکەی و گۆشتەکەی بفڕێنن و بیخۆن، یاخود وەك کەسێك وایە بایەکی توند هەڵکاو بیبا فڕێی بداتە شوێنێکی دووری وا کەس پێی نەزانێ، مەبەست لەوەیە ئەو کەسە کابرایەکی بێ سەرو شوێنە(٣١)﴾.**

## ٨٦- ﴿تەوبەی کچێك لە مێرگی قورئاندا﴾

خاوەنی چیرۆکەکە دەڵێت: من خوێندکاری دوا قۆناغی بنەڕەتیم، زۆرم حەز لە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن بوو، یەك سات بەجێم نەدەهێشت.. یەك زنجیرە یان بەرنامەی منداڵان یان گۆرانی یان تەمسیلیم فەرامۆش نەدەکرد و دەبوایە هەمویانم ببینیایە.. هەر کە بەرنامەیەکی ڕۆشنبیری یان ئاینی بکردایە خێرا تەلەفزیۆنەکەم دەکوژاندەوە، خوشکەکەم لێی دەپرسیم بۆچی وات کرد؟! منیش بەهانەم بۆ دەهێنایەوە کە ئەرکی قوتابخانە و ماڵەوەی زۆرم بەسەرەوەیە.. ئەویش پێی دەوتم: ئێستە ئەرکەکانت کەوتەوە یاد!! ئەی لەکوێ بویت لەکاتی تەماشاکردنی زنجیرەکان و گۆرانی و بەرنامە بێ بایەخەکاندا؟! منیش وەڵامم نەدایەوە... ئەو خوشکەم بە تەواوەتی پێچەوانەی من بوو، لەو کاتەوەی دایکم فێری نوێژکردنی کرد بوو، دەستبەرداری نەدەبوو مەگەر عوزرێکی هەبوایە، بەڵام من، پارێزگاری نوێژەکانم نەدەکرد، بەڵکو لە هەفتەیەکدا جارێك یان دووجار نوێژم دەکرد.. خوشکەکەم بەپێی توانا دووردەکەوتەوە لەتەلەفزیۆن، چەند هاوڕێیەکی صاڵحی لەدەوری خۆی کۆکردبوویەوە یارمەتی دەدان لەسەر کاری خێر و چاکە، چاکە و باشیەکەی گەشتبووە ئەندازەیەك کە پورم کاتێ منداڵەکەی لەبار چووە، وە لە نەخۆشخانە بوو، لە هۆش خۆی چووبوو، خوشکەکەمی بینیبوو کە پۆشاکی سپی لەبەردابوو دڵنیای دەکردەوە، پوریشم هاتەوە هۆش خۆی و ئاسودە و دڵ ئارام بوو ئەو هەمیشە خوای دەهێنایەوە یادم و ئامۆژگاری دەکردم، منیش زیاتر سەرسەختی و ملەجەڕێم دەکرد، بەڵکو دانیشتنەکانم لەبەردەم تەلەفزیۆندا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتری دەکرد.. تەلەفزیۆنیش هونەر بەکاردەهێنێ لە نمایشی زنجیرە بێ بەهاکان و فیلمە کەم بایەخەکان و گۆرانیە خراپەکاندا، کە من دەرکم بە مەترسیەکانی نەدەکرد، تەنها دوای ئەوە نەبێت کە خوای گەورە ڕێنمایی کردم، سوپاس و ستایش بۆ خوای تاك و تەنها.. من هەمیشە کە ئەو هەموو کارانەم دەکرد، زۆریش لەوە دڵنیا بووم کە ئەوانە کارانێکی حەرامن، و ڕێگای هیدایەت ئاشکرایە بۆ کەسێك کە بیەوێت بیگرێتەبەر، ویژدانم زۆرجار سەرزەنشتی دەکردم و ئازاری دەدام بە توندی، بەتایبەتی کاتێك کارەکە هەر بەوەوە نەوەستابوو کە ئەنجامدانی گوناهە، بەڵکو سەری کێشا بوو بۆ

وازهێنان له فەرزەكان. لەبەرئەوە من هەمیشە لەوە دووردەكەوتمەوە كە بەتەنها دابنیشم. تەنانەت كاتێكیش دەچووم بۆ ئەوەی بنوم و بحەوێمەوە، هەوڵم دەدا خۆم سەرقاڵكەم بە كتێبێك یان گۆڤارێكەوە. تا بواریٚ نەهێڵمەوە بۆ لۆمەكردنی دەروون یان ئازاری ویژدان.

بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەو شێوەیە مامەوە هەتا لەو ڕۆژەی كە خوای گەورە دەستنیشانی كردبوو بۆ ڕێنمایی كردنم.

ئێمە لەپشوی نیوەی ساڵدا بووین، خوشكەكەم ویستی پەیوەندی بكات بە ئەڵقەیەكی لەبەركردنی قورئانی پیرۆزەوە لەیەكێ لە سەنتەرە ئیسلامیەكاندا، پێشنیاری بۆ كردم كە منیش بچم لەگەڵیدا، دایكم ڕازی بوو، بەڵام من ڕەفزم كرد.. بەڵكو بەتوندی ڕەفزم كرد، دنیام هێنایە خوارەوە بەوپەڕی بینم هاوارم كرد: نامەوێ برۆم... وە من لەناخی خۆمدا سووربووم لەسەر ئەوەی كە دانیشم بەدیار تەلەفزیۆنەوە، كە بەڕاستی بوو بوو بە بەشێك لەمن و جیانەدەبوویەوە لەو ژیانە بێ هودەی من.. من چ كارێكم هەیە بە ئەڵقەكانی لەبەركردنی قورئانەوە.. خۆشەویستی قورئان و خۆشەویستی ئاواز و گۆرانی... لەدڵی یەك مرۆڤدا كۆنابنەوە.. باوكم هاتەوە و منیش شكاتی حاڵی خۆمم بۆكرد، ئەویش ووتی: وازی لێ بێنن زۆری لێ مەكەن بۆ ڕۆشتن و وازبێنن چی پێ خۆشە باوا بكات... من لای باوكم جێگایەكی تایبەتم هەبوو، وە من كچی ناوەنجیان بووم، من تەنها ئەو خوشكە گەورەم هەبوو، لەگەڵ برایەكمدا كە زۆر لەمن منداڵتر بوو.. باوكم وای وت و وای گومان دەبرد كە من پارێزگاری نوێژەكانم دەكەم، و نەیدەزانی كە كارەكە زۆر جیاوازە، ڕاستە من درۆم نەدەكرد لەگەڵیدا كاتێك كە لێی دەپرسیم: ﴿ئایا نوێژت كرد؟﴾ منیش دەموت: بەڵێ، خوشكەكەم توانیبووی كە ڕزگارم بكات لە دەردی درۆكردن، بەڵام من هەڵدەستامەوە و لە بەردەمیدا نوێژم دەكرد كاتێ كە ئەو دیار بوایە، كاتێكیش دەچوو بۆ سەر كارەكەی، وازم لە نوێژكردن دەهێنا، باوكم لەسەر كارەكەی بۆماوەی سێ بۆ چوار ڕۆژ دەمایەوە... ڕۆژێكیان، باوكم بە نەرمیەوە داوای لێ كردم كە لەگەڵ خوشكەكەمدا با بۆ یەك جاریش بێت.. ئەگەر سەرسام بووم بە كارەكە ئەوا منیش بەردەوام بم لەسەری، و ئەگەر نا با ئەوە یەكەمین و دواهەمین جار بێت.. منیش ڕازی بووم، چونكە باوكمم خۆش دەویست و

هیچ داواکاریەکەم ڕەت نەدەکردەوە..

کەوتمە ڕێ بەرەو مێرگی قورئان.. لەوێ کۆمەڵێ گەوهەری گرانبەهام بینی کە ڕووناك بووبوونەوە بە ڕووناکی ئیمان، و چاوانێك کە دەگریان و موعتاد نەبوو بوون بەتەماشاکردنی شتی حەرام، وەك کارەکانی من، هەستێکی سەیر دایگرتم کە ناتوانم وەسفی بکەم.. هەستکردن بە بەختەوەری و بەترس کە هەست کردن بە پەشیمانی و تەوبە تێکەڵی بوو بوو، هەستم دەکرد کە من نزیکم لەخوای گەورەوە، بۆیە دڵم ناسك بوو، فرمێسکەکانم داباری بۆ پەشیمانی ئەو کاتانەی کە فەوتنادبووم لە کارانێکدا کە ڕەزامەندی، خوای گەورەی تێدا نەبوو لە بەردەم شاشەی تەلەفزیۆندا.. یان لە نیشتەنیە بێ بایەخەکاندا لەگەڵ هاوڕێ خراپەکانمدا کە ئەوانەی کە هیچ خەمێکیان نەبوو بێجگە لە قسە و قسەلۆك و ووتی ووتی.. من چەندە بێئاگابووم لەوجۆرە کۆڕ و کۆبونەوانە کە بەڕاستی فریشتەکانی خوای گەورە دەوری داوون،و سەکینە و ڕەحمەت و ئیمان و دڵئارامی دادەبەزێتە سەریان. خوای گەورە منەتی ژیانی پێ بەخشیم لە ژێر سێبەری قورئاندا، بۆ ماوەیەك، کە بەڕاستی چێژی ئەو نیعمەتەیم کرد لەهەموو ژیانمدا چێژی وام نەکردبوو.. لەژێر سێبەری قورئاندا ژیام بەدڵ ئارامیەوە و بەویژدانێکی دامەزراوەوە، بەتەواوی گەشتمە ئەو قەناعەتەی کە هیچ چاکسازیەك بۆ ئەم زەمینە نیە، و هیچ حەوانەوەیەك بۆ مرۆڤایەتی نیە و هیچ دڵئارامیەك بۆ ئەم مرۆڤە نیە..و هیچ بەرزی و بەرەکەت و پاکیەتیەك نیە بێجگە لە گەڕانەوە نەبێت بۆ لای خوای گەورە.

# ٨٧- ﴿چیرۆکی بەندیەك لە بەندیخانەدا﴾

لە جیهانی بەندیخانەکاندا... فرمێسك و ناڵە و ئازار هەیە.. لە نێو کەسی پەشیمان و خەفەتبار و کەسی زیان مەنددا. لەیەکێ لەبەندیخانەکاندا لە بەندیخانەی ﴿الحائر﴾ لە شاری ﴿ریاض﴾ پایتەختی سعودیە، دیمەنەکانی ئەم چیرۆکەتان بۆ دەگوازمەوە، پاڵەوانی چیرۆکەکەمان ڕۆژەکانی لەبەندیخانەدا بەسەربردووە. و سەیر لەوەدایە، کە ئەم بەندیخانەیە کە ناوی ﴿الحائر﴾ە مانای ڕاستگۆیانەی هەیە، کە پێکهاتووە لە چەندین مرۆڤ کە هێشتا سەرگەردانن لەڕێگای ژیاندا، لایان داوە لە ڕێگای ڕاست، مەگەر کەسێ خوای گەورە ڕێنمایی کرد بێت، ئای دەبێ لە بەندیخانەی ﴿الحائر﴾دا چەند سەرگەردانی تێدابێت. ئەو لاوێك بوو لە لاوانی ئێمە.. بە پێنوسی دەستی و بەفرمێسکەکانی چاوی ژیانی ئازاراوی خۆیی بۆ نوسیمەوە.. و داوای لە منیش کرد کە بچمەوە بە نوسینەکەیدا، منیش هەر ئەوەندەم توانی داواکاریەکەی جێبەجێ بکەم، و چیرۆکەکەیتان پشت بەخوا بۆ بگێڕمەوە، بەو ئومێدەی هەر کەس بیخوێنێتەوە سودی لێ ببینێت.. فەرموون ئێوە و چیرۆکی ئەو لاوە، دەڵێت: هەر لەسەرەتای ژیانمەوە لەناو خێزانێکدا گەورە بووم کەپڕ بوو لە پاکێتی و فەزیلەت. ڕۆژە جوانەکانی منداڵیم لەبیر ناچێتەوە، ئەو ڕۆژەی کە خرامە قوتابخانەوە.. بە پلەی نایاب نەبوایە ڕازی نەدەبووم.. هەر بەوشێوەیەش بوو هەمیشە نایاب بووم لە وانەکاندا، تا گەشتمە قۆناغی دوا بنەڕەتی، بەتەواوی ڕەوتی ژیانم گۆڕا.. لە پۆلی حەوتەمدا ئاشنا بووم بە کۆمەڵێ لاوی سەرەڕۆ، من دەمزانی کە باوکم ڕازی نیە من هاوڕێیەتی ئەوانە بکەم.. یەکەمین هەنگاوی شەیتانانەم تا ئەویش بە ئاشنابوون لەگەڵ ئەو هاوڕێیانە بەبێ ڕەزامەندی باوکم. زۆر بەداخەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەنگاوە شەیتانیەکانم درێژەیان دەکێشا، زۆری نەبرد هەنگاوە درێژەکانم منیان برد بەرەو خاکی سەر نزمی و ڕەزیلەت.. بە شێوەیەك کەوتمە گەشتێکەوە لەگەڵ ئەو هاوڕێ خراپەکارانەمدا بۆ یەکێ لەو وڵاتانە.. من لەو کاتەدا پارەی زۆر کەمم پێ بوو.. لەگەڵ خەرجی سەفەرەکەدا و خەرجکردنی پارە بۆ کارە نابەجێکان، دەبوایە سەرچاوەیەکی داراییم هەبوایە، کە پارەی زیاترم لێیەوە دەست بکەوێت، هەنگاوی شەیتانیانەم، لە گەڵ هاوڕێکانمدا ئەوەبوو کە پێکەوە ڕێکەوتین دزی بکەین بە تەماحی ئەوەی کە

پارەمان دەست بکەوێت.. دوای چەند ڕۆژێك لە فێربوونی دزی، و مومارەسەکردنی ڕاو و ڕووت، من بووم بە شارەزاترینیان لە کۆکردنەوەی پارە و ساماندا، بۆیە بووم بە بەرپرسی ئەوانی تر.. چۆنم بویستایە، بەو شێوەیە هەڵم دەسوڕاندن.. لەگەڵ زۆربوونی پارە و ساماندا پێشوازیم لە ژیانێکی وەهمی نوێ کرد، لە نێو ڕاقیترینی شوقەکاندا ژیانم بەسەر دەبرد، و بەناوبانگترین خواردنم دەخوارد... من وام گومان دەبرد کە پارەو سامان ڕێگەی منە بەرەو بەختەوەری... مرۆڤ دەتوانێ هەموو شتێکی بە پارە دەست بکەوێت.. ڕۆژگار تێپەڕی و منیش عەودالی بەختەوەری بووم.. بەلام بێ سود بوو، من وەك ئەو کەسەم لێ هاتبوو کە لەئاوی دەریای دەخواردەوە، و بەو خواردنەوەیەش زیاتر تینوی دەبوو.. لەگەڵ خەرجی ڕۆژانەم کە نزیکەی ٥٠٠٠ ریال بوو، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، هەستم بە بەختەوەری نەدەکرد، تەنها ساتانێکی کەم نەبێت.. پاشان ڕۆژەکانم گۆڕان بۆ خەم و ماتەمی.

نقوم بووبووم لە دەریای شەهوەتدا.. کەوتبوومە کوچە تاریکەکانەوە، بێزاری لە ژیاندا،و تاریکی لە دڵدا..و سینەتەنگی.. هەموو ئەوانەش بەهۆی پشتکردنمەوە بوو لە زیکر و یادی پەروەردگار.. ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾طه/١٢٤. واتە: ﴿هەرکەسێکیش پشت لە یادکردنەوەی من هەڵکا ژیانێکی تەنگ و ناخۆش ئەژی لە دنیادا چونکەهەموو قورساییی کارو بیری خۆی خستۆتە سەر کۆکردنەوەیمالی دنیاو هیچ ڕاحەتییەکی دڵی نابێ و لە ڕۆژی قیامەتیشا بە کوێری حەشری ئەکەین﴾

بەردەوام مومارەسەی تاوانی دزیم دەکرد، تا ویستی خوای گەورە وابوو، کە دەستگیر بکرێم بەهۆی تۆمەتی دزیەوە لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێ خراپەکانم، چەند ساتێکی کەمی خایاند و کرامە ناو چوار دیواری بەندیخانەوە. لە تاریکایی بەندیخانەدا، لە بێئاگاییەکەم خەبەرم بوویەوە، وەك ئەوەی سیمای باوکی ئازیزم لەبەردەممدا بێت و ئامۆژگاری دەکردم، وەك ئەوەی یەکەم جارم بێت کە گوێم لێیەوە بێت، هەستم کرد وەك ئەوەی بانگی ڕەحمەتی بەزەیی بێت بۆ ناخی دڵم و بانگی من دەکات: ئایا شەرم لە خوا ناکەیت؟ ئایا تەوبە ناکەیت و ناگەڕێیتەوە بۆ لای خوا؟ بەڵێ... دەمەوێ تەوبە بکەم.. بەلام کارەکە هەروا ئاسان نەبوو. بوو بە ململانێیەکی سەخت لە نێوان

دەروونی سەرکەشمدا کە هۆگری شەیتان بوو بوو، لەگەڵ بانگی ئیمان لەدڵمدا.. لە کاتێکدا من لە نێو شەپۆلەکانی ململانێکەدا بووم، بارێکی گران هاتەسەرشانم، ڕۆژێکیان پەیوەندیم بە کەس و کارمەوە کرد تا دڵنیابم لێیان، کەچی هەواڵی دڵتەزێنیان پێ دام: خۆتان خۆش بن. کێ وەفاتی کردووە؟ باوکی ئازیز و خۆشەویستم... زۆر بەکوڵ گریام، زۆر زۆر غەمبار بووم بۆ ئەو باوکە میهرەبانەم کە بەردەوام هەر دەگریا بەهۆی سەرەڕۆیی و تاوانەکانی منەوە.. ئەو ڕووداوە ئازاراوییە سەرەتایەکی ڕاستەقینەبوو بۆ هەستانەوەم و گەڕانەوەم بۆلای خوای گەورە.. بەتەواوی وازم لە گوناه و سەرپێچیکردن هێنا.. دەستم کرد بە نوێژکردن و قورئان خوێندن.. لە کۆتاییدا.. دوای چەند ساڵێك لە ئازار و مەینەتی.. بەختەوەریم بینیەوە.. ئایا دەزانن لە کوێدا... بینیمەوە کە خۆی لەم دێڕە شیعرەدا حەشارداوە:

من بەختیاری لەکۆکردنەوەی ماڵ و ساماندا نابینمەوە

بەڵکو کەسی لەخواترس و پارێزگار بەختیارە

من ئێستا لە نێو دیواری بەندیخانەدا لەگەڵ ئێوەدا دەدوێم، بەڵام سوپاس بۆ خوا هەست بە حەوانەوەی دەروونی دەکەم، کە لەژیانمدا هەستم پێ نەکردووە.. لە مزگەوتی بەندیخانەدا بۆماوەی سێ مانگ ﴿ئیعتیکافم﴾کرد، لەو ماوەیەدا پێنج جوزء قورئانم لەبەرکرد، لەبەرکردنی قورئان ئاسان بوو بەلامەوە، بەهۆی وازهێنانم لە گوناهەکان... پاشان خوای گەورە ئەوەی پێ بەخشیم کە ببم بە ئیمامی نوێژ خوێنان لە مزگەوتی بەندیخانەدا.. بڕوام پێ بکەن.. ئێستا بەهیچ شێوەیە بیر لەوە ناکەمەوە کە ماوەی بەندیەکەم تەواو بێت و لەبەندیخانە بێمە دەرەوە... بۆچی بیر بکەمەوە؟ لەکاتێکدا کەمن پێش ئەوەی بێمە بەندیخانەوە بەند بوو بووم لە پەروەردگارم و کۆتی دیلی هەوا و ئارەزووم بووبووم.. بەند بووبووم لەنێو چوار دیواری شەهواتەکانمدا... بەڵام ئێستا، ئیمان و باوەڕ منیان ئازاد کرد و ئازادیم بۆ گەڕایەوە.. بڕوام پێ بکەن.. من ئێستا ئازاد و سەربەستم، لەنێو چوار دیواری بەندیخانەدا.. من ڕەزامەندم لەپەروەردگارم، و داواکارم لەپەروەردگاریشم کە ڕەزامەندبێت لەمن. و لەو گوناهانەم خۆش ببێت کە لەڕابردوودا کردومن.. و دامەزراوم بکات لەسەر ئاینەکەی هەتا ساتی بەدیدار گەیشتنی..

والحمد لله الذي هدانا لهذا وما كنا لنهتدي لولا ان هدانا الله.

## ٨٨- ﴿كاتێ کەنیسە پڕ بوو لەگریان﴾

ئەم ڕووداوانە د. وەلید فوتەیحی نوسیویەتی، کەبەدوای ڕووداوی تەقینەوەکاندا هات لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، با پێکەوە لەگەڵ ئەو ساتە خشوعانەدا بین لەژێر سایەی نوری ئیسلامدا کە بانگەشە دەکات بۆ لێبووردەیی و ئاشتی لەنێوان ئاینە ئاسمانیەکاندا.

کاتێ ئەمریکیەکە پرسیاری کرد: ئیسلام چیە؟

ئەم وتانەم نووسی لە بەرەبەیانی شەممە ڕێکەوتی ٢٢ سێبتەمبەری ساڵی ٢٠٠١ واتە دوای ١١ ڕۆژ لە ڕووداوەکە. بۆ سەر واشنتۆن و نیویۆرك لە ١١ی سێبتەمبەردا.

حەزمکرد بەو هەستەشم بەشداری نوسینەکەم بکەم کە لەو یانزە ڕۆژەدا تیایدا دەژیام... ڕۆژ لەدوای ڕۆژ.

بەیانی ڕۆژی سێشەممە، ١١ی سێبتەمبەر، خەبەرم بوویەوە کە پێش نوێژی بەیانی خەوێکم بینی، شاخێکی وشکەڵانم بینی بە دەورمدا دەلەریەوە، وەك ئەوەی زەمین لەرزەیەکی بەهێز بێت، منیش لەخەوەکەمدا ئەم ئایەتەم دەوتەوە ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾الأنعام/٩١. واتە: ﴿وەکو پێویست قەدری خوایان نەگرت و ڕێزیان بۆ دانەنا﴾.

ڕۆشتم بۆ عیادەکەم، لەیەکەم نەخۆشەوە بیستم کە یەکەم فڕۆکە خۆی کێشاوە بە سەنتەری بازرگانی جیهانیدا، وە لە نەخۆشی دووەمیش باسی فڕۆکەی دووەمی بۆ کردم.. میدیاکانیش هەر لەیەکەم ڕۆژەوە ئاماژەیان بەوە دەکرد کە موسڵمانان و عەرەب لەپشت ئەو ڕووداوەوەن، و لە سەعات دوانزەی تەواودا ئەمیندارانی سەنتەری ئیسلامی لە ﴿بۆستن﴾ کۆبوونەوەیەکی بەپەلەیان ئەنجامدا، و منیش لە عیادەکەمەوە بەتەلەفۆن لەگەڵیاندا بووم...

بڕیارماندا هەستین بە هەڵمەتی خوێن بەخشین، لیژنەیەکمان پێکهێنا بۆ پەیوەندیکردن بە خاچی سوری ئەمریکیەوە..و گرتنەبەری ڕێ وشوێن لەگەڵیاندا، میدیاکانیشمان بانگکرد بۆ ڕووماڵکردنی ڕووداوەکە، پەیوەندیمان بە دەسەڵاتدارانی شارەکە و ویلایەتەکەوە کرد، ئەوانیش پەلەیانکرد لە ئامادەباشکردنی پیاوانی ئاسایش بۆ پارێزگاری سەنتەرە ئیسلامیەکە و کەلوپەلەکانی و هاموشۆکەرانی.

بۆ هەمووومان ڕۆژێکی سەخت بوو، هەمووومان بە تاسەوە بووین بۆ هەر زانیاریەك بێت

که ئەو تاوانە نەخوازراوە دووربخاتەوە لە موسڵمانان.
وە لە ڕۆژی چوارشەممە بەرواری ١٢ی سێبتەمبەر، ڕۆژنامەکان و میدیاکان دابارینە سەرمان، لە هەموو ڕوویەکەوە پرسیار بارانیان کردبووین. منیش بانگهێشت کرام بۆ دوو کەناڵی تەلەفزیۆنی و چەند ڕۆژنامەیەکی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی وەك WALL STREET JORNAL و BOSTON GLOBE، وە ئێمە دەمانەوێ وەك مرۆڤ، مرۆڤ بوونی خۆمان جێگیر بکەین.. وە ئێمە بێبەرین لەو ڕووداوە کە ڕوویداوە!!
بەڵێ براو خوشکەکانم.. هەموومان هەوڵدەدەین مرۆڤ بوونی خۆمان بچەسپێنین لەیەك ڕۆژدا، خۆمان بینیەوە کە لەسەر، دڵەکانم شیوەن دەکات و زمانی حاڵمان دەڵێت، بەڕاستی بانگەواز بۆ خوا پەنجا ساڵ پاشەکشەی کردووە لەئەمریکاو هەموو جیهان.
وە لە ڕۆژی پێنجشەممە بەرواری ١٣ی سێبتەمبەر، لە گۆڕەپانی ڕووبەڕوو ﴿المقابلە﴾ لە بنکەی عومدەی شاری بۆستن (CITY HALL) دە هەزار کەس کۆبوویەوە، و سەرکردەی ئاینەکان و هەروەها موسڵمانەکانیش باسی هەڵوێستی ئیسلامیان کرد سەبارەت بەو تاوانە و ملیۆنەها کەسیش ئەوەی بینی و هەروەها گوێیان لە قورئانی پیرۆزیش گرت. وە نموونەی ئەو کارە لە هەموو ویلایەتەکانی ئەمریکادا ڕوویدا.
لەڕۆژی هەینی جارێکی تر بانگکراینەوە بۆ بەشداریکردن لە چەندین بەرنامەی تەلەفزیۆنیدا.. و بەشداریمکرد لە یەکێ لەو بەرنامانەدا، و هەروەها نوێژی هەینی لە سەنتەری ئیسلامی کۆمەڵەی ئیسلامی لە بۆستن ﴿لە چادرگەیەکی تایبەت بەوە﴾ سەرۆکی کەنیسەکانی ئەو دەوروبەرە و عومدەی شاری (کاجردج) بەشداریان کرد و هاودەنگ بوون لەگەڵ موسڵمانان و ڕۆشتن هەتا بنکەی عومدەی شاری (کاجردج).. و شیکردنەوەو باسکردنی ئیسلام بۆ ئامادەبوان و ڕومالێکی بەرفراوانی ئەو ڕووداوە لە لایەن میدیاکانەوە.. لەڕۆژی شەممە بەرواری ١٥ی سێبتەمبەر، لەگەڵ هاوسەرەکەم و منداڵەکانمدا ئەحمەد و مەریەم و یوسف، ڕۆشتین بۆ گەورەترین کەنیسە لەشاری بۆستن (COPLEY SQUARE)، ئەویش بۆ وەڵامدانەوەی بانگهێشتی فەرمی لەلایەن کۆمەڵەی ئیسلامی لە ﴿بۆستن﴾، بۆ نوێنەرایەتی کردنی ئیسلام لە بانگهێشتێکی تایبەت بە کەسایەتیەکانی شاری بۆستندا.. لەوێ عومدەی شارەکەو

هاوسەرەکەی و لێپرسراوی زانکۆکان ئامادەبوون، و ژمارەی ئامادەبوان زیاد لە هەزار کەس دەبوو، لەژێر ڕووماڵێکی بەرفراوانی میدیاکانی تەلەفزیۆنە سەرەکیەکان لە بۆستن.

وەك پێشوازیکردنی باڵوێزانە، پێشوازیان لێ کردین، و من و هاوسەرەکەم و منداڵەکانم لە ڕیزی یەکەمدا دانیشتین بە تەنیشت هاوسەری عومدەی شاری بۆستن.. وە گەورەی قەشەکان لە وتارەکەیدا بەرگری لە ئیسلام کرد وەك ئاینێکی ئاسمانی.. و ئامادەبوانی ئاشنا کرد بە ئامادەبوونی من وەك نوێنەری کۆمەڵەی ئیسلامی لەشاری بۆستن... وە دوای تەواو بوونی ووتارەکەی گەورەی قەشەکان لە تەنیشتمدا وەستا و منیش بەیاننامەی فەرمیم خوێندەوە کە گەورە زانایانی موسڵمانان دەریانکردبوو، کە ئیدانەی ئەو کارە خراپەی دەکردو، هەڵوێستی ئیسلامی باس دەکرد و باسی لە بنەماکانی ئیسلام و تەعالیمە بەرزەکانی دەکرد.. پاشان چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزم بە وەرگێردراوی بە زمانی ئینگلیزی خوێندەوەو پاشان بە تەرتیلیش خوێندمەوە.. خوای گەورە دەفەرموێ ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا(٣٢)﴾المائدة..واتە: { ئەوەی کەسێك بە ناهەق بکوژێت و لە جیاتی کوژراوێك نەبێت، یان گوناه و تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت لە زەویدا(وەکو جەردەیی و دەستدرێژی...و هتد) ئەوە وەك ئەوە وایە هەر هەموو خەڵکی کوشتبێت، ئەوەشی کەسێك لە مەرگ رزگار بکات هەر وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی لە مەرگ رزگار کردبێت و ژیانی پێ بەخشیبێ} ..و ئایەتی ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ(١٣)﴾الحجرات..واتە: { ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە(کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە، بە ڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسەتانە کە زۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانان و ئاگایە بە هەموان} و ئایەتی ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ(٨)﴾المائدة..واتە: { ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، زۆر بە چاکی

هەستن بە ئەنجامدانی شایەتی دادپەروەرانە لەبەر خوا، رق و دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەك هەڵتان نەنێت کە لە دادپەروەری لابدەن، دادپەروەربن، ئەوە نزیکترە لە تەقواو و خواناسیەوە، دەی کەواتە لەخواترس و پارێزکار بن. چونکە بە راستی خوا ئاگادارە بەو کار و کردەوەیەی کە دەیکەن﴿.. وە ئەو ساتانەم هەرگیز لەیاد ناچێت، کە کەنیسەکە دەنگی گریانی لێ بەرز دەبوویەوە، لە کاتی بیستنی ئایەتەکانی خوای گەورە کە دەخوێنرایەوە... وە بەڕاستی هەستە زیندووەکان بەرز بوونەوە و یەکێك ووتی ﴿بە ڕاستی من لە زمانی عەرەبی تێناگەم، بەڵام ئەوەی ئەو ووتی بە بێ شك و گومان ووتەی خوای گەورەیە﴾.

یەکێکی تر کاغەزێکی لە دەستمدا دانا، کە بە گریانەوە کەنیسەکەی جێهێشت، تیایدا نوسرابوو ﴿توخوا لە ڕابردوومان و ئێستامان خۆش بن و دوعامان بۆ بکەن﴾.

یەکێکی تر لە بەردەرگای کەنیسەکەدا وەستا بوو کە بە دوو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە تەماشای منی دەکرد و ووتی: ﴿ئێوە وەك ئێمە وان... بەڵکو ئێوە لە ئێمە باشترن﴾ و زۆرێکیان داوای ناونیشانی کۆمەڵە ئیسلامیەکەیان لێکردم لە بۆستن تا سەردانی بکەن و گوێ لە موحازەرە هەفتەییەکان بگرن و گوێ لە قورئانی پیرۆز بگرن کە لەکاتی نوێژدا دەخوێنرێت. و لە ساتانێکی کەمدا هەستم بە حیکمەتی خوای گەورە کرد، کە بەشێوەیە کاردەکا کە عەقڵی سادەی ئێمە دەرکی پێ نەکردووە و پێیشی ناکات، وە گەورەترین کەناڵی تەلەفزیۆنی هەستا بەڕوومالْ کردنی ڕووداوەکە و پاش ئەوەش دیدارێك لەگەڵ مندا.

لە ڕۆژی بەرواری ١٦ی سێبتەمبەر کۆمەڵەی ئیسلامی لە بۆستن هەستا بە بانگهێشت نامەیەکی کراوە لە بنکەی ئێستای سەنتەرەکە لە (کاجردج)، کە لەنێوان زانکۆی هارمارد و MIT یە، ئێمە پێشبینی زیاد لەسەد کەسمان نەدەکرد.

موفاجەئات بوو بۆ ئێمە کە زیاتر لە هەزار کەس ئامادەبوون لەخەڵکی دەوروبەر و مامۆستایانی زانکۆ و پیاوانی ئاینی.. بەڵکو گەورەی قەشەکان لە کەنیسەکانی دەوروبەر ئامادەبوون، کە بانگمان کردبوون تا وتەیان هەبێت سەبارەت بە ئیسلام، هەموان هاوخەمی و پشتگیری خۆیان بۆ ئیسلام دەربڕی.

وە پرسیاری زۆر داباری بەسەرماندا، سەبارەت بە ئاشنا بوون بە ئیسلام و

تەعالیمەکانی، و لەنێو هەموو ئەو پرسیارانەدا پرسیارێکی هێرشکەرانەی تێدا نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە.. چاوەکانمان دەبینی کاتێ کە باسی ئیسلامەتی پاك و بێگەرد دەبیستن فرمێسك دەرێژن.. و زۆرێکیان لەوانە بوون کە پێشتر باسی ئیسلامەتیان نەبیستبوو.

بەڵێ.. باسی ئیسلامیان نەبیستبوو، تەنها لە میدیا داخ لەدڵەکانەوە نەبێت!!

جارێکی تر بانگکرام لەهەمان ڕۆژدا بۆ ئەوەی بەشداری بکەم لە دیدارێکی کە، کە لەو کەنیسەیە سازدرابوو کە ڕۆژی پێشتر بەشدار بووم تیایدا.. ڕووداوەکان و دیمەنەکان و هەستەکان و حەزەکان چەند بارە بوونەوە بۆ سەردانی سەنتەری ئیسلامی بۆ زیاتر ئاشنابوون بە ئیسلام و گوێگرتن لە وتەکانی خوای گەورە.. وە بانگەشە تەلەفزیۆنیەکان و ڕوماڵی میدیاکان و بەشداریکردن لە هەردوو ڕۆژی دووشەممە و سێ شەممە چەندبارە بوونەوە.. زیاد لە پێنج کەناڵی تەلەفزیۆنی میوانداری کردین.. و لە ڕۆژی چوارشەممە لە لایەن عومدەی شاری تەنیشتمانەوە بانگهێشت کراین بۆ ڕاڤە کردنی هەڵوێستی ئیسلام لە بەردەم هەزارەها دانیشتوانی ئەو شارە.. و قورئان خوێندرا بەسەر هەزاران کەسدا و میدیاکانیش ڕوماڵیان کرد.. وە لەڕۆژی پێنج شەممە تیمێك لە بۆستنەوە کە ٣٠٠ خوێندکاری کوڕ و کچ بوون، لەگەڵ مامۆستایانی زانکۆی هارمارد سەردانی سەنتەری کۆمەڵەی ئیسلامیان کرد لە بۆستن، بە هاوڕێیەتی باڵوێزی وڵاتە یەککگرتووەکان لە ﴿ڤیەننا﴾، هەموویان دانیشتن لەسەر زەویی گۆرەپانی مزگەوتەکە، جێگاکە پڕبوو لە خەڵك، ئێمەش باسی تەعالیمە جوانەکانی ئیسلاممان کرد و ئەو گومانانەی کە هەبوون ڕەواندمانەوە.

جارێکی تریش ئایەتەکانی خوای گەورەم بۆ خوێندنەوە و چاوەکان ئەسرینیان ڕشت و ئامادەبوانیش کاریگەر بوون پێی.. زۆربەیان داوایان کرد کە ئامادەبن بۆ بەشداریکردن و گوێگرتن لەوانە هەفتەییەکان کە سەنتەری ئیسلامی بۆ ناموسڵمانەکان سازیدەدا.. لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا بانگهێشت کرام بۆ بەشداری لە بەرنامەیەکدا لە سەر ئاستی هەموو ئەمریکا لەگەڵ پرۆفیسۆر ALAN DERSHOWITZ لە زانکۆی هارمارد بۆ موناقەشەی مافە مەدەنی و ئینسانیەکان لە یاساکانی ئەمریکی و نێودەوڵەتیدا.. لە بەرنامەکەدا برایان و خوشکانی موسڵمان

له ئەمریکا بەشداریان کرد. له ڕۆژی هەینی بەرواری ٢١ی سێبتەمبەر، موسڵمانان بەشداریان کرد له کۆبوونەوەیەکی داخراودا لەگەڵ حاکمی ویلایەتی ﴿ماسچوستس﴾.. موناقەشەکە گەشت بەو ئەنجامەی کە ماددەی فێرکردنی ئیسلام بخرێتە پرۆگرامی خوێندنەوە بۆ هۆشیارکردنەوەی میللەت و دژ وەستان بە ڕەگەزپەرستی دژ بە موسڵمانان، کە سەری هەڵدا بوو له ئەنجامی نەشارەزایی میللەتی ئەمریکیەوە سەبارەت بە ئاینی ئیسلام.. و دانی پیادا نراو پشتگیری کرا لەلایەن ژنە حاکمی ویلایەتەکەوە، و دەست کرا بە دیراسەی چۆنیەتی هاتنەدی ئەو ئامانجە و سەبارەت بە نوێژی هەینی لەسەنتەری کۆمەڵەی ئیسلامی له بۆستن.. بە تەواوەتی ڕوومالکرا لەلایەن کەناڵی (CNN)ەوە، وە هەروەها وانە هەفتەییەکانیش کە بەشەودا بوو.. ئەمەی بۆتان باس دەکەم تەنها نموونەیەك بوو لەوەی کە ڕوویداوە و ڕوودەدات له شاری بۆستن لەم ڕۆژانەدا، وە نموونەی ئەمەش له زۆربەی شارەکانی تری ئەمریکادا ڕوودەدات. بە ڕاستی بانگەواز بۆ لای خوا هەرەسی نەهێنا و پەنجا ساڵ پاشەکشەی نەکرد وەك ئێمە له ڕۆژانی یەکەی تاوانی ١١ی سێبتەمبەر پێمان وابوو.. بەڕاستی ١١ ڕۆژمان بینی کە بە ڕادەی ١١ ساڵ له مێژووی بانگەوازدا کاریگەری هەبوو. ئەوەتا من ئێستە ئەم وشانە بۆ ئێوە دەنوسم و متمانەی تەواوم هەیە کە ئیسلام پشت بەخوا بەئەمریکا و هەموو جیهاندا لەماوەی ساڵانی ئایندەدا بەخێرایی بڵاو دەبێتەوە و زیاتر له پێشوو.. ئەوەتا بەشێوەیەکە هەموو جیهان دەپرسن ﴿ئیسلام چیە؟﴾ ئەوەی بەچاوەکانی دەیبینێت وەك ئەو کەسە نیە کە دەیخوێنێتەوە و گوێی لێیە.. وە سوپاسی بێ پایان بۆ خوای جیهانیان..

## ٨٩- ﴿ڕەنگی بوو بە ڕەش﴾

لە یەکێ لە نەخۆشخانەکاندا، نەخۆشێك هاتە تەنیشتمەوە لەو ژوورەدا کە منی لێ بووم.

دەڵێ: ئەو نەخۆشە ڕەنگی زەرد بوو، بۆ ڕۆژی دوایی ڕەنگی بوو بە گەنمی، و بۆ ڕۆژی سێیەم ڕەنگی وەك ئیمەی لێهاتەوە.

دەڵێ: ووتم: لەوانەیە بەرەو چاك بوونەوە چووبێت. بەڵام بەداخەوە لەڕۆژی چوارەمدا ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕا..و لەڕۆژی پێنجەمدا ڕەشیەکەی زیاتر و زیاتری دەکرد.

دەڵێ: ترساین و تۆقین لەو پیاوە، من پێشتر ئەوم دەناسی، لە نوێژەکانی دوادەکەوت، و لەو کەسانە بوو کە گەشتی دەکرد بۆ هەندەران و مادەی هۆشبەری بەکاردەهێنا. لێی نزیك بوومەوە و دەستم کرد بە قورئان خوێندن بەسەریەوە. بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێوە دەهات-پەنا بەخوا- دەڵێ: کاتێ دەستم کرد بە قورئان خوێندن بەسەریەوە، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، منیش ترسام و دوورکەوتمەوە، نەخۆشێکی تر پێی ووتم: بەردەوام بە لە خوێندن.. ووتم: بەخوا نایخوێنم بەسەریدا، ووتی: بڕۆ بۆ لای فلان لە ژووری تەنیشتمان، بانگی بکە تا قورئان بخوێنێت بەسەریدا، دەڵێ: هەناسەیەکی تری زۆر قوڵی هەڵکێشا، وە هەر بەردەوام بوو لەخوێندنی قورئان بەسەریدا هەتا بۆ جاری سێیەم هەناسەیەکی قوڵی ترسانی هەڵمژی.. پاشان پزیشکیان بانگ کرد.. ئەویش هات و سەماعەکەی لەسەر سینگی داناو، پاشان ووتی: ئەو وەفاتی کردووە.

بەڵێ مرد و ژیانی جێهێشت، و ئەو ڕەفتارە خراپەشی هەبوو، چونکە خراپەکار بوو، سنورەکانی خودای ڕەچاونەدەکرد.. و هەرکەس لەسەر ئەو حاڵە بێت لە تیاچوون و خراپەکاری ئەوە هەقی خۆیەتی کە عاقیبەتی بەوشێوە خراپە بێت، بەڕاستی پەروەردگار زوڵم لەهیچ بەندەیەکی خۆی ناکات.

# ٩٠- ﴿لە ڕەمەزاندا لە پێش خورماوە بە جگەرە ڕۆژووی دەشکاند﴾

دەگێڕێتەوە و دەڵێ: گەشتی مەینەتی من لەگەڵ جگەرەکیشاندا پێش بیست ساڵ دەستی پێکردووە، کاتێ کە خوێندکار بووم لە قۆناغی دوا بنەڕەتیدا و لەڕۆژانی تاقیکردنەوەکاندا. من و هەندێ لە هاوڕێکانم لەسەربانی ماڵی خۆمان کۆدەبووینەوە، بۆ سەعیکردن، یەکێ لە قوتابیە خراپەکان تێکەڵمان بوو کە جگەرەکێش بوو، تەنانەت دەیتوانی جگەرەبکێشێ بەبێ ئەوەی لۆمەو سەرزەنشتی بکەین و هەوڵیشی دەدا کە ڕامانکێشێ بۆ ئەو کارەی خۆی، ئەگەر ئەنجامی نەبوو واز لەجگەرەکێشان بهێنین، ئێمەش تاقیمان کردەوە، لەگەڵ هاوڕێکانمدا جگەرەی یەکەمم داگیرساند، هەستمکرد کە سەرم قورسترە لە لاشەم، و شتەکانی دەورروبەرم دەسوڕێتەوە، هەستم بەسستی لاشەم دەکرد، بە هاوڕێ خراپەکەم ووت کە هەست بەچی دەکەم.. ووتی: ئەوە یەکەم جگەرەیەو سروشتیە کە وات لێ بکات. جگەرەی دووەم بکێشەو ئەو خاوبوونەوە و گێژخواردنەت نامێنێت. منیش دووەم و سێیەم و چوارەمم کێشا، بۆ یەکەمجار چووم بۆ لای دوکاندارەکە و یەك پاکەت جگەرەم کڕی، لە خراپترین جۆرەکان و زیانترینیان، چونکە هەرزانترینیان بوو. بەو شێوەیە هەر پارەیەکم دەست کەوتایە تەرخانم دەکرد بۆ کڕینی جگەرە. تا وام لێهات لە ڕۆژێکدا ٢٠ جگەرەم دەخوارد... لێتان ناشارمەوە گەر بڵێم: سەرنەکەوتنم لە وازهێنانی، هۆکارەکەی ئەوە بوو هەرکات بیرم لە وازهێنانی دەکردەوە، یان لە پێناوی تێڕوانینی کۆمەڵگەبوو بۆ جگەرە، یان لە پێناوی تەندروستیمدا، یان لەپێناوی پاشەکەوتی پارەدا.. لە ئەزموونە شکست خواردوەکانمدا بیرم لەوە نەدەکردەوە کە لە پێناوی خوای گەورەدا وازی لێ بهێنم و پشت بەو ببەستم، وەك چۆن کاتێ نیەتی وازهێنانم هێنا تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە سەرکەوتوو بووم، و دواتر بۆتان باسدەکەم.

<u>پێش هیدایەت:</u>

پێش ئەوەی خوای گەورە هیدایەتم بدات بۆ وازهاێنان لەجگەرە، بوو بووم بە دوکەڵکێشێکی مرۆیی جولاو، زۆر بە چڕی جگەرەم دەخوارد، تاوام لێهاتبوو ڕۆژی چوار پاکەتم دەکێشا، واتە ڕۆژی هەشتا جگەرە، بە شێوەیەك سکڵ لەناو دەممدا

دەگرا.. هەر لە بەیانیەوە تا کاتی خەوتن، بەڵکو هەندێ جار لەخەو هەڵدەستام تا جگەرە بکێشم و پاشان جارێکی تر دەخەوتمەوە. و ئەو ژوورەی منی تێدا دادەنیشتم لە ماڵەوە بوایە یان لە شوێنی کارەکەم یان لای هاورێکانم، ئەوە دوکەڵێکی خەست ژوورەکەی پردەکرد، کاتێ لەو شوێنە دەبووم، خاوبوونەوەی بەردەوام و تەمبەڵی و بەڵغەمی ڕەش و کۆکەی بەردەوام لێم جیانەدەبوونەوە.. چارەسەر سوودی نەبوو بۆم.. دوو لێوی ڕەش و دووچاو سوور و ڕوخسارێکی گرژ... ئەو شوێنەی کە نەمدەتوانی جگەرەی تێدا بخۆم بە هەر هۆکارێك بوایە، خێرا جێم دەهێشت. و پەلەم دەکرد لە ئەنجامدانی نوێژەکاندا تا بەپەلە بگەڕێمەوە بۆ جگەرە خواردنەکە.

وە لە ڕەمەزانیشدا هەندی جار پێش خورما بە جگەرە بەربانگم دەکردەوە. هەنگاوانێکی قورس لە ڕۆشتندا، بەڵغەمی ڕەق.. بە بڕێکی زۆر و بەتاسەوە چایی و ئاوم دەخواردەوە.. حاڵەتێکم هەبوو جێگای بەزەیی بووم، نە دۆست و نە دوژمن دڵخۆش نەبوون پێی.. هەموو ڕێگاکانی بەردەمی خۆمم داخست بۆ وازهێنان لێی، دوای ئەو چەندین هەوڵانەی کە شکستم دەهێنا تیایدا، تا ئەو ئەندازەیەی گەشتمە ئەو قەناعەتەی کە جارێکی تر هەوڵ نەیەم بۆ وازهێنان لێی.. بێزاری و بێ ئومێدی لە ناخمدا گەشتبووە ئەوپەڕی سنوور.. تا ئەو ئەندازەیەی وام گومان دەبرد و کاتێ کە ئەمرم جگەرە بەدەممەوەیە..

## ساتی هەستیار:

**خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ(٥٣)﴾الزمر/٥٣.واتە: {ئەی پێغەمبەر، پێیان بڵێ: خوا دەفەرموێت ئەی بەندەکانم.. ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن، خوا لە هەر هەموو گوناه و هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخۆشبوو لێبوردەیە، و زۆر بەسۆز و میهرەبانە}.

**وە دەفەرموێ:** ﴿مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُرْشِدًا(١٧)﴾الکهف/١٧.واتە: {ئەوەی خوا هیدایەتی بدات هەر ئەو هیدایەتدراوە و ڕێنموویی وەرگرتووە، ئەوەش خوا گومڕای بکات ئەوە هەرگیز کەسێکت دەست

ناکەوێت کە پشتیوانی بکات و ڕێنموویی بکات}.
لە یەکێ لەشەوە پیرۆزەکانی دەیەمی کۆتایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٤١٢ك من و براکەم -کە وەك من جگەرەکێش بوو- نوێژی تەراویحمان دەکرد.. لە یەکێ لە مزگەوتەکان لە گەڕەکی ناصریە لە شاری ﴿الریاض﴾ی پایتەختی سعودیە، دوای سلاوەدانەوەی دووەم. ئاساییە کە نوێژخوێنان کەمێك پشوودەدەن بۆ خواردنەوەی ئاو یان قاوە یان چایی، پێش بەردەوام بوونەوە لەسەر نوێژەکانیان، دەروونم هانیدام لە مزگەوت بچمە دەرەوە تا جگەرەیەك بکێشم، پاشان بێمەوە و بەردەوام بم لە نوێژەکانم و براکەشم هاندا بۆ ئەو کارەی کە نەفسی خراپەکارم هانیدام بۆی.. ئەویش لە بری ئەوەی وەڵامی داواکاریەکەم بداتەوە پێی ووتم: ڕات چۆنە، لە بری ئەوەی بڕۆینە دەرەوە تا جگەرە بکێشین، با داوا لەخوای گەورە بکەین کۆمەکمان بکات بۆ وازهێنان لێی، و با واز لە جگەرە بهێنین لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە..و ترس لە سەرەنجامەکەی و بەتەماحی رەحمەت و بەزەیی خوای گەورە.. وە بەردەوام دوعا بکەین و بپاڕێینەوە هەتا کۆتایی شەو، وە لەخوا بپاڕێینەوە کە ئەم شەو هیوا بڕاو و بێئومێدمان نەکات.. و ڕێزمان لێ بنێت بە هیدایەتدان.
بە ڕاستی قسەکانی کاریگەریەکی باشیان کردە سەر من و بینیم بە تەواوی گوێ دەگرم، و بۆیە بەردەوام بووین لە نوێژکردن، و دوای کۆتایی قسەکان من و براکەم ئەو جگەرەیەی کە پێمان مابوو لە گیرفانماندا دەرمانهێنا و لەبەردەم مزگەوتەکەدا هەموویانمان ورد کرد... وە بەڵێنماندا کە ئیتر لەم ساتە پیرۆزەوە توخنی جگەرە کێشان نەکەوینەوە... و هەریەکەمان ئەوی تر هان بدات و دامەزراوی بکات بۆ وازهێنان، هەرکات یەکێکمان بەرگەمان نەگرت و نەفسمان حەزی دەکرد بگەڕێتەوە باری جارانی.
سوپاس بۆ خوا ساتێکی وەرچەرخان بوو لەژیانماندا، سوپاس بۆ خوا و بە کۆمەکی خوای گەورە دوای ئەوە نەگەڕاینەوە سەری، ئێستاش من و براکەم زیاتر لە دوو ساڵە، کە یەك جگەرەشمان نەکێشاوە، و گەشاوەیی گەڕاوەتەوە بۆ ڕوخسارمان، ماڵئاواییمان کردووە لە نەخۆشیەکانی سینگ و بەڵغەم و کۆکە.. -بەنیسبەت منەوە- گەشتێك کە بیست ساڵی خایاند تەواو بوو. هاوڕێیان و کەسوکاریش دڵخۆش بوون بە هەڵوێستمان، و سوپاس بۆ ئەو خوایەی بە فەزڵی ئەو کارە چاکەکان تەواو دەبن.

# ٩١- ﴿كوژراوی ئاگر﴾

دەگێڕنەوە پیاوێك هەبوو ناسراوبوو بە دیناری عەیار، دایکێکی خواناسی دەبێت ئامۆژگاری دەکات و ئەمیش پەند وەرناگرێت، ڕۆژێکیان ڕەت دەبێ بەلای گۆڕستانێکدا و ئێسکێك هەڵدەگرێ و دەبینێ لە نێودەستیدا وورد دەبێ، ئەمیش بیر لەخۆی دەکاتەوە و دەڵێ: داد و بێداد بۆ تۆ ئەی دینار، تۆش وەك ئەمەت لێ یەت و ئێسکیشت ئەوا وورد دەبێت و جەستەشت دەبێ بەخاك، بۆیە لەئەنجامدا پەشیمان دەبێتەوە ل ەزیادەڕەویەکانی، سوور دەبێت لەسەر تەوبەکردن،و سەری بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و دەڵێت: پەروەردگار و خاوەنم، من خۆم خستە بەردەم قاپی تۆ و تۆش تەوبەکەم وەربگرە و ڕەحمم پێ بکە.. پاشان ڕۆشت بۆ لای دایکی بەدڵ شکاوی و ووتی: دایە مرۆڤی گوناهبار چی بکات ئەگەر خاوەنەکەی بیباتەوە؟ ووتی: پۆشاکی و خۆراکی زبر دەبێت..کاتێ شەو داهات بەسەریدا، دەستی کرد بەگریان و لاڵانەوە،و بەخۆیی دەوت: وەیل بۆ تۆ ئەی دینار ئایا هێزی ئاگرت هەیە؟ چۆن توشی توڕەیی خودای دەسەڵاتدار بوویت؟ بەوشێوەبوو تا بەیانی دایکیشی پێی ووت: کوڕی خۆم بەزەیت بەخۆتا بێتەوە. ووتی: وازم لێبێنە کەمێك ماندووبووم، تا ماوەیەکی زۆر بحەوێمەوە.. من سبەینێ لەبەردەم پەروەردگارمدام نازانم سەرەنجامم باش دەبێت یان خراپ. دایکیشی ووتی: کوڕی خۆم پشوویەك بدە بەخۆت. ووتی: داوای حەوانەوەم لێ مەکە، من وادەزانم سبەینێ خەڵکی دەبرێن بۆ بەهەشت،و منیش دەبرێم بۆ دۆزەخ بۆیە هەر بیری دەکردەوە، تا بووریایەوە، هەتا دایکی هات بۆلای و بانگی کرد بەڵام وەڵامی نەدایەوە.. دایکی پێی ووت: خۆشەویستم سۆمای چاوم لەکوێ یەك ببینین؟ کوڕەکەش بەدەنگێکی لاواز ووتی: دایەگیان، ئەگەر منت لەگۆڕەپانی قیامەتا نەبینی، ئەوە لەفریشتەی خەزنەداری ئاگر سەبارەت بە من پرسیار بکە، پاشان هەناسەیەکی هەڵکێشاو وەفاتیکرد –ڕەحمەتی خوای لێ بێت–.

دایکیشی شۆردی و کفنی کرد و چووە دەرەوە و هاواری کرد: ئەی خەڵکینە کۆببنەوە بۆ نوێژ کردن لەسەر کوژراوی ئاگر.. خەڵکیش لەهەموو لایەکەوە هاتن، هیچ کاتێ ئەوەندە خەڵکی زۆر نەبینرابوون و ئەوەندە خەڵکیش نەگریابوون، کاتێ ئەسپەردەیان کرد، هەندێ لە هاوڕێکانی خەوتن، لە خەویاندا بینیان کە لە بەهەشتایە

و پیاسە دەکات.

پۆشاکێکی سەوزی پێوەیە، و پێی ووتن: هەواڵ بەدایکم بدەن کە من لەچ بارودۆخێکدام...

سەرچاوە: WWW.altgwa.fzs.com

# ٩٢- ﴿چیرۆکی موسڵمان بوونی دانیالی قەشە (ئەمریکی)﴾

ئەم لاوە ڕۆڵی لەوەدا چڕ بووبوویەوە کە بگەڕێت بە سورەتەکانی قورئاندا، کە دەتوانرێت خراپ ڕاڤەبکرێت، بە شێوەیە پێچەوانەی ئەوانی تر بێت!! پلەی لە جێگری ﴿شەماس﴾ەوە بەرزکرایەوە بۆ ﴿شەماسی﴾، پاشان بوو بە بەرپرس لە لیژنەی لاوان لەگەورەترین کەنیسەکان لەهەموو جیهاندا. پلە بەرزکردنەوەکەی وەك هاندانێك وابوو بۆ توێژینەوەکەی، بەڵام بەرپرسی گەورە هەردەگەڕاو بێ هوودەبوو.

شۆفیرێکی چالاك بوو لە یەکێ لە ڕۆژنامەکان، و لەهەموو ئەرکێکی کارەکەیدا ڕۆژنامەنوسان و وێنەگران سەردەکەوتن لەگەڵیدا، کاسێتێکی لێ دەدا کە بریتی بوو لە سورەتی ﴿مەریەم﴾ ئەو هەر لەگەڕاندا بوو، ئەوانیش وا گومانیان دەبرد کە موجامەلەیەکی ناسکە لەمەوە! جەمال ﴿کە ئەمە ناوەکەی بووی دەڵێ: من لەخێزانێکی زۆر توند ڕەودا گەورە بووم، لەگەڵ ڕۆژگاردا هەنگاوەکانم بۆ کەنیسە چوونە پێشەوە. تەنانەت کاتێکیش کارم دەکرد وەك شۆفێری ڕۆژنامە، هەرگیز هەفتەیەك لەوانەی یەك شەممانا دوانەدەکەوتم.

وە لەکاتێکدا ئەو ئەرکەیان پێ سپاردم کە بەدوای ئەو سورەتانەدا بگەڕێم کە جۆرێ لە زاراوەو فێڵی تێدایەو دەتوانرێ بە خراپ ڕاڤەبکرێت، بە شێوەیەك کە پێچەوانەیە، گومان ووردە ووردە توشم بوو، ئەو گومانە لەو کاتەوە هات کە بەتەواوی جێ متمانەی قەشەو ڕاهیبەکان بووم. ساڵێکی تەواو تێپەڕی بەبێ ئەوەی لە قورئاندا شتێکی ناتەواو بدۆزمەوە، و چارەسەر ئەوە بوو کە لە یەکێ لەکۆبوونەوەکاندا ئەوە ڕابگەیەنم، کاتێ داوایان لێ کردم کە واز لە گەڕانەکە بهێنم.. کاتێ گرنگیدانیان زیادی کرد، منیش گومانەکانم زیادی کرد، تا ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە کە بە نامەیەك لە هاوسەرمەوە هاتبوو، کە بەوانی ووتبوو: مێردەکەم ڕزگار بکەن!

دەستم کرد بەخوێندنەوە بۆ ئەحمەد دیدات،و ئیبراهیم خەلیل،و د.عبدالجلیل شلبی، هەتا ئەو ئێوارەیە کە لەگەڵ هەندێ لە ڕۆژنامەنوسان و یەکێ لە وێنەگران ڕۆشتم بۆ یەکێ لەمزگەوتەکان کە گۆشت دابەش دەکرا بەسەر هەژاراندا.

سەرنوسەر و وێنەگرەکە دەستیان کرد بەکاری خۆیان، منیش دەستم درێژ کرد بۆ ئەو قورئانەی لە ئۆتۆمبێلەکەدابوو، وە سوێندتان بۆ دەخۆم، من هەر کە قورئانەکەم کردەوە، ئەم ئایەتەم لەبەردەممدا بینیەوە: ﴿إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾القصص/٥٦..واتە: { بە راستی ئەی محمد تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی کە خۆشت دەوێت، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە سەر ڕێگەی راست و ئیمانی پی دەبەخشێت}.

دەستم لەرزی و موچورکەیەکی ترسناك دایگرتم، لاپەرەکانی قورئانەکەم هەڵدایەوە، خۆمم ئارام کردەوە و جارێکی تر چاوم خستەوە سەر قورئانەکە، بەهەمان شێوە هەمان ئایەتم بینیەوە، لەوساتەدا ووتم ﴿سوپاس بۆ خوا﴾.. لەهەمان ساتدا ژنێکی بەساڵاچوو نزیك بوویەوە لێم، تەقەی دا لەجامی ئۆتۆمبێلەکە، پێی ووتم: ئێوە ڕۆژنامەنووسن و خەڵکی گوێ لە قسەکانتان دەگرن.. پێیان بڵێ یەکەم جار بیدەن بە من، چونکە بەڕاستی من زیاتر لە ئامادەبوان شایستەترم.. هۆکاری ئەوەم لێ پرسی، ئەویش ووتی: من پێشتر مەسیحی بووم، پەروەردگارم هیدایەتی دام و موسڵمان بووم و کەس و کاریشم پەیوەندیان پچڕاندووە لەگەڵم!! بەپەلە لە ئۆتمبێلەکە دابەزیم و بەخێرایی ڕۆشتمە مزگەوتەکەوە و خۆم شۆرد و دەست نوێژم گرت و بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا نوێژی مەغریبم کرد..

وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی هیدایەتی دام بۆ ئەم ئاینە مەزنە و لەخوا دەخوازم کە جێگیرم بکات لەسەر ئەم ئاینە.

# ٩٣- ﴿چیرۆکی برەودەرێ بەمادە هۆشبەرەکان، کە بوو بە بانگخواز﴾

سلاو و رەحمەت و بەرەکاتی خوای گەورەتان لێ بێت.

ئەمە ئەو دەستەواژەیە بوو کە یەکێ لە سایەق تەکسیەکان پێی ووتم، کە داوام لێ کردبوو بمبات بۆ مزگەوتی پێغەمبەر..

سەرەتای چیرۆکەکە..

چوومە دەرەوە، دەمەویست بچم بۆ مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) ئۆتۆمبێلەکەم لەرێگادا، لەشاری مەدینەوە هاتبوو.. ئەو لاوەم وەستاند کە روخساری رەش هەڵگەراو بوو، ئاسەواری تاوانی پێوە دیاربوو.

کە هەرکەس ئەو روخسارەی ببینیایە دەرکی بەوە دەکرد، کە بەهۆی گەرمای نیوەرۆوە زیاتر رەش هەڵگەرابوو، کە خەریك بوو بانگی نیوەرۆی دەدا.. لەگەڵیدا سەرکەوتم.. کەوتینەرێ و بانگی نیوەرۆیدا.. پێم ووت: پێم وایە براکەم کە فریای نوێژی نیوەرۆ ناکەوین لە حەرەمی پیرۆز، ئایا لە نزیکترین مزگەوتدا بوەستین.

ووتی: بەڵێ... دەتوەستێنم و من دەرۆم و دوای نوێژەکە دەگەرێمەوە بۆ لات!!

ووتم: واتە نوێژ ناکەیت؟

ووتی: براکەم، دەتەوێ بە ئیسراحەتی خۆت نوێژبکە و بەلام من تاقی مەکەرەوە ﴿واتە بەم داواکاریەت من ئیزعاج مەکە،و من ئازادم﴾!!!

سەرسام بووم لەو جورئەتەی.. وەستاین لەبەردەم مزگەوتی شێخی عەللامە ﴿عبدالمحسن العباد﴾ ﴿بەرێوەبەری پێشوی زانکۆی ئیسلامی و مامۆستا لەمزگەوتی پێغەمبەردا﴾.

نوێژم کرد و هاتمە دەرەوە، هاورێکەمم بینی لە دەرەوەیە.. لەگەڵیدا سواربووم... ئەو کتێب و کاغەزانەم پێ بوو کە لەحەرەم پیاچونەوەم دەکرد...

پێم ووت: شاری مەدینە بە نیسبەت تۆوە چۆنە؟

ووتی پێم: بەخوا دەڵێی بەندیخانەیە، پەنادەگرم بەخودا لێی، بەخوا ئەگەر ئەو مزگەوتە نەبوایە ﴿واتە مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ)﴾ یەك تاکە ریال نەدەژیا!!

زمانم گیرا... کاتێ گوێم لەو سەرزەنشتانە بوو سەبارەت بە پاکترین خاك دوای مزگەوتی حەرام و مەککە.. ﴿شایانی باسە کە هەندێ لەزانایان فەزڵی زیاتر بە شاری مەدینە دەدەن بە تەواوی، وەك ئیمامی مالیك-رەحمەتی خوای لێبێت-﴾

دەفتەرەکەمی دەرهێنا...و قەڵەمم گرت بەدەستەوە و پەیامێکم بۆ نوسیم، و خەتیشم ناخۆش بوو ﴿لەکاتێکدا کە لێشی دەخوری﴾. ئەوەمنم گەشتمە مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ).. پێنج ریالم پێدا..و ئەو کاغەزەش. ﴿لێی پرسیم﴾ ئەو کاغەزە چیە؟

پێم ووت: وەری بگرەو مەیخوێنەرەوە، تەنها کاتێ نەبێت کە بتەوێ بخەویت... پێش خەوتن...

ووتی: واتە ئێستا نەیخوێنمەوە.

ووتم: نەء ... تەنها ئەوکاتەی کە ڕادەکشێیت بۆ خەوتن.

ووتی: بەڵێ، باشە.

ڕۆشتم.. بۆ مزگەوت و چەند ڕۆژێك تێپەڕی... دوای هەفتەیەك کە من گەڕامەوە دوای نوێژی عیشا لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە گوێم لە مۆبایلەکەوە بوو زەنگی لێدا.

ژمارەیەکی نامۆ بوو... خێربێت ئینشائەڵڵا.

ئەلو... سڵاوت لێ بێت.

گوێم لەدەنگێکەوە بوو، دەستی کرد بە گریان..

پێی ووتم: بەڵێ، مامۆستا، بە خوا من سەرەڕۆم،و بە خوا من تەنگە تاوم... چی بکەم باشە ﴿چارە چیە؟﴾.

هێورم کردەوە... ئەو پێی دەپچڕیم و دەیوت: بەخوا خوای گەورە تەوبەم لێ وەرناگرێت... کارێکی خراپ نەماوە کە نەمکردبێت... وێنای بکە مامۆستا، هەموو شتێ..

مامۆستا، من تاوانبارێکی سادە نیم... بەڵام بەخوا من دەمەوێ تەوبە بکەم و بگەڕێمەوە... دەمەوێ تەوبە بکەم.

مامۆستا... من برەودەرم بەمادەی هۆشبەر، بەکاریشی دێنم.. بەخوا دوای ئەوەی پەیامەکەم خوێندەوە.. ﴿خواپاداشتان بداتەوە﴾ زیاتر لەسێ هەزار حەبی هیرۆینم کردە ناو سیفۆنی حەمامەکەوە.

من تەوبەم کردووە.

ووتم: خوای گەورە لە هەموو شتێ خۆش دەبێ، بێجگە لەهاوەڵدانان..

وە خوای گەورە لەهەمووشتێ خۆش دەبێ پەیوەندی بەوەوە هەبێ بێجگە لە شیرك.

﴿إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ(٥٣)﴾الزمر.. واتە: ﴿بەڕاستی خوای گەورە لەهەموو گوناهەکان خۆش دەبێت، بە راستی ئەو لێبووردە و میهرەبانە﴾ مژدەت لێ بێت لە عەفوی خوای گەورە.

خوا و لێبوردەیی خوای گەورەم هێنایەوە یادی.. ئەویش هاتەوە سەرخۆی و ئارام بوویەوە و مۆبایلەکەی داخست، منیش بە هۆی سەرقاڵیمەوە نەمتوانی پەیوەندی پێوە بکەمەوە..

دوای ماوەیەك پەیوەندی پێوە کردمەوە، من نوێژی هەینیم لە مزگەوتی پێغەمبەر کرد.. دەنگی گۆڕابوو... دەنگێکی هێمن و لەسەرخۆ... ئاسودە.. دەیوت: ئای چەندە لە بەختەوەریدام... خەڵکی هەموویان خۆشیان دەوێم، مژدەت بدەمێ بەخوا من لە باشترین حاڵدام..

لە خۆشیاندا فرمێسك بەچاوانمدا هات.. سوجدەی سوپاسکردنم برد بۆ خوای گەورە.. لە خوا دەخوازم کە وەری بگرێت.

چەند ڕۆژێ تێپەڕی... جارێکی تر پەیوەندی پێوە کردمەوە..

ووتی: مژدەت دەیەمێ... یەکێ لە هاوڕێ کۆنەکانم، هاوڕێی ئەو ڕۆژگارانەی کە برەومان دەدا بە مادەهۆشبەرەکان تەوبەی کرد، ئێستا ڕۆشتوە بۆ مەککە تا عەمرە بەجێ بهێنێت...

وتم: ماشەڵلا.. ئێستا تۆ بویت بە بانگخواز..

ووتی: دەخوازم لەخوای گەورە لێمان قبولْ بکات.

بەو شێوەیە چیرۆکی ئەو کەسە تەواو بوو کە برەوی دەدا بە مادەهۆشبەرەکان.. کە پاشان بوو بە بانگخواز.

وە ئێوە من ناناسن... لەبەر ئەوە خۆم نەبوارد تا باسی ئەم چیرۆکەتان بۆ نەکەم... لەبەر یەك هۆ... تەنها... دەمەوێ باسی خۆمتان بۆ بکەم، کە نابێ چاکەی بچووك بە کەم بزانن و ئامۆژگاریکردن و قسەی باش بە شتێکی سووك تەماشا بکەن...

لەوانەیە ووتەیەك چەندین مرۆڤ بگۆڕێت و چەندین بارودۆخیش بگۆڕێت.. خوای گەورە ئێمە و ئێوەش بکات بە دەروازەی خێر و دەرگا داخستن لەخراپە..

# ٩٤- ﴿بلّێ باوەڕم بەخوا هێناو پاشان ڕێکبە﴾

یەکێ لە وانەبێژان باسیکرد، کە ڕۆژێکیان پێی سپێردرا کە وانەی ئاین بڵێتەوە لە قوتابخانەکەیدا، دەڵێ: منیش ڕقم لە وتنەوەی ئەو مادەیە بوو، نەك لەبەر شتێ، تەنها من وام دەبینی کە من گونجاو نیم بۆ ئەوە، دوای پێداگری لەلایەن بەڕێوەبەرەوە ڕازیی بووم بیڵێمەوە، چوومە پۆلەوە و دەستم کرد بە باسکردن، و یەکەمین وانە بریتی بوو لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ آمَنْتُ بِاللهِ ثُمَّ اسْتَقِمْ﴾ واتە: ﴿بڵێ بڕوام بە خوا هێنا و پاشان ڕێك و ڕاستبە﴾.

باسی وانەکەم کرد و پاشان لەخۆم ڕامام، کە بەڕاستی سیمای من لەگەڵ ئەم فەرمودەدا ناگونجێت.. قوتابیەکانیش تەماشام دەکەن. دوای ئەوەی وانەکەم تەواوکرد، دەروونم لێپرسینەوەی کردم.. پاشان چوومە سەر وانەیەکی تر تا هەمان فەرمووده باس نەکەم.. من پیاچونەوەی خۆم دەکرد و ڕادەمام لە فەرمودەی ﴿قُلْ آمَنْتُ بِاللهِ ثُمَّ اسْتَقِمْ﴾ چەند ڕۆژێك تێپەڕی... بەڵام فەرموودەکە لەماڵەوە و لەناو ئۆتۆمبیلدا و لە خوێندنگا لەبەرچاوم ون نەدەبوو، پاشان کاتی حەج هاتە پێشەوە و نیەتی حەجکردنم هێنا لەگەڵ هاوڕێکانم.. کاتێ بەرگی ئیحرامم پۆشی، جگەرەکەم فڕێدا و ووتم جگەرە ناکێشم هەتا پۆشاکی ئیحرام دانەکەنم..

کاتێ مەراسیمی حەجم تەواوکرد، یەکێ لە هاوڕێکانم جگەرەیەکی پێدام، بەڵام من وەرم نەگرت.. چوینە قاوەخانە و ویستم لەوێ نێرگەلە بکێشم، بەڵام فەرموودەکە هەر لەبەرچاوم بوو.. بۆیە بەڵێنم بەخۆم دا کە لەمڕۆ بەدواوە نابێ جگەرەو نێرگەلە بکێشم سوپاس بۆ خوا تەوبەکردن و گەڕانەوەم و ڕێك بوونەوەم دوای ئەوە بوو.. وە ڕۆشتمەوە بۆ قوتابخانەکەم و زۆر حەزم لە وتنەوەی وانەی ئاین و بانگەوازکردن بۆلای خوا دەکرد.

## ٩٥- ﴿من لاشەی شۆفێرەکەم بینی بەهەوادا بەرزدەبویەوە﴾

ئەم لاوە بەسەرهاتەکەی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من کاری شۆفێریم دەکرد لەخەتە دوورەکاندا، خەتی من نێوان ﴿جدە﴾ و ﴿مەدینە﴾بوو، وە بە پێچەوانەشەوە.. بە هەوڵدان و لەخۆبڕان -و بەفەزڵی خوا- توانیم ئۆتۆمبێلێ بکڕم و کاربکەم لەسەری، وە کارکردنیش لە وەرزەکانی رەمەزان و حەجدا و لەپشووی بەهاردا سەخت بوو، وە من نەمئەتوانی شەو و ڕۆژ بلکێنم بەیەکەوە، چونکە من خەونم دەبینی بە ژیانی ڕۆمانسیەوە، کە ئەوەش وای لێکردم حەبی ئاگادارکەرەوە بەکار بهێنم و بەوشێوەیە بەردەوام بووم لەسەفەر و شەونخونی لەسێ ڕۆژەوە بۆ پێنج ڕۆژ بەبێ خەوتن.. بەوشێوە نزیکەی دووساڵ وابووم، لەوماوەیەدا بڕێکی باش پارەم کۆکردەوە.. ڕۆژێکیان بیرم لەحەوانەوە کردەوە، بڕیارمدا ئەم سەفەرەم کۆتا سەفەر بێت،و دوای ئەوە بحەوێمەوە و پشوو بەخۆم بدەم..

بەڵام ویست و ئیرادەی خوا لەسەرو هەموو شتێکەوە بوو.. نەفەرەکان سواری ئۆتۆمبێلەکە بوون و لە شاری ﴿جددە﴾ چوینە دەرەوە ماوەیەك ڕێمان بڕی لە پڕ ئۆتۆمبێلێك بە تەنیشتمدا تێپەڕی و بەخێراییەکی شێتانە لێی دەخوڕی، لە ناخمدا هەستم کرد کە شتێك ڕوودەدات، بەڵێ هەروابوو، چەند ساتێکی نەخایاند ئۆتۆمبێلەکەم بینی لەبەردەممدا تەقلە دەدات.. لە گەڵ تەقلەدانەکەیدا لاشەی شۆفێرەکەم دەبینی کە پارچە پارچە دەبوو، وە بەهەواکەدا دەڕۆشت.

ئەو دیمەنە تۆقاندمی، زۆر ڕووداوم بینیبوو، بەڵام ئەمەی کە ئێستا بینیم لە سەرووی وێنای منەوە بوو، بۆ چەند ساتێ واقم وڕمابوو، دوای ئەوە بەدەنگی هەندێ لەنەفەرەکان هاتمەوە هۆش خۆم و ئەم دوعایان دەوتەوە: لاحول ولا قوه إلا بالله... إنا لله وإنا إليه راجعون... لەدڵی خۆمدا ووتم: چۆن بوو ئەگەر من لەجێی ئەو لاوەدا بوومایە.. چۆن بە دیداری پەروەردگارم بگەشتمایە.. بەبێ نوێژ و خواپەرستی و بێ ترس لەخوا.. هەستم بە ڕاچڵەکینێکی توند کرد لە لەشمدا، پاشان نەمتوانی کاری شۆفێریەکەم بکەم.. تا دوای سێ کاتژمێر... پاش ئەوە نەفەرەکانم گەیاندە شاری

﴿مەدينە﴾، گەڕامەوە بۆ جدە و لەڕێگا نوێژی مەغریب و عیشام کرد، کە ئەو دوو نوێژە یەکەم نوێژ بوو لە ژیانمدا بیانکەم..

ڕۆشتمەوە بۆماڵەوە... هاوسەرەکەم بینیمی... گۆڕانێکی ئاشکراو دیاری لە سەر و سیمامدا بینی... وای گومان برد کە من نەخۆشم.. هاواری کرد بە ڕوخسارمداو ووتی: پێم نەوتی واز لەم حەبانە بێنە، حەبی بەڵا و مەینەتین، تۆ وازیان لێ ناهێنیت هەتا خودا بۆردومانی تەمەنت دەکات و دەڕۆیتە ناو دۆزەخەوە... ئەو وشانە وەك زللە وابوون کە هاوسەرم ئاراستەی منی کرد... منیش پێم ووت: بەڵێن دەدەم بەخوا کە بەڕاستی من ئیتر ئەو شتە پیسانە بەکارنەهێنم... مژدەم پێدا کە من نوێژی مەغریب و عیشام کرد... و تۆبەم کردووە و گەڕاومەتەوە بۆ لای خوا، دەستم کرد بە گریان... زۆر بە تاس و کوڵەوە گریام.. خێزانم دڵنیا بوو کە من ڕاستگۆم لە قسەکانمدا، ئەوەیش هەر ئەوەندەی پێکرا کە دەستی کرد بە گریان لە خۆشیی تەوبەکردن و گەڕانەوەم بۆ ڕێگای هەق و ڕاستی. ئەو شەوە نانی ئێوارەم نەخوارد... خەوتم و لەمردن و پێشهاتەکان دەترسام.. لەخەونمدا بینیم کە من خاوەنی چەند کۆشك و کۆمپانیا و چەندین ئۆتۆمبێل و ملیۆنەها ڕیالم.. لەپڕ.. خۆم بینیەوە لەناو گۆڕدا، لەم گۆڕ دەچم بۆ ئەو گۆڕ، بەدوای ئەو لاوەدا دەگەڕام کە لاشەکەی پارچە پارچە بوو بوو، نەمدۆزیەوە، هەستم بە لێدانێکی توند کرد بۆ سەرم، دوای ئەوە خەبەرم بوویەوە و خۆمم لەسەر جێگاکەم بینی هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا، کاتیش نیوەشەوی تێپەڕاندبوو، هەستام و دەستنوێژم گرت و نوێژم کرد هەتا بەرەبەیان دەرکەوت، لە ماڵ چوومە دەرەوە بۆ مزگەوت.. و لەو ڕۆژە بەدواوە—سوپاس بۆ خوا— من پابەندم بە هامشۆی مزگەوتەکانی خوداوە و جیانابمەوە لێیان و سووربووم لەسەر ئامادەبوون لە نەدوە و وانەکاندا، کە لە مزگەوتەکاندا ئەنجام دەدران.. و سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە ڕێنمایی کردم بۆ ڕێگای بەختەوەری ڕاستەقینەو ژیانی ڕاستەقینە.

سەرچاوە/جریدە البلاد/٤:٩٠١٦ عبدالعزیز الحمدان.

## ٩٦- ﴿محمد مرد و له ركوعدا بوو﴾

به راستی چەندە مرۆڤ نابەختەوەرە کاتێ شەموەتەکانی کۆتی دەکەن و تا ئەوپەڕی سنور ڕاپێچی دەکەن..

محمد بەڕاستی بوو بوو بەبەندەی تاوان و حەز و ئارەزوەکانی و لێی جیانەدەبوویەوە، خاوەنی نەفسی خۆی نەبوو، نەیدەتوانی ئازادی بکات... تەواو کۆنترۆڵی لەدەستدابوو.. بەتەواوی ڕۆچوو بوو لە ناو تاوان و لەزەتی ناشەرعیدا، ئەوە بەتەواوی لەسیما و ڕوخساریدا دیار بوو.

زۆر لەزووەوە سوجدەیەکی بۆ خودا نەبردبوو، ڕێگای مزگەوتیشی نەدەزانی.. ساڵانێکی زۆر تێپەڕیبوون کە نوێژی نەدەکرد، هەستی بە ئیحراجی و شەرم دەکرد ئەگەر ڕەت ببوایە بەلای مزگەوتی ﴿الانصار﴾-مزگەوتی گەڕەکەکەی خۆیان-.

وەك ئەوەی منارەی مزگەوتەکە لۆمەی بکات و پێی بڵێت: کەی سەردانمان دەکەیت ؟ کەی تەوبە دەکەیت؟و کەی دەگەڕێیتەوە.. ئەویش تەنها ئەوەندەی پێ دەکرا لەشەرماندا سەری دابخات.. مانگی ڕەمەزان... کاتێ شەیتانەکان کۆت دەکرێن، دەنگی هەق و ڕاستی لە ئاسۆدا دەزرنگێتەوە و هەموو گەردوون پڕدەکات لەترس و ملکەچی.. دەنگێك کە لەمنارەی مزگەوتی ﴿الانصار﴾ بەرزدەبێتەوە.. و دەنگێکی غەمبار ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەخوێنێتەوە. کە ئەویش حەوانەوەیە... کە نوێژە.. نوێژی تەراویحە.. وەك جاران.. محمد ڕەت بوو بەلای مزگەوتەکەدا.. گوێی بەهیچ نەدا.. یەکێ لە گەنجە چاکەکان وەستاندی.. قسەی لەگەڵدا کرد و پاشان پێی ووت: ڕات چۆنە بگەین بە نوێژەکەماندا؟ دەی، دەی خێراکە با بڕۆین. محمد ویستی پۆزش بهێنێتەوە، بەڵام لاوە چاکەکە، لە قسەکەی بەردەوام بوو کە پەلە بکەن.. ڕۆحی محمد وەك چۆلەکەیەکی بچوکی لێهات، ڕۆحێك دەیەویست ڕێگا ببڕێت بەرەو نور و ڕوناکی.

محمد ووتی: بەڵام من نە دوعای دەستپێکردنی نوێژ و تەحیاتیش نازانم.

لە زووەوە نوێژم نەکردووە، لەبیرم چۆتەوە..

نەخێر محمد لەبیرت نەچۆتەوە، بەڵکو شەیتان و شوێنکەوتەکانی لەبیریان بردویتەوە..

دوای پێداگری لە لایەن لاوە چاکەکەوە، محمد دوای دابڕانێکی زۆر پێی نایە مزگەوتەوە.. چی ببینێ؟ چاوانێك فرمێسك شۆردبوونیەوە،و روخسارانێك تەقواو خواپەرستی ڕووناکی کردبوونەوە.. نوێژگەرانێك لە کەش و هەوایەکی ئیمانیدا مەلەیان دەکرد.
دەنگی مامۆستا غەمناك بوو، لە دەنگیدا جۆشێك هەبوو دڵی دەهێنایە لەرزین، و بۆ یەکەمین جار دوای دابڕانێکی زۆر کە نزیکەی حەوت ساڵ دەبوو، محمد باڵەفڕ بوو لەو کەش و هەوادا، لەکاتێکدا کە نەیتوانی نوێژەکەی تەواو بکات، دڵی پڕبوو لەترس، پاشەکشەی کرد بۆ دواوە، خۆی گرتەوە بە پایەکەی نزیك خۆیەوە.. هەناسەیەکی بەحەسرەتەوە هەڵکێشاو لەگەڵ خۆیدا دوا، توخوا بۆچی ئەم هەموو پاداشتە مەزنەم لەکیس چووە؟! من لەکوێی ئەم دڵئارامی و حەوانەوەیەدام؟!
پاشان دەستی کرد بەگریانێکی درێژ، ئەوەتا ئەو دەگری، دەگری لەناخی دڵیەوە، بۆ نەفسی لەکیس چووی دەگری، بۆ سەرسامیەکەی و سەرگەردان بوونی لە چۆڵەوانیدا دەگری، بۆ ڕۆژانی ڕابردووی دەگری، دەگری بۆ ئەو ڕۆژانەی بە گوناه بەرەو ڕووی پەروەردگاری دەبوویەوە!
دڵی دەهاتە جۆش، وەك سکڵێکی لێهاتبوو، کە لە ئامێزیدا جێگیر بوو بوو، پێش ئەوەی خامۆش بێت سەرلەنوێ گەش دەبوویەوە و بڵێسەی دەسەند و دەیسوتاند.. بەڕاستی ئەوە سوتانی تاوانەکان بوو، سوتانی گوناهەکان.. ئای چەندە ڕۆچوبوویت لەتاواندا، بەڵام ڕۆحت تینوی ڕێگای ئیمان بوو بە شەوقەوە! ئەو دەگریا.. شەپۆلی ئازار و پەشیمانی هەڵیگرتبوو، وای هەست دەکرد خوای گەورە لێی خۆش نابێت.. خەڵکی دەورەیاندا، لێیان پرسی ئەوە چیتە؟ نەیدەتوانی وەڵامیان بداتەوە، ئەو لەو ساتانەدا لەگەڵ دەروونی مات و غەمباریدا دەژیا.. کە سەرگەردانیی ماندووی کردبوو. لە ناخیدا بورکانی ئازار و پەشیمانی هەبوو، هیچ کام لە نوێژگەران نەیانتوانی هێوری بکەنەوە، ئەوان ڕۆشتن تا نوێژەکەیان تەواو بکەن...
لێرەدا عبدالله هات.. دوای چەند هەوڵدانێك.. دەنگی محمد بیسرا کە هاواری دەکرد، کە وەك شۆڕشێکی کەبت کراو وابوو: خوا لێم خۆش نابێ... خوا لێم خۆش نابێت.. پاشان دەستی کردەوە بە گریان.. بەردەوام عبدالله هێوری دەکردەوە و ووتی:

براکەم.. بە ڕاستی خوای گەورە لێبوردەو میهرەبانە. خوای گەورە بەشەودا دەستی دەکاتەوە تا تاوانباری ڕۆژ تەوبە بکەن و دەستی بەڕۆژ دەکاتەوە تا تاوانبارانی شەو تەوبە بکەن. لەم کاتەدا محمد دەستی بەرز کردەوە و چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک،و دەنگی دەزرنگایەوە، زرنگانەوەیەکی نوقم بوو لەبەزەیی خودا، ﴿بەهەناسە سواریەوە﴾ وتی: نەخێر، لێم خۆش نابێت، لێم خۆش نابێت. پاشان بێدەنگ بوو تا هەناسە سواریەکەی نەمێنێت، روخساری پەشیمانی و ئازاری پێوە دیاربوو، پاشان وتی: تۆ وێنای مەزنی تاوانەکانم ناکەیت، و مەزنی ئەو تاوانانەی کەڵەکە بووە لەسەر دڵم... نەخێر... نەخێر.. خودا لێم خۆش نابێت، من ماوەی حەوت ساڵە نوێژم نەکردووە!!! عبدالله هەر هەوڵی دەدا کە قەناعەت بە محمد بکات، کە ڕەحم و میهرەبانی خوا فراوانە، ئەو ئامۆژگاری دەکرد و دەیوت: براگیان، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿يا ابْنَ آدَم، إنَّكَ لَوْ أَتَيْتَ بِقرَابِ الأَرْض خَطَايَا، ثُمَّ لَقَيْتَنِي لا تُشْرِكَ بِي شَيْئا، لَأَتَيْتُكَ بِقُرابِهَا مَغْفِرَةً﴾ واتە: ﴿ئەی نەوەی ئادەم، بە ڕاستی ئەگەر تۆ بە رادەی هەموو زەوی تاوانت هەبێت و بێیتە لام و هاوەڵەت بۆ من بڕیار نەدابێت، منیش بەو ئەندازەیە لێت خۆشدەبم﴾.

پاشان بێئومێد بوونت لەڕەحم و بەزەیی خوا، مەزنترە لە تاوانەکانت.. پاشان چەند ئایەتێکی بەزەیی و تکاو نزای بۆ خوێندەوە،و هەروەها فەرمودەکانی گەڕانەوە و تەوبەکردن،و گەورەیی و مەزنی پەروەردگار لە قبوڵکردنی تەوبەی تەوبەکاراندا، وەك ئەوەی بەتەواوی ئومێدی گەڕانبێتەوە بۆ دەروونی محمد، محمد هەستیکرد کە دەرگای تەوبەی لێکرایەوە و ئێستا دەتوانێ لەو دەرگایەوە بچێتە ژوورەوە.

لێرەوە محمد گوێگری ئامۆژگاریەکانی عبدالله بوو، هەستی دەکرد کە قورسایی سەرشانی سووك دەبێت..و باڵەکانی سووك دەبن و دەدەن لە شەگەی باڵ، و ڕۆحی دەفڕێت و دەیەوێ لەجیهانێکی نوێدا گەشت بکات، لە جیهانی گەڕانەوە و تەوبەکردندا.. ئەوەتا سینەی کراوەتەوە و، پێشوازی لە یەکەمین ئامۆژگاری بەرهەمدار دەگرێت، ئەو ئامۆژگاریانەی کە ئاسایش و دڵنارامی لە دەروونیدا بڵاودەکەنەوە، وەك چۆن باران –بەویستی خوا– سەوزایی لە زەویەکی بیابانی وشکدا بڵاودەکاتەوە.

ئەوەتا عبدالله کارێکی بۆ پێشنیار دەکات: ڕات چۆنە، برای بەڕێزم، بڕۆیت بۆ تەوالێت و خۆت بشۆیت.. تا حەوانەوە بەخۆت بدەیت،و تا ژیانێکی نوێ دەست پێبکەیت.

محمدیش خێرا ڕازی بوو، ڕۆشت خۆی بشوات، و هەموو لەکە وگوناهەکانی دڵی بشوات کە گیرساونەتەوە پێیەوە، ئەم جارە دڵی شۆردەوە، و پڕیکرد لە مانایانێکی جوان کە مادەکەی نور بوو.

بەرەو مزگەوتەکە ڕۆشتن، هێشتا ئیمام قورئانی دەخوێند، لێوەکانی جوڵایەوە، دەستیان بە قسەکرد، وشانێك لەسینەی عبداللەوە دەرچوو کە ڕەسەن بوون، بۆنی ڕاستگۆیی و هەق و ئومێدی لێ دەهات، بێ تاوان بوو لەهەموو بوختانێك.

محمد وەك ئەوە وابوو گەنجینەیەکی دۆزیبێتەوە و لە زووە گەڕابێت بەدوایدا.

لەگەڵ خۆیدا دەدوا: من لەکوێی ئەم ڕێگایەدام؟ من لەکوێی ئەم ڕێگایەدام؟.. فرمێسك بەچاوانیەوە بوو.. هەوڵیدا خەندە بخاتە سەر لێوانی.. بەڵام خەندەیەکی خنکاو بوو خەندەکە بیری چوو بکات بەڕوخساری و فەوتا..

ووتی: بەڵکو-پشت بەخوا- خوای گەورە لێم ببورێت. عبدالله ش پێشکەوت ووتی: بەڵکو بڵێ ﴿خوایەگیان لێم ببورە﴾ پیاوی باش سوربە لەسەر ئەمە. بەرەو مزگەوت کەوتنەڕێ، دەروونی محمدیش زیاتر حەزی بەگەشتن دەکرد بە تەماحی لێبووردەیی و ڕەزامەندی خوای گەورە، چووە مزگەوتەوە و زمانی حاڵی دەیوت: خوایەگیان لێم خۆشبە، خوایەگیان ڕەحمم پێ بکە.. خوایەگیان من ژیانم لە هەڵدێردا بەسەربرد.. ئەوەتا ئەمڕۆ هەوڵی سەرکەوتنە سەرەوە دەدەم، خوایەگیان دەست گیرۆیم بکە.

ئەی بەبەزەیترینی بەبەزەییان، بە ڕاستی گوناهەکانم زۆرن، بەڵام ڕەحمەت و میهرەبانی تۆ فراوانە. نوێژی دادەبەست و هەردەگریا، گوناهە کۆنەکان هەرەسیان هێنا. و لەدڵێکی ناو دار و پەردو و تەپوتۆزەوە دڵێك هاتە دەر کە ڕووناك بووبوویەوە بە ئیمان! هەر دەگریا. گریانەکەی زیادی کرد.. نوێژگەرانی دەورووبەریشی دەستیان کرد بە گریان.. ئیمام لە قورئان خوێندنەکە بوویەوە، بەڵام محمد لە گریانەکەی نەبوویەوە. ئیمام ووتی: الله اکبر و ڕۆشت بە ڕکوعدا، نوێژگەرانیش ڕکوعیان برد و محمدیش ڕکوعی برد.. پاشان کە ئیمام ووتی ﴿سمع الله لمن حمده﴾ هەموان ڕاست

بوونەوە. بەڵام خوای گەورە ویستی محمد جەستەی بەرز نەبێتەوە بەڵکو ڕۆحی بەرز بوویەوە بۆلای پەروەردگار. بۆیە لاشەیەکی بێ گیان کەوت.. دوای نوێژەکە، جولاًنیان،و ئەمدیوودیوویان پێ کرد. فریای کەوتن بەڵکو ڕزگاری بکەن، بەڵام ﴿إِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ(٣٤)﴾الأعراف.. واتە:{ئەگەر ئەجەل و وادەی مردنیان هات بۆ یەك ساتیش نە دوادەخرێن نەپێشیش دەخرێن}

کتێبی: العائدون إلى الله...

## ٩٧- ﴿كاتێ مرد کە بەسەر گۆڕی هاوڕێکەیەوە بوو﴾

﴿ضیاء﴾ی مردووشۆر لە نەخۆشخانەی سەربازی لەشاری ﴿ریاض﴾ بۆی گێڕامەوە... کە کەسێکی متمانەدارە -بە بۆچونی من- خوای گەورە زاناترە... وە من پاکانە بۆکەس ناکەم. بۆی باسکردم و ووتی: موفەوەزێکی هێزە ئاسمانیەکان هات و ویستی یارمەتی بدەم لە دەرهێنانی شایەتدان بۆ وەفاتی هاوڕێیەکی کە وەفاتی کردبوو.. دوای ئەوەی کە ئەو کارەمان کرد، پێکەوە هاوڕێکەیمان شۆرد و لەسەعات یانزە و سی و پێنج خولەك جیابوینەوە.. ئەو مردووەکەی برد و منیش ڕۆشتم تا خۆم ئامادە بکەم بۆ نوێژی نیوەڕۆ، و لەسەعات ١ی پاشنیوەڕۆ، لە نەخۆشخانەوە پەیوەندیان پێوە کردم، کە جەنازەیەك هەیە و کەسوکارەکەی دەیانەوێ عەسر نوێژی لەسەر بکەن، تۆ وەرەو ئێستا بیشۆ.. بە خێرایی ڕۆشتم و چوومە سەر لاشەکە، تەماشامکرد، کە بینیم زۆر سەرسام بووم؟ کێم بینی؟ ئەو موفەوەزەی کە لەهێزەکانی ئاسمانیەوە هاتبوو، وەستام و هەستم بە گێژخواردن دەکرد، سەرئێشە، چووم بۆ نوسینگەکەم، غیرەتم هێنایەوە بەر خۆم و پشتم بەست بە خودا و چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزم خوێند، پاشان پشتم بەست بە خودا و شۆردم.. دوای ئەوەی لە شۆردنی بوومەوە، لە کەسوکارەکەیم پرسی کەچۆن مردووە؟ ووتیان، کاتێ کە هاوڕێکەی داهێڵاوەتە ناو گۆڕەکەوە و ویستویەتی لە گۆڕەکە بێتە دەرەوە، توشی ئازارێکی توند بووە لەسەر دڵی و هەر لەناو گۆڕی هاوڕێکەیدا وەفاتیکردووە..

سبحان الله العظیم.. پاك و بێگەردی بۆ خوای مەزن.. WWW.altqwa.com

١

## ٩٨- ﴿دایكم دوای چاوبڕكێكانی من وەفاتیكرد﴾

ووتی: لەبەردەم ئەو ئاوێنەدا كە لەگۆشەی خۆرهەڵاتی ژووەرەكەمدا بوو قژم شانە دەكرد.. و دەنگی مۆسیقاش جەنجاڵیەك و ناخۆشیەكی بەخشیبوو بە شوێنەكە.. لەپڕ دڵم گیراو نەمزانی هۆكارەكەی چیە. رۆشتم بۆ لای تەسجیلەكە و مۆسیقا رۆژئاواییەكەم بێدەنگ كرد، ئەو گۆرانیەی كە هیچی لێ حاڵی نەدەبووم.. دڵم زیاتر تەنگ بوو.. بەرەولای پەنجەرەكە ڕۆشتم تا هەوای پاك هەڵمژم.. بەڵام هەستم بەشتێكی سەیر دەكرد، نەمدەزانی هۆكارەكەی چیە! پاشان بەرەو بازاڕ كەوتمەڕێ، تا پیاسەكە لێرە و لەوێ بكەم..و دەست بكەم بە تەماشاكردنی كچان.. كاتێ بەماڵەكەدا ڕەت بووم و بەرەولای دەرگای حەوشە ڕۆشتم بەلای دایكمدا ڕەت بوو.. دوای ئەوەی چەند هەنگاوێ لێی دووركەوتمەوە، بانگی كردم و ووتی: ئەحمەد دوێنێ خەوم پێوە بینیت... بەڵام من وام نیشاندا گوێم لێیەوە نیەو هەر ڕۆشتم... هات بەدوامداو باڵی گرتم و ووتی: ئایا سنورێك بۆ ئەم گاڵتەجاری و كات فەوتاندنە دانانێیت، ئەحمەد؟ كاتێ چاوم كەوت بەچاوەكانی، هەمان دڵتەنگیە مەترسیدارەكەم بۆ هاتەوە... بەبێ دەنگیی بەرەو دەرگاكە ڕۆشتم و پاشان ڕۆشتم بەرەو لای هاوڕێكەم كە ئۆتۆمبێلێكی كەشخەی پێ بوو، بە خەندەوە لای كرد بەلامداو بەشێ لە دوكەڵی جگەرە گرگرتووەكەی كرد بە ڕوخسارمدا. بەڵام من هێشتا دڵم زۆر نارێك بوو.. دەنگی كاسێتەكەم بەرز كردەوە، بەڵكو ئەو دڵتەنگیەم نەمێنێت.. ئێستە بچین بۆ چ بازاڕێ؟ ئەو پرسیاری لێ كردم.. كاتێ گوێم لەو ووتەیەوە بوو، كە شەوی پێشوش گوێم لێوە بوو، وەك ئەوە وابوو گوێم كەڕ بوو بێت و هیچ نەبیستم، تەنها ئەو چەند وشەیە نەبێ سەبارەت بە ژیان: برام، ئایا نەنگی نیە بەبێ هودە گەنجێتیت بفەوتێت.. بە دوای كچانی موسڵماندا.. و بەشداربیت لە خراپكردنی كۆمەڵگاو هاوكاری پیلانەكانی دوژمنان بیت، لە كاتێكدا تۆ نەوەی ئەم خاك و خەڵكەیت.. براكەم ئایا لە خوا ناترسیت؟ بەوشێوەیە ئەو وتانە لە ئاسمانی عەقڵمدا دەسوڕانەوە و وەك هەورە بروسكە وابوون، و وێنەی ئەو پیاوەی ڕوخساری دەدرەوشایەوە بەهۆی ئیمان و پاكی، لەمێشكم نەدەچوە دەرەوە.. پیاوی دەزگای فەرمان بەچاكە و قەدەغەكردنی خراپە كە دوێنێ مەچەكی گرتم، لە كاتێكدا من بە بازاڕدا دەسوڕامەوە و بە دوای

ئافرەتانەوە بووم.. ئەم قسانەی دا بەگوێمدا، کە زۆر کاریگەرتربوون لەهەموو هەڕەشەو ترساندنێك...

چاوم کردەوە، هاوڕێکەمم بینی کە بەدەستی ڕایدەوەشاندم و ووتی: چیتە؟

ڕووم کرد بە لایداو ووتم: هیچ نیە.. دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە... دەزانم ئەو هێزە چی بوو کە پاڵی بە هاوڕێکەمەوە نا بەبێ موناقەشە بمگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەوە.

دابەزیم لە ئۆتۆمبێلەکە و بەرەو ماڵ گەڕامەوە بێ ئەوەی خواحافیزی لە هاوڕێکەم بکەم... چەندە سەرسام بووم کاتێ ماڵی خۆمانم بینی پڕە لە خەڵك... ژن و پیاو... حەپەسام و ئەبڵەق بووم. ڕۆشتم بۆ لای برا بچوکەکەم، کاتێ کە بینیم دەگریە... لێم پرسی چیتە؟ بە هەنسکەوە دەگریا و دەکوڵکی... پاشان سەری بچوکی بەرز کردەوە بۆ لای من و چاوەکانیشی پڕ لە فرمێسك بوون... ووتی: ئەحمەد... دایکم مرد.. توشی جەڵدەی دڵ بوو... مرد.. هەستم کرد کە دڵم ووردە ووردە بەرەو وەستان دەڕوات.. حەزمکرد بە تەواوی بوەستێ.. بەڵام وانەبوو.. سێ ساڵ تێپەڕیوە بەسەر ئەو چیرۆکەدا.. ئەوەتا ئێستا من بەفرمێسکەکانم دەیگێڕمەوە و دەینوسمەوە بۆتان.. و دوعاو سوپاسی ئەو پیاوە دەکەم، کە سۆزێکی ڕاستەقینەی پێ بەخشیم و ووتانێك کە لە دڵەوە هاتبوونە دەرەوە.

# ٩٩- ﴿مایكل جاكسۆن له سەڵلەی زبڵدا﴾

یەكێ لەشەوە گەرمەكانی هاوین بوو... ڕووناكی دەدرەوشایەوە لەشارەكەدا. بۆنی ﴿شاورمە﴾ش بەدرێژایی جادەكە دەهات.. هەندێ كەس بە هێواشی پیاسەیان دەكرد..و هەندێكیشیان بەپەلە.. ئۆتۆمبێلێكی ﴿ئەسبور﴾ی سور، دەنگی مۆسیقای ڕۆژئاوایی لێ دەهات بە بەرزی لەگەڵ دەنگی مایكل جاكسۆن، لایدایە لای شۆستەكە و لەپاڵ دوكانێكی فرۆشتنی كاسێتی ڕۆژئاواییدا وەستا.. گەنجێكی خوار تەمەن ٢٠ ساڵ دابەزی، بە شێوازی ڕۆژئاوایی قژی بڕیبوو.. عەینەكێكی ڕەشی لەچاودا بوو، كاتێ ویستی بڕواتە دوكانەكەوە- ئەو بە جەستەو بەدەم گۆرانی ناو ئۆتۆمبێلەكەی دەسەندەوە.. خۆی كێشا بە پیاوێكدا لە هاتوچۆكەران، كە ڕیشدارێكی بەڕێز بوو ﴿هەلا و مەلا﴾.. بە لاموبالاتێكەوە وای ووت.. بەشێوەیەكی گاڵتە ئامێزانەو سوكایەتی پێكردن...!

مامۆستاكەش بەخەندەیەكەوە كە سەرسامی پێوە دیاربوو تەماشایكرد...و سەرسامی دیمەنی ئۆتۆمبێلەكەی بوو.. وە هەروەها بڕینی قژی.. پاشان ئاماژەی بۆ وێنەكەی سەر سنگی كرد و ووتی: كوڕی خۆم ئەوە چیە؟!

- ئەوە مایكلە... ئایا مایكل جاكسۆن دەناسیت؟!!

-شەرەفی ناسینی ئەو نەبووم ﴿مامۆستاكە بۆ سوك كردنی وای ووت، لاوەكەش بەشانازیەوە ووتی: ئەوە ئەوە لە ئۆتۆمبێلەكەدا گۆرانی دەڵێت.. مامۆستاكەش وەڵامی دایەوە: ناویم بیستووە، بەڵام من كارم بەسەریەوە نیە.. پاشان مامۆستاكە ووتی: ئایا دەزانیت چی دەڵێت؟!

لاوەكەش ووتی: ڕاستت دەوێ، نازانم.. مامۆستاكەش بە كەمێك جدیەتەوە وەڵامی دایەوە: وەرە لەگەڵم تاپێت بڵێم چی دەڵێت...

مامۆستاكە لەگەڵیدا ڕۆشت بۆ لای ئۆتۆمبێلە سورەكە.. لە تەنیشتیەوە لە پێشەوە دانیشت.. دەستی كرد بە وەرگێڕانی ووشەكانی گۆرانیەكە.. بەش، بەش.. تەنانەت كۆرسەكەش..

لێرەدا لاوەكە هەستی بە تێكشكان كرد لەبەردەم زمانی ئەم مامۆستا خواناسەدا... كە لەمێشكیدا شتێكی تر چەسپیبوو.. وای هەست دەكرد كەسایەتیەكەی كە لاسایی

رۆژئاوایی دەکاتەوە وەك ئۆتۆمبێلە سورەکەی وایە.. کە لەزگەی ئەفرەنجی پێوەیە.. لە کاتێکدا ئەو رۆچووبوو لەبیرکردنەوەکانیدا، گوێی لەدەنگی مامۆستاکەوە بوو دەیوت: بەراستی کەسایەتی ئیسلامی، کەسایەتیەکی دروستە.. و موسڵمانی راستەقینە شانازی بە کەسایەتی خۆیەوە دەکات.. و رازی نابێت شوێنکەوتەی کەس بێت و لاسایی کەسی تر ناکاتەوە.. لاوەکەش بەدەنگێکی هێواشەوە کە سەری داخستبوو وتی: بەڵێ؟ مامۆستاکە لێی پرسی: ئایا قورئان دەخوێنیت؟ وتی: بەڵێ، لەمانگی رەمەزانی رابردوودا خوێندومەتەوە.. مامۆستاکە قورئانێکی پیرۆزی لەگیرفانیدا دەرهێنا، وتی: کورم ئەمە بگرە... بەراستی بەم عەقیدەیە نەتەوەکەمان دەژێنێتەوە.. لاوەکە گەرایەوە بۆ ماڵەوە.. رۆشتە ژوورەکەیەوە.. گرنگیدانەکانی بە خولگەیەکی نوێدا دەسورایەوە، نوێ لە بۆنەکان و نوێ لە مۆدێلەکان و نوێ لە کاسێتەکانی مایکل جاکسۆن و دیمس روسس و... چەندانی تر.. هەستی دەکرد ئەم جیهانە جیهانی ئەو نیە. و ئەم بۆ ئەوە دروست نەکراوە.. کارتۆنێکی گەورەی هێنا..و هەموو ئەو شتانەی کۆکردەوە، وەك ئەوەی رابردووی خۆی بۆ هەتا هەتایی ئەسپەردە بکات.. تا لاپەرەیەکی نوێ دەست پێ بکات.. پاشان خزمەتکارەکەی بانگ کرد و بە سوربوونەوە پێی ووت: هەموو ئەمانە بخەرە ناو سەللەی زبڵدانەکەوە.. خزمەتکارەکە بە سەرسامیەوە تەماشای کرد... ووتی: بیخەمە کوێ؟؟! ووتی: سەللەی زبڵەکەوە...

-تۆدڵنیایت

+ بەڵێ.

# ١٠٠- ﴿پەیوەندیەکی تەلەفۆنی ﴿السدیس﴾ی خستە گریان﴾

تەلەفزیۆنی سعودی هەفتانە بەرنامەیەکی ئاینی پێشکەش دەکرد،و زانایەك یان مەلایەکی بانگهێشت دەکرد، تا وەڵامی پرسیار و بۆچونی ئەوانە بداتەوە کە پەیوەندی بە بەرنامەکەوە دەکەن.. جارێکیان بەرنامەکە مامۆستا ﴿عبدالرحمن السدیس﴾ی بانگهێشت کرد.. خوا پاداشتی بداتەوە وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە، تا پەیوەندیەکی پێوەکرا، خوشکێکی بەڕێز پەیوەندی پێوەکرد و داوای لێکرد لێکدانەوەی خەونێکی بۆ بکات کە بینیویەتی.. بە مامۆستاکەی ووت: من لەحەرەمی مەککەدا بووم، کەسێکم بینی تەوافی کەعبەی پیرۆزی دەکرد، و ڕووت و قووت بوو، وە ئافرەتەکە ووتی کە من ئەوکەسە دەناسم، هەرچەندە نزیکی منیش نیە، وە هەروەها هەموان دەیناسن، ئایا تەفسیری ئەم خەونە چیە؟ مامۆستای بەڕێزیش وەڵامی ئافرەتەکەی دایەوە و ووتی: خوشکی بەڕێزم مژدە بدە بەو کەسە، تەفسیری ئەوەی کە بینیوتە ئەوە بریتیە لەوەی ئەو مرۆڤە بە ئیزنی خوای گەورە هیچ گوناهێکی نیەو، خوای گەورەش ڕەزامەندە لێی.. لەم کاتەدا خوشکەکە ووتی: چۆنە گەر پێت بڵێم ئەوکەسەی کەمن لە خەونەکەمدا بینیم تۆ بویت!! لێرەدا ئەو زانا بەڕێزە بێدەنگ بوو، چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك.. پاکوبێگەردی بۆ تۆ پەروەردگارا.. خوایە گیان بمانگێرە بەوانەی کە بەهەشتین..

اللهم آمین... آمین یارب العالمین.

# پێڕست


١. ﴿بیخوێننەوە چونکە کاریگەرە﴾........................................٢
﴿تەوبەی پزیشکێکی مەسیحی و موسڵمان بوونی لەسەر
٢. دەستی بانگخوازێکی موسڵمان﴾..........................................٦
٣. ﴿تەوبەی خێزانێکی تەواو لە خواردنی حەرام﴾............................١٣
٤. ﴿تەوبەی پیاوێك دوای مردنی خاوەنەکەی بە مادەی هۆشبەر﴾..............١٤
٥. ﴿تەوبەی مامۆستایەك لەسەر دەستی قوتابییەکی خۆی﴾......................١٦
٦. ﴿تەوبەی کچێك لە حەرەمی زانکۆدا﴾......................................١٨
٧. ﴿تەوبەی لاوێکی بێناگا﴾................................................٢٠
٨. ﴿تەوبەی کۆمەڵێ لاو﴾...................................................٢٣
٩. لەزانکۆی ﴿أم درمان﴾ی ئەهلی، سودان....................................٢٤
١٠. وە لە میسریشەوە ئەم نامەیەم پێگەشت.................................٢٥
١١. ﴿فریشتە ئافرەتێك لە هەتك کردن ڕزگار دەکات﴾.........................٢٦
١٢. ﴿چیرۆکێکی زۆر کاریگەر﴾..............................................٢٩
١٣. ﴿( سابیر )ی برام﴾.....................................................٣٣
١٤. ﴿نوێژی مەغریبیم لەگەڵدا کرد﴾.........................................٣٤
١٥. ﴿ئەسانسێر﴾............................................................٣٦
١٦. ﴿ئەمڕۆ دواهەمین ڕۆژی ژیانی منە﴾.....................................٣٨
١٧. ﴿سوژدەیەك لەژێر ئاودا﴾...............................................٤٧
١٨. ﴿نوێژ بکە پێش ئەوەی نوێژت لەسەر بکەن﴾.............................٥٠
١٩. ﴿چیرۆکێکی کاریگەر... بیخوێننەوە﴾....................................٥١
٢٠. ﴿وشەیەك بووە هۆی ئەوەی ٤ پزیشکی ئافرەت موسڵمان بن﴾..............٥٢
٢١. ﴿نە خۆڕازاندنەوە و نەبۆن، و تەنها کارکردن لەگەڵ ئافرەتان﴾............٥٣
٢٢. ﴿موسڵمان بونی بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گەورەی ئەمەریکی﴾.............٥٤
٢٣. ﴿هیدایەتی باوکێك بەهۆی کوڕە بچوکەکەیەوە﴾............................٥٥

٢٤. ﴿تەوبەی سەرخۆشێك... چیرۆكێكی كاریگەر﴾ ...... ٥٦
٢٥. ﴿رۆژانێك ژیانمی گۆڕی﴾ ...... ٥٨
٢٦. ﴿عبدالحلیم حافظ: ئەی (سەعید) بەخوا من ئاسودە نیم﴾ ...... ٦٠
٢٧. ﴿دۆزەخ ٣٠٠ كم﴾ ...... ٦٢
٢٨. ﴿چیرۆكی فاتمە لەگەڵ دایكی﴾ ...... ٦٤
٢٩. ﴿وێنای بكەن.. مەلایەك لە مەلها؟!﴾ ...... ٦٧
٣٠. ﴿تەوبەی هونەرمەندێ ناوی (زادان) بوو﴾ ...... ٦٩
٣١. ﴿تیاچون﴾ ...... ٧٠
٣٢. ﴿وتاربێژی لاو﴾ ...... ٧٣
٣٣. ﴿گەڕانەوە دوای نەمانی ئومێد﴾ ...... ٧٦
٣٤. ﴿دایكی نمونەیی﴾ ...... ٧٨
٣٥. ﴿چیرۆكی كچێك كە ناوی (مەلاك)ە﴾ ...... ٨١
٣٦. ﴿چیرۆكی (یاسەمین)﴾ ...... ٨٤
٣٧. ﴿چیرۆكێكی واقیعی﴾ ...... ٩١
٣٨. ﴿چێژی خواپەرستیی شەوان تایبەتە﴾ ...... ٩٣
٣٩. ﴿ئەمریكیەك بە خەندەیەك موسڵمان دەبێ﴾ ...... ٩٥
٤٠. ﴿منداڵێكی بەریتانی لە خودی خۆیەوە موسڵمان دەبێ﴾ ...... ٩٧
٤١. ﴿چیرۆكێك بەهۆیەوە زەوی لەرزی﴾ ...... ١٠١
٤٢. ﴿چەند چیرۆكێك جەستە دێنێتە لەرزین﴾ ...... ١٠٣
٤٣. ﴿ئافرەتێكی عەرەب لە ئەورووپا﴾ ...... ١٠٦
٤٤. ﴿چۆن ئەوانە موسڵمان بوون.. سبحان الله﴾ ...... ١٠٧
٤٥. ﴿سوڵتانێكی (چاد)ی ئەصرانیەكی توند ڕەو بوو؛ ئێستا ئەو لە بەناوبانگترینی بانگخوازانە﴾ ...... ١١١
٤٦. ﴿منداڵێ دەبێتە هۆی ڕێنمایی باوكێ﴾ ...... ١١٦
٤٧. ﴿كاتێ ئیسلامم خۆشویست ئەسانسێرەكەم گۆڕی﴾ ...... ١١٨
٤٨. ﴿ئافرەتێكی توركی.. گریا و گریاندمی﴾ ...... ١٢١

٤٩. ﴿پێی ووتم ئەی (بەدر) هەستە و خۆت ئامادە بکە﴾.................. ١٢٣
٥٠. ﴿خوای گەورە ویستی توشی خێر بێت، بۆیە ڕێنمایی کرد بۆ تەوبەکردن﴾....... ١٢٩
٥١. ﴿چی کرد کاتێ خۆشەویسترین منداڵی وەفاتی کرد؟﴾.................. ١٣٠
٥٢. ﴿دەنگێکی مەزن ئاسمانی مەککە دەبڕێت﴾.................. ١٣٤
٥٣. ﴿چیرۆکێکی زۆر کاریگەر و گریاناوی﴾.................. ١٣٨
٥٤. ﴿موسڵمان بوونی قەشە (سیلی)﴾.................. ١٤٥
٥٥. ﴿بەهۆی زۆری تاوانەکانیەوە وای پێ دەوترێ﴾.................. ١٥٢
٥٦. ﴿زانایەکی کەنەدی لە زانکۆی پەترۆڵ باس لە قورئان دەکات﴾.................. ١٥٦
٥٧. ﴿ئەو سەگە بێدەنگ بکەن﴾.................. ١٥٩
٥٨. ﴿موسڵمان بوونی پزیشکێکی ئەمریکی﴾.................. ١٦٠
٥٩. ﴿ئەی خەڵکینە شایەتی بدەن کە من کچەکەی خۆم دا بەم کوڕە﴾.................. ١٦٢
٦٠. ﴿سید قوتب لە لەدایك بوونەوە تا شەهید بوون﴾.................. ١٦٤
٦١. ﴿ناصر العمر... هۆکاری هیدایەتدانم بوو﴾.................. ١٦٩
٦٢. ﴿حەجاج و تاوسی کوڕی کیسان﴾.................. ١٧١
٦٣. ﴿بەراوردی سەخت؟﴾.................. ١٧٢
٦٤. ﴿ئەم پیاوە زۆر سەیرە﴾.................. ١٧٧
٦٥. ﴿تەوبەی شێخ أحمد القطان﴾.................. ١٨٢
٦٦. ﴿ئافرەتێك لە دەروازەی گۆڕێکدا﴾.................. ١٨٧
٦٧. ﴿من بۆنی بەهەشت دەکەم﴾.................. ١٩١
٦٨. ﴿مێژووی غەرناتة و طلیطلة... هۆکاری تەوبەکردنی من بوو﴾.................. ١٩٤
٦٩. ﴿تەوبەی مامۆستا (سلیمان الثنیان)﴾.................. ١٩٧
٧٠. ﴿ئەگەر بانگی باوکی نەبوایە خەریك بوو بخنکێت﴾.................. ٢٠١
٧١. ﴿بەسەرهاتی (الهمیان)﴾.................. ٢٠٥
٧٢. ﴿پیاوێك جن بەریکەوتووە لە ئۆتۆمبێلەکەیدا﴾.................. ٢١٤
٧٣. ﴿شاعیرێك لەسەر نێت﴾.................. ٢١٦
٧٤. ﴿ووشەی خوا لەسەر جەستەی سەماکەرێك﴾.................. ٢٢١

٧٥. ﴿لاوێك له گیرفانیدا شتێك هەبوو﴾.......................................... ٢٢٣
٧٦. ﴿پڕ به بینم هاوارم كردك خوایەگیان ڕزگارمكه﴾........................ ٢٢٥
٧٧. ﴿فریشتەی مردنم بینی، ڕۆحم لەجەستەم دەردەكات﴾..................... ٢٢٧
٧٨. ﴿دا پیرەم هۆكاری ڕێنماییم بوو﴾.............................................. ٢٢٩
٧٩. ﴿نابینایەك ڕێگام نیشان دەدات﴾.............................................. ٢٣١
٨٠. ﴿چیرۆكێكی زۆر زۆر كاریگەر﴾.................................................. ٢٣٣
٨١. ﴿تەوبەی گۆرانیبێژی صۆماڵی ( عبدوللا زولفا )﴾.......................... ٢٣٩
٨٢. ﴿هەستام و نوێژم كرد﴾.......................................................... ٢٤٤
٨٣. ﴿ژوورەكە ئامادەبوو بۆ تاوانی زینا﴾........................................ ٢٤٥
٨٤. ﴿دلی وەستابوو زاریشی هەرشایەتومانی دەوتەوە﴾........................ ٢٤٦
٨٥. ﴿تەوبەی پیاوێكی پاكستانی﴾.................................................. ٢٤٨
٨٦. ﴿تەوبەی كچێك له مێرگی قورئاندا﴾.......................................... ٢٥١
٨٧. ﴿چیرۆكی بەندیەك له بەندیخانەدا﴾........................................... ٢٥٤
٨٨. ﴿كاتێ كەنیسه پڕ بوو لەگریان﴾............................................... ٢٥٧
٨٩. ﴿ڕەنگی بوو به ڕەش﴾............................................................ ٢٦٣
٩٠. ﴿له ڕەمەزاندا له پێش خورماوه به جگەرە ڕۆژووی دەشكاند﴾........... ٢٦٤
٩١. ﴿كوژراوی ئاگر﴾................................................................... ٢٦٧
٩٢. ﴿چیرۆكی موسڵمان بوونی دانیالی قەشە ( ئەمریكی )﴾.................. ٢٦٩
٩٣. ﴿چیرۆكی برمودەیێ بەمادە هۆشبەرەكان، كه بوو به بانگخواز﴾........ ٢٧١
٩٤. ﴿بلێ باوەڕم بەخوا هێناو پاشان ڕێكبه﴾...................................... ٢٧٤
٩٥. ﴿من لاشەی شۆفێرەكەم بینی بەهەوادا بەرزدەبویەوە﴾.................... ٢٧٥
٩٦. ﴿محمد مرد و له ركوعدا بوو﴾.................................................. ٢٧٧
٩٧. ﴿كاتێ مرد كه بەسەر گۆڕی هاوڕێكەیەوە بوو﴾............................. ٢٨٢
٩٨. ﴿دایكم دوای چاوپڕكێكانی من وەفاتیكرد﴾................................... ٢٨٣
٩٩. ﴿مایكل جاكسۆن له سەللەی زبلدا﴾............................................ ٢٨٥
١٠٠. ﴿پەیوەندیەكی تەلەفۆنی ﴿السدیس﴾ی خستە گریان﴾..................... ٢٨٧